# مێژووی دەوڵەتی عەباسی

نوسینی
محمد سهیل طقوش

وەرگێڕانی
نهاد جلال

نارین

ناوی کتێب بەعەرەبی: تأريخ الدولة العباسية

نوسینـــــــــــی: محمد سهيل طقوش

ناوی کتێب بەکوردی: مێژووی دەوڵەتی عەبباسی

وەرگێرانـــــــــی: نهاد جلال

نەخشە سازی ناوەوە: شنۆ حمدامین

ساڵی چـــــاپ: یەکەم/ ١٤٣٠ك – ٢٠٠٩ز

ژمارەی سپـــاردن: ١٣٨٦ی ساڵی ٢٠٠٨ پێ دراوە.

کتێبخانەی نارین

هەولێر - جوارڕیانی شێخ مەحمودی حەفید

بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی

E- mail: nareen_1@yahoo.com

تەلەفۆن: ٢٥١١٩٨٢ـ ٦٦ (٠٠٩٦٤)

# مێژووی دەوڵەتی عەباسی

نوسینی
محمد سهیل طقوش

وەرگێڕانی
نهاد جلال

ناریـن

## پێشکەشە:

به ڕەمزییەی کچم...

دەی کچە ئازیزەکەم زیاتر بەهێز بە، تا پێ چەسپاوانە بوەستیت و وەك درەختێکی بەرز و بەهێز چەسپاوبیت و ئەم خەزێنە زانستییەی بەجێی دەهێڵم بە میراتی وەریگریت و بە دڵم بڵێم تۆ لەگەڵ کۆتا هەنگاوی مندا دەست پێدەکەیت تا بگەیتە پلەیەکی بەرز.

# پێشەکی وەرگێر

سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورەو میهرەبان، خوایەکی تاك و تەنها و بێنـازە و هەموو جیهانیان دروستکراوی ئەون، مرۆڤی دروستکردو ژیانی بۆ ڕەخساندو ڕێبازی کامڵیشی بۆ دابەزاندوە سەرەنجامی ڕێی ڕوونکردەوە تـا مرۆڤـەکان ڕێگـەی ڕاسـت، یان گومڕایی هەڵبژێرن.

سـەلات و سـەلامی خـوای گـەورەش لـە پێغەمبـەری خـوا موحەممـەد(ﷺ)، ئـەو کەسەی خوای گەورە هەڵیبژارد، تا کۆتـا پـەیامی خـۆی بداتـە دەسـت، تـا ئـەویش بەمرۆڤایەتی بگەیـەنێت، دەی دڵسۆزانە و ڕێ ڕاسـتانە ئـەرکی خـۆی بەجێگەیانـدو ئێمەیش شایەتی بۆ دەدەین، سەڵات وسەلامی خوای گەورە لەو پێغەمبەرە و ئال و بەیت و هەموو یارانی.

هـەر کەسـێك تێڕامـانی لـە مێـژووی مرۆڤایـەتی بەگـشتی و مێـژووی ئیـسلامی بەتایبـەتی هـەبێت دەزانێـت سـەردەمی دەوڵـەتی عەبباسـی(١٣٢ك /٦٥٦ك) کەدەکەوێتە سـەدەکانی ناوەڕاسـتی مێژووەوە سـەردەمێکی گـرنگ و بەرفراوانـە و پێویست بە تێڕامان و لێکۆڵینەوەی ورد لە بوارە جۆربەجۆرەکانیدا دەکات.

بەگشتی کۆمەڵێك سیفەت لەو سەردەم و دەوڵەتەدا بەدیدەکەین:

١ــ گەشەکردنی بەرفراوانی زانست و پێشڕەوی لەبوارو بەشە جیاجیاکانیدا.

٢ــ بەردەوامی و گەشەسەندنی بزووتنەوەی فتوحات.

٣ــ زیاد بونی پەیوەندیە دەرەکیەکان بەتایبەت لەگەڵ جیهانی خاچپەرستاندا.

٤ــ سەرهەڵدانی چەندین دەستەو تاقمی لادەری ئایینی.

٥ــ بـەرفراوانبونی بازنـەی هـەوڵ وچـالاکی مەزهەبـە شـیعەکان، وەك فـاتیمی و بوەیهی و ئیسماعیلی و...هتد.

٦ــ چەندین دەوڵەتۆکەی جیاخوازی لەناوچە جیاجیاکاندا سەریانهەڵدا.

٧ــ سەرو خـوارکردنی دەسـتەڵات و هـەژموونی خەلیفـەکان و هـاتنی هێزەکـانی وەك بوەیهی و تورك و سەلجووقیەکان.

٨ ـ گەشەسەندنێکی باڵای ژیاری ئیسلامی لەبەشەکانی ئەم دەوڵەتەدا.

هەر ئەم گەشەسەندنەو بەرفراوانیە فرەلایەنەی وایکردووە تاناحەزەکانی بۆی داخ لەدڵ بن و ڕقی لێهەڵبگرن و هەوڵبدەن لایەنە ڕەشەکانی نیشان بدەن و لایەنە گەشەکانی بشارنەوە و پەردەپۆشیان بکەن، بۆ ئەم هەوڵەیش جەختیان لەسەر بواری سیاسی ئەو مێژووە کردۆتەوە، چونکە زیاتر خاڵە ناپەسندەکانی مێژووی هەر کۆمەڵێك لە مەیدانی سیاسیدا ڕوودەدەن، ئەگەر خاڵە ڕەشەکانی ئەو بوارە زۆر زاڵبون ئەوا ڕێڕەوی گەشی دەوڵەتەکە دەگۆڕن، بەڵام مانەوەوگەشەکردنی دەوڵەت نیشانەی ئەوەیە ئەوخاڵە ڕەشانە هێندە گەورەو کاریگەر نەبون کە بەرامبەربە ڕێڕەوی گشتی دەوڵەتەکە بوەستن.

بەو پێیەی سەردەمی عەبباسی گەشەسەندنێکی بەرفراوانی سیاسی و کارگێری بەخۆیەوە بینیوە، بۆیە قسەکردن لە سەر ئەو مێژووە زۆر پێویستە، هەر چەندی لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو ماوەیە هەبن هەر کەمە.

بەداخەوە کتێبخانەی مێژوویی کورد تا ئێستا کتێبێکی پوخت وگشتی لەسەرمێژووی ئەودەوڵەتە نیە، ئەمەش جێی پەژارەیەو دەبێت هەوڵی چارەسەری بدرێت، هیوادارم ئەم هەوڵە نەوازەییەیش سەرەتایەك بێت بۆ پێشڕەو یکردن لە چارەسەری مێژووی ئەو سەردەمەدا.

نووسەر خۆی تایبەتمەندی لە مێژووی دەوڵەتی عوسمانیدا هەیە و شارەزاییەکی بەرفراوانی لە مێژووی ئیسلامدا هەیە و چەندین نووسینی لەو بوارەدا هەن، بەڵام ئەوەی پێویستە خوێنەر لە بەرچاوی بگرێت ئەوەیە کە نووسەر تەنها مێژووی سیاسی ئەو دەوڵەتەی باسکردووە و دەستی لە بوارەکانی تر پاراستووە، ئەمەش لەبەر ئەوەی گرفت و نا ڕوونیەکانی دەوڵەتی عەبباسی زیاتر لە بوارە سیاسیەکەیدا خۆیان دەبینیەوە، تا ئێستاش ڕاجیاوازی لەو بوارەدا زۆرە. دەی بە دڵنیاییەوە چارەسەرکردنی ئاڵۆزیەکی وا بەبێ هەڵەو کەم و کورتی نابێت بۆیە با خوێنەر لەبەر هەڵە و کەم و کورتی چارەسەری نووسەر لەچەند بوارێکدا ئەم هەوڵە گەورەیە

بەرپەرچنەداتەوە بەڵکو سوپاس بۆخوا سەرچاوە لەم بوارەدا زۆرن و با بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوە سەرەکیەکان.

پاشان! پێویستە خوێنەر هەوڵبدات لەم لایەنانەی تری مێژووی دەوڵەتی عەبباسی شارەزا بێت:

١ـ ڕۆڵی زانست و کاریگەری زانایانی ئوممەتی ئیسلامی، ئەوانەی توانیان پێشڕەوی بە بواری زانست بکەن.

٢ـ بواری ژیاری و بنیادو هوانەر ومێژووی ئابوری و جوگرافی و کۆمەڵایەتی ئەو دەوڵەتە.

٣ـ لە هەمووی گرنگتر شارەزابونە لەلایەنی ئایینی و بیرو باوەڕیی ئەو دەوڵەتە،چونکە لەو سەردەمەدا دەستە و تاقمێکی زۆری لادەر لە بنەمای قورئان و سوننەی سەریانهەڵدا کە تا ئەمڕۆیش جیَ دەستیان ماوە.

٤ـ واقیعی جیهادی و بزووتنەوەی فتوحات و شالاوە خاچ پەرستیەکان.

٥ـ نیزامەکانی دەوڵەت لە بوارە جۆر بەجۆرەکاندا وەك نیزامی خیلافەت و وەزارەت و... هتد.

لە کۆتاییدا لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە ئەم هەوڵە پاك و پوخت لە پێناو خۆیدا بێت و بیکاتە مایەی سوود بەخشی بۆ هەموو کوردێك و توانرابێت کەمێك لە ساختەکارییەکانی ناحەزانی حەقیقەتی مێژوو بە تایبەت (ئەوانەی چاویان تەنها خاڵە ڕەش یان ناڕوونەکان دەبینن). ئاشکرا بکرێن، هەرچیەك ڕاست و دروست بێت لەخوای گەورەوەیە و هەرچیەکیش هەڵە بێت لەخوا داواکارم لە نووسەر و وەرگێڕیش خۆش بێت.

نهاد جلال حبيب الله

١٩ شەوال / ١٤٢٩ك.

Nihad hawramany @ maktoob.com

# پێشەکی نووسەر

سوپاس وستایشی تەواو بۆ پەروەردگاری جیهانیان، سەلات وسەلام لەسەر پێغەمبەری خوا(ﷺ) وئال و بەیت و یارانی.

ئەم لێکۆلینەوەیە بەشێوەیەکی مەوزوعی قسە لە سەر لایەنی سیاسی مێژووی دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی دەکات.

لە ڕاستیدا ڕووداوەکانی مێژووی عەبباسی چڕوپڕ وئالۆزن چەندین پێکهاتەی سیاسیان هەیە دەوڵەتێکی ئیسلامی فرە بەش و پارچە پارچە وای پێکهێناوە، کە بە درێژکراوەی دەوڵەتی خیلافەتی ئومەوی دادەنرێت، ڕەگەزە جۆر بە جۆرە عەربی و فارسی و تورکیەکان کاریان تێ دەکرد و چەند بنیاتێکی کۆمەڵایەتی ودەمارگیریەکی لێك جیاو چەند گەشەسەندنێکی سیاسی وئابوری و کۆمەڵایەتی گرنگیشی بەخۆوە بینی، کە ڕێڕە و ڕێبازی دەوڵەتەکەیان دەست نیشان و سنووردار کرد، بەردەوام کارتێکەری هەرە دیاری بنیادنانی ئەو ڕووداو و کارلێکانە بیروباوەڕی ئیسلامی بو، بەو پێیەی ئەو بیروباوەڕە لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا کاریگەری ڕیشەیی خۆی هەبوە.

بەرپابونی دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی تەنها بەیعەت دانێکی ڕووت نەبوە، کە لە جیاتی ئەوەی بە خەلیفەیەك بدرێت بە یەکێکی تر بدرێت، یان گواستنەوەی فەرمانڕەوایی لە حوکمی ئیسلامی لە ئومەوییەکانەوە بۆ عەباسیەکان نەبوە و بەس، بەڵکو ئەم ڕووداوە بە شۆڕشێکی گشتگیری ناو مێژووی ئیسلامی ئەژمار دەکرێت، لە ڕێرەوی گەشەسەندنی ئیسلامیدا سەروخوارگرنگی وابو کە بەشێوەیەکی ڕیشەیی کۆمەڵگەی ئیسلامی مۆرکێکی قووڵی لە هەموو بەش و لایەنە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و ئابوریەکانی ژیاندا بەجێهێشت، ڕێگەی لە بەردەم موسڵمانە ناعەرەبەکاندا کردەوە تا لەو بوارنەدا خۆیان نشیانبدەن.

مێژوونووسان هەوڵیاندا نهێنی و شاراوەکانی ئەو گۆڕانە بدۆزنەوە و ڕاڤەیان بکەن، هەریەکەو لە چەند چەمك و دیدێکی جیاوازەوە ڕاڤەکانیان نیشان دەدەن.

هەندێکیان پێیان وایە ئەمە شۆڕشی فارسە بەسەر فەرمانڕەوایی عەرەبیدا.

لە کاتێکدا هەندێکیان لێکیدەدنەوە، کە تەنها شۆڕشێك بوە دژ بە فەرمانڕەوایی ئومەویەکان تا لەسەر فەرمانڕوایی لایانبەن و عەبباسیەکان شوێنیان بگرنەوە، هەندێکیتر دەڵێن: بە دڵنیاییەوە ئەم گۆڕانە ئەنجامی ئەو گەشەسەندنانە بو کە جیهانی ئیسلامی لە ماوەی سەدەی یەکەمی کۆچیدا بەخۆیەوە بینی.

لە ڕاستیدا لەئەنجامی سیاسەتی ناهاوسەنگی ئومەوییەکان لە بەرامبەر گەلە ناعەرەبەکان و بەرامبەر هەندێ دەستەو بەرەی عەرەبیداتەنگەژەیەکی ڕوونی ناو ژیانی سیاسی لێکەوتەوەو عەباسیەکانش لە بەرژەوەندی خۆیاندا بەهەندیان وەرگرت.

هەروەها ئەو بۆشاییە سیاسییەیان بە هەند وەرگرت کە بە مردنی ئەبوهاشمی کوڕی موحەممەدی کوڕی حەنیفە بەرپرس و پێشەوای بانگەوازی کیسانی ڕوویدا، ئەوان ئەو بۆشاییەیان پرکرِدەوە وموحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەبباس، سەرکردایەتی ڕەزامەندبونی بنەماڵەی پێغەمبەر(ﷺ)ی بەئاشکرا گرتە دەست و کەوتە هەوڵی ئەوەی بە نهێنی ئەمە تایەبت بە عەبباسیەکان بکات و بەخۆی ژیری و توانا ولێهاتووییەە توانی سەرکەوێت.

لە دوای ئەوەی تاکی سەرکردایەتی هەبێت، مەیدانی لە باریش بۆ وەرگرتنی بانگەواز دەبێت، خوراسان وەك خاکێك و خوراسانیەکانیش وەك گەلێکی وا کە ئەو گۆڕانە قبوڵ بکەن، بەکۆمەڵێ هۆکاری سیاسی و کۆمەڵایەتی و بیروباوەڕییەوە خۆیان نواند.

لەخوراسان عەرەبەکان لە نێوان خۆیاندا ناکۆکیان هەبو هێشتا ململانێ قەیس و یەمەن تەواو نەبو بو.، ئەم وولاتە بەپێی هەڵکەوتە سنوریەکەی لە ناوچەی ئەو دیو ڕووبار لەگەڵ تورکە بتپەرستەکاندا کۆمەڵێ پێکدادانی بە خۆیەوە بینی.

هەروەك ژمارەیەکی زۆری ئەو فارس و مەوالیانەی تێدا بو کە بەدەست فەرمانڕەوایی ئومەوییەکانەوە زەرەرمەندبو بون، بە تایبەت خوراسان لە مەڵبەندی خیلافەتی ئومەوییەوە دوور بو، ئەمەش وایکرد لە کاتی پێویستدا فریاگوزاری پێنەگات، ئەمەش یاریدەدەری هاتنەکایەی بارێکی پشێوی ونیشاندانی

هەڵگەڕانەوە لە مەڵبەندی خیلافەت بو.

ئەبو موسلیمی خوراسانی، کە ئیبراهیمی کوری علی ناردی بۆ خوراسان تا لەوێ بانگەوازی عەبباسی نیشان بدات بەمبارەوە توانی بچێتە مەڕو و دەست بگرێت بەسەر فارسدا، دواتر بەسوپاکانیەوە بەرەو عێراق چوو توانی سوپای بشکێنێت و لە ساڵی (١٣٢ك/٧٤٩ن)دا چوویە بەسرە و کوفە.

لەم کاتەدا، ئەبولعەبباسی سەفاح، کە شوێنی پێشەوایەتی ئیراهیمی برای لە سەرکردایەتی بانگەوازەکە گرتەوە، بەرەو کوفە چوو و ووتارێکی بۆ خەڵك خوێندەوە و بەرپابونی دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی ڕاگەیاند. بەمەیش بە یەکەم خەلیفەی عەبباسی دادەنرێت و سەرکردایەتی خۆی بەسەر ئومەوییەکانی تردا زاڵکرد.

لە دوای مردنی ئەبولعەبباس ئەبوجەعفەری مەنسوری برای شوێنی گرتەوە کە لە ڕاستیدا بە دامەزرێنەری دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی دادەنرێت، پاشان لە دوای ئەو خەلیفەکان یەك لە دوای یەك بۆ ماوەی چوار سەردەمی مێژوویی هاتن و تا ساڵی (٦٥٦ك/١٢٥٨ن) درێژەی کێشا.

کاتێ عەبباسیەکان خیلافەتیان گرتەدەست سنوری جیهانی ئیسلامی هەردوو هەرێمی(جورجان)و (تەخارستان)ی دەگرتەوە و هاوسنووری ووڵاتی تورك و چین بو، لەباشووری رۆژهەلاتیشەوە دەگیشتە ولاتی کشمیرو ولاتی(نەوبیە) لە باشووری میسری ولە بیابانەوە تا باشووری ڕۆژئاوا، لە باکووریشەوە شاخەکانی قەوقاز و ئەرمینیا هاوسنوری ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی بو، لە ئەندەلوسیش هاوسنووری ولاتی فرەنجەکان بو.

دەوڵەتی خەللافەتی عەبباسی لە سەرەتاوە چەندین شێوەی ناکۆکی ناخۆیی لە پێناو قۆرخکردنی دەسەلات بەخۆیەوەبینی و بۆ چەند پێکدادانێکی گەورەتر گەشەی سەند، بەدەرچوونی عەبدوللای کوڕی عەلی لە ئەبوجەعفەری برازای خۆی مەترسدارترین ململانێیەك کە سەردەمی یەکەمی عەبباسی بەخۆیەوە بینی، ئەم ململانێیە بو کە لە نێوان ئەمین و مەئموونداهەڵگیرسا.

خەلیفە عەبباسیەکان لە ماوەی سەردەمی یەکەمی عەبباسیاندا بەرەو ڕووی بەرهەڵستکاری ئامۆزاکانیان لە ئەبوتالیبی مامیانەوە بونەوە،[1] چونکە ئەوان کاتێ چوونە پاڵ شۆرشەکە، هیوایان وابو خیلافەت بگرنە دەست، بەلاّم کاتێ عەبباسیەکان فەرمانڕەواییان گرتە دەست تووشی بێهیوایی بون، بۆیە بەهێزی بزووتنەوەی نەیاری بەرەو ڕوویان بونەوە، هەروەها عەبباسییەکان بەرەو رووی چەند بزووتنەوەیەکی دەمارگیری فارسی دژ بە فەرمانڕەوایی عەرەبی بونەوە، بە تایبەت لە دوای ئەوەی ئەبوموسلیمی خوراسانییان کوشت. لەو بزووتنەوانەیش وەك بابەکی و خورەمی.

دەوڵەوتی خیلافەتی عەبباسی، لەسەردەمی یەکەمیدا، لەسەر سنوورەکانەوە چەند پێکدادانێکی لەگەڵ دراوسێکانی و بەتایبەت لەگەڵ بیزەنتیەکاندا بەخۆیەوە بینی، جەنگی هاوینە و زستانەیش، کە سەر سنوورەکان جێ شانوی ئەو جەنگانە بون بەردەوام بو، بەلاّم عەبباسیەکان دەوڵەتی بیزەنتییان پێ لەناو نەچوو، لەبەرەی رۆژهەلاّتیشەوە عەبباسیەکان قەلەم ڕەوی ئیسلامیان لە هەرێمەکانی ئەودیو ڕووبار و لە هەرێمی (سەند)دا چەسپاند، دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی کەوتە هەوڵی ئەوەی دەسەلاتی خۆی لەووڵاتی مەغریبدا بچەسپێنێ، بەلاّم بەهانگاوێکی پەلە و بەسەرکردایەتی عەبودرەحمانی داخیلی ئومەوی ئەندەلوس لە دەستی عەبباسییەکان جیابویەوەو ئەداریسەکانیش پێشەنگییان بە عەبدورەحمانی داخلەوە کردو مەغریبی دووریان جیا کردوە، ئەمە عەباسیەکانی پاڵ پێوەنا تاهەولبدەن هەرێمەکانی تری دەوڵەتەکەیان، کە هەوڵی جیابونەوەیان دەدا بەشێوەیەکی ڕەسمی ببەستنەوە، لەوانەش دانانی ڕەشید ئیبراهیمی کوڕی ئەغلەب لەسەر ئەفریقیا.

دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی بەم ململانێیە کاریکردە سەر قەلەمڕەوی نێوان عەرەب وفارس وتورکان و بەهۆی ئەوەی خەلیفەکان ماوەیەکی زۆر نەیانتوانی هاوسەنگی نێوان ئەو گەلانە ڕابگرن، فارسەکان قەلەمڕەویان بەهێزبو دەستیان

---

[1] ـ مەبەستی نووسەر نەوەکانی ئیمامی عەلی کوڕی ئەبوتالیبە.

هەبو تا ئەوەی هارون ڕەشید ناچار بو وەزیری بەرمەکیەکانی خۆی، کە (فارس) بون لەناو ببات، پاشان لە دوای ئەوەی مەئموون بەسەر ئەمینی برایدا سەرکەوت دەسەلاتی فارسەکان زیادی کردەوە، بەنو سەهل کە فارس بون لە سەردەمی ئەودا شوێن و پایەکی گەورەیان هەبو، موعتەسەمیش پێی باش بو ڕەگەزێکی نوێ بۆ خۆی ساز بدات تا پشتی پێ ببەستێت، بۆیە تورکەکانی بۆلای خۆی ڕاکێشاو کردنی بە دۆست وهێما و وەزیر وسەرکردە، بەمەیش قەڵەمڕەوی فارسی لەناو برد.

بە مردنی واثق لەساڵی (٢٣٢ك/٨٤٧ز)دا سەردەمی یەکەمی عەبباسی کۆتایی پێ دێت، ئەو کێشەوگرفتە ناوخۆیی و دەرەکیانەی لەسەردەمی یەکەمی عەبباسیدا تووشی عەبباسیەکان بو نەبونە ڕێگری ئەوەی عەبباسیەکان دەوڵەتەکەیان تا ئاستێکی باڵای توانای سیاسی و ژیاری بەرەو پێش ببەن، ئەوان لە سەردەمی مەنسوردا شاری بەغدادیان بنیادنا و لەو کاتەوە بو بەپایتەختی دەوڵەت ویەکێ لە گەورەترین شارو پایتەختە ئیسلامیەکان ومەڵبەندێکی گەشەسەندووی بازرگانی، موعتەسەمیش شاری سامەڕائی بنیادنا ولەوێ دانیشت وکردی بە بنکەی دەوڵەتەکەی، بەڵام ئەمە گرنگی بەغدادی وون نەکرد بازرگانیش چالاکی و گەشەێکی دیاری بەخۆیەوە بینی، کە پشتی بە بەرهەمی هەرێمەکانی دوڵەت یان هاوردەونااردەنی دەرەوە دەبەست، هەر وەك ژیانی رۆشنبیریش گەشەیکرد وبەعەرەب کردنی کەلتووری مەعریفە مرۆییەکان چالاك و گەشەسەندوو بو.

دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی لە سەردەمی عەبباسی دووەمدا چالاکی خۆی لە دەستدا، سەردەمی دووەم لە ساڵی (٢٣٢ك/٨٤٧ز)ەوە دەست پێدەکات، ئەمەش لە ئەنجامی لاوازی دەستی فەرمانڕەواییەوە بو، کە بویە هۆی ئەوەی دەسەلاتی مەرکەزی دەوڵەت لە ڕووی سیاسی وکارگێری ودارایییەوە لاوازبێت، دواتر هەرێمەکان یەك یەك لێی جیادەبونەوە، بەڵام ئەم ڕێبازەی شۆرش بانگی بۆ دەکرد، لەگەڵ لاوازی خیلافەتدا هەر بەرهەمی خۆی دەدا، دەوڵەت لە نیزامی حوکمڕانیدا لە مەرکەزی بونەوە گۆڕا بۆ لامەرکەزی، لەناوچەو بەشەکاندا چەند دەوڵەتێکی جیا دامەزران و گەلانێکی نوێش هاتنەناو کۆمەڵگەی ئیسلامی و توانیان

بگەنە دەسەڵات وخەلیفەکان کەوتنە ژێرقەڵەمڕەویانەوە، ئەمەش وای کرد رۆڵی چالاکی سیاسییان سنووردار بکرێت، تورکەکان لە مەیدانی سیاسیدا دەرکەوتن و کارگێری دەوڵەتیان گرتەئەستۆ و خەلیفە وەك سێبەرێك بو و وەلانرابو.

ڕێرەوی مێژووی سیاسی گۆڕا و ئیتر مێژووی خیلافەت نەبو، بەڵکو گەلانی ئیسلامی ئەومێژوویەیان دروستکرد و ئاراستەیان دەکرد، دەمارگیرییەکەیان لە ژێر سایەی دروشمی یەکسانیدا بەڕوونی دەرکەوت، خیلافەتیش چوو بەدەم داوا و خواستە هەرێمیەکانەوە، ئەمەش بویە هۆی دەرکەوتنی لامەرکەزی، شتێکی ئاساییە لەو بارە نائاساییەدا هەوڵی مێژوونووسان بە ئاراستەی مێژووی سیاسەتی گەلانی ئیسلامی وەك چەند کۆمەڵێکی هەرێمایەتیدا بڕوات، کە هەوڵی گەشەپێدانی کەسایەتی و بەرژەوەندی و زیادکردنی پشکی خۆیان لەو هەرێمەی دەستیان بە سەر داگرتووە بدەن، ئەمە لە جیاتی ئەوەی گرنگی بە کاروباری خەلیفەکان بدەن.

لەو سەردەمەدا بیرۆکەی یەکخستنی جیهانی ئیسلامی لە ژێر یەك سەرکردایەتی سیاسیدا لێك هەڵوەشاو پەیوەندییەکانی خەلیفە لەگەڵ دەوڵەتە هەرێمیەکاندا زیاتر لەسەر جارجارە دوژمنایەتی و هەندێ جاریش هاریکاری بە بەرهەم وەستا بون.

سەردەمی سێیەمی عەبباسی، کە لە ساڵی (٣٣٤ك/٩٤٥ز)ەوە دەست پێ دەکات، پەرچەکردارێك دژ بەو قەلەمڕەوە تورکیەی پێك دەهێنا کە لە سەردەمی دووەمی عەبباسیدا دەستی بە سەر توانای خەیلافەتدا گرتبو، ئەمەش خۆی لە بزووتنەوەیەکی فارسی شیعەدا نیشاندا کە بوەیهیەکان ڕێبەرییان دەکرد، بوەیهیەکان لە فارس و ئەهواز وکرمان وڕەیی و ئەسفەهان و هەمەداندا چەند دەوڵەتێکی جیایان دامەزراندبو،ئەوان توانیان هەزموونی کرداری خۆیان بسەپێنن و دەسەڵاتیان بەسەر عێراقدا بڵاوبکەنەوە تا ئەوەی قەلەمڕەوی ئەو بنەماڵەیە زیادیکرد و سەردەمی سێیەمی عەبباسی بە ناوی ئەوانەوە ناونرا.

بوەیهیەکان لەدوای ڕاڕاییەك پایەیی خیلافەتیان هێشتەوە، بەڵام دەستیان بە سەر کاروبارەکاندا گرت و بە شێوەیەکی ڕەها هەرچییان بویستایە دەیانکرد،

دیمەنی لاوازی خیلافەت و لە دەستدانی شان و شکۆیان بە درێژایی ئەو سەردەمە بەردەوام بو.

سەردەمی چوارەمی عەبباسی کە لە ساڵی (٤٤٧ك/١٠٥٥ز)ەوە دەست پێ دەکات.

پەرچەکردارێکی بەرهەڵستکاری قەڵەمڕەوی شیعی پێکهێنا، ئەم سەردەمە هاوشێوەی سەردەمی پێشوو سەلجووقیەکان شوێنی بوەیهیەکانیان گرتەوە، جەختیان کردەوە سەر ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی و لەگەڵ ڕێزدانان بۆخودی خلیفە و مەڵبەندی خیلافەتدا هەژموونی کرداری خۆیان بەسەرتواناکانی خیلافەتدا بڵاوکردەوە، سەلجووقی وبوەیهیەکان لەڕووی مەزهەبییەوە جیاوازن، چونکە سەلجووقیەکان مەزهەبی سونییان وەرگرت، کەخەلیفەی عەبباسی بەڕێبەری ڕۆحی ئەومەزهەبە دادەنرێت.

پەیوەندی خیلافەت بە سەلجووقیانەوە لە نێوان هاوکاری بەرهەمدارو دوژمنایەتی نێوانیان خۆی دەنواند بەتایبەت لە ماوەی لێکهەڵوەشانەوەی یەکبونی سەلجووقیەکاندا جەنگ و دوژمنایەتی خۆی نواندو خەلیفەکان هەوڵیان دەدا لە کۆتی سەلجووقیەکان دەرچن، بەڵام خیلافەت زانی ناتوانێت سنوورێك بۆ پێکدادانەکانی دەرئەنجامی ناکۆکی ناوبنەماڵەی سەلجووقی دابنێت، ئەمە پاڵی پێوەنا تا بۆ لەناو بردنی سەلجووقیەکان پەنا بۆ خوارزمیەکان ببات، ئەمەش خستیە ناو ناکۆکییەك لەگەڵ ئەوانەیش کەتازە هاتوون، چونکە ئەوانیش چاویان لەوە بو هەژمونیان بەسەر بەشەکانی خیلافەتدا بچەسپێنن.

خیلافەت بۆ رزگار بون لە دەست ڕووی خواریزمییەکان، پەنای بردە بەر ڕەگەزێکی نوێ، کە ئەوی شرەگەزی مەغۆلی بو، ئەم ڕەگەز بەڕەق و توند و تیژو دڕندەی ناسرابون.

خیلافەتی عەبباسی لەساڵی (٦٥٦ك/١٢٥٨ز) لەژێر گورزەکوشندەکانی مەغۆلەکاندا ڕووخا، ئەوەی جێ تێبینیە کتێبخانەی عەرەبی لەڕووی لێکۆڵینەوەیەکی زانستی گشتگیر و تایبەتدا، کە بتوانیت چارەسەری مێژووی

دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی بکات هەر لە سەرهەڵدانییەوە تا داڕمانی، هەژار و لاوازە،ئەو نووسینانەیش کە تائێستا هەوڵی چارەسەرکردنیان داوە، بەشێکی کەم و سادەی ئە مێژووە لە خۆ دەگرن، ئەمە بەجیا لەسەردەمی یەکەمی عەبباسی کە هەندێ گرنگی پێدراوە، هەر ئەمە هانی داین تا لەم بوارەدا بنووسین، بۆ ئەوەی وێنەیەکی تەواو و گشتگیر لە مێژووی دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی لە سەرهەڵدانیەوە تا داڕووخانی بخەینە ڕوو، ئەو بارودۆخەیش لەبەر چاو بگرین کە ئەو دەوڵەتەی تێدا ژیاوە، یان ئەو تەیارە جیاوازانەی فەرمانڕەواییان کردووە، مێژووی قۆناغێکی ئیسلامی دەخەینە بەردەم خوێنەر، کە بێگومان گرنگترین قۆناغی مێژووی ئیسلامییە،بەو پێیەی چەندین تەیاری سیاسی و دەستەی حیزبی و دەستەی دەمارگیری لەخۆگرتووە کە تا ئەمرۆی ئێمەیش کاریگەرییان لەسەر بار و دۆخی جیهانی ئیسلامی هەیە.

لە ماوەی لێکۆڵینەوەکەدا خۆم لەدوور و درێژی مەسەلەکان بە دوور دەگرم، مەگەر تەنها ئەوەی بۆ یەك لا کردنەوەی ڕاستییەك یان نیشاندانی شایەتێك درێژەی پێبدرێت.

توانی تەنگ پێ هەڵچنینی مەوزوعی بەو مێژووە تێروپڕە ئەنجام نادرێت، مەگەر بە گەڕانەوە بۆ بنەکان، بەتایبەت ئەگەر فرە بیرۆکەی و زانیاری وهەڵوێست و ڕاوبۆچوونی ئەوماوەیە لەبەرچاو بگرین، بێگومان ئامانجی لێکۆڵینەوەی ڕووداوەکانی مێژوو، وەرگرتنی پەندو وانەیە، ئەرکی مێژوونووسیش ئەوەی لە سەر پێویست دەکات لە هەموو ئەو هۆکارانە خۆی دابڕنێت، کە لەکاتی لێکۆڵینەوەکەیدا دێنە ڕێی ناهێڵن دیدی دروستی هەبێت لەگەیشتن بەڕاستی زانستی و دووری دەخەنەوە.

لە پێناو ئەمەدا، لەم لێکۆڵینەوەیەدا پشتم بەکۆمەڵێك سەرچاوەی جۆراوجۆرو گرنگ بەستووە، خوێنەر لە پەراوێزەکانی لێکۆڵینەوەکەو لەشوێنی تایبەتی خۆیاندا ئەو سەرچاوانە بەدی دەکات، لەم کارەیشمدا هیوادارم خزمەتی ڕاستی مێژوو کرابێت، هەروەك هیوادارم ئەم لێکۆڵینەوە تازەیەش کەمترین سنووری مەرجی لێکۆڵینەوەی زاستی تێدا بێت و چی شێوەی زیندوویێتی و بەسوود هەیە پێشکەش بە نەوەی نوێم کردبێت.

پێکهێنانی ئەو بابەتانەش، کە خوێنەر بەسەر بابەتە گەورەکانیەوە دەیان بینێت، دابەشم کردوون بە (دە)بەش، ئەمەش بەسەر هەر چوار سەردەمی عەبباسیدا دابەش دەکرێت.

بەشی یەکەم بەرپابونی دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی لە خۆ دەگرێت کە لە خوراسانەوە بە ئاراستەی عێراق و لە سەر بنەمای داڕوومانی دەوڵەتی خیلافەتی ئومەوی سەری هەڵدا.

بەشی دووەمیش لێکۆلینەوەکە دوو کەسایەتی عەبباسی لەخۆ دەگرێت، کە ئەوانیش ئەبولعەبباسی سەففاح و دواتر ئەبوجەعفەری مەنسورە، کە بە دامەزرێنەری ڕاستەقینەی ئەو دەوڵەتە دادەنرێت، باسی هەوڵی ئەو دووانەم بۆ سەقامگیرکردنی جێ پێی عەبباسییەکان لە فەرمانڕەواییداو دژایەتی ئەو دەستە و تاقمانەی لە دەسەڵاتیان دەرچوون کردووە تا ئەوەی لە کۆتاییدا دەسەڵاتیان کەوتە دەست.

لە بەشی سێیەمدا باسی دوو کەسایەتیم کردووە، کە بریتین لە موحەممەدی مەهدی وموسای هادی، باسی هەوڵەکانی ئەو دووانەمان بۆ تەواوکردنی سیاسەتی ناوەکی و دەرەکی پێشینەی خۆیان کردووە.

هەروەك لە بەشی چوارەمدا لێکۆلینەوەم بۆ کەسایەتی هاڕوون ڕەشید بە گرنگییەوە کردووە،چونکە لەسەردەمی ئەودا دەوڵەت گەیشتە کۆتا پلەی سیاسی و سەربازی خۆی، ئەمەش لە ڕوانگەی کارەکانی ئەو لە بواری سیاسەتی ناوخۆی و دەرەکیدا.

لە بەشی پێنجەمدا لێکۆلینەوەم لە سەر کەسایەتی هەریەك لە ئەمین ومەئمون لە ڕوانگەی کارەکانیانەوە کردووە، لە سەردەمی ئەودووانەدا ڕەگەزی فارسی، کە چوویە ململانێیەکی سەخت لەگەڵ عەرەبدا، دەرکەوت ئەمین ئاراستە عەرەبیەکانی لە خۆدەگرت، لە کاتێکدا مەئمون لە ڕوانگەی بنەماڵەی بەشی سەهلی فارسیەوە پێشڕەوی فارسەکانی لە خۆ دەگرت.

لە بەشی شەشەمدا تیشکم خستۆتە سەردوو کەسایەتی گرنگ، کە بریتین لە موعتەسەم کە ڕەگەزێکی نوێی هێنایە ناو مەیدانی ململانێ ڕەگەزییەوە بەو

ئامانجەی قەڵەم ڕەوی فارسی لەناو ببات ئەویش ڕەگەزی تورکییە، تورکەکان لە دوای مردنی موعتەسەم دەستیان بەسەر بەش وتواناکانی خیلافەتداگرت، لە دوای ئەو واثق هات کە لە ساڵی (٢٣٢ك/٨٤٧ن)دا مرد، بەمردنی ئەویش سەردەمی یەکەمی عەبباسی کۆتای پێهات.

لەبەشی حەوتەم و هەشتەمدا چارەسەری بارودۆخی ناوخۆی ودەرەکی دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسیدا لە ژێرسایەی دەسەڵاتداری ڕەگەزی تورکی بەسەر بەش و تواناکانی خیلافەتدا کردووە، باری لاواز وداڕماوی خیلافەت ببویە هۆی دەرکەوتنی چەند بزووتنەوەیەکی جیابوەوە کە ئامانجی دەمارگیر خۆیان لە بنیادنانی دەوڵەتێکی هەرێمایەتیدا بەدیهێنا. پەیوەندی ئەو دەوڵەتانە بەخیلافەتەوە لەنێوان هاوکاری بەرهەمدار و دوژمنایەتی تونددا بو، ڕووداوەکانی ئەم دوو بەشە سەردەمی دووەمی عەبباسی پێکدەهێنن لە ساڵی(٣٣٤ك/٩٤٦ن)دا کۆتایی پێهات.

لە بەشی نۆیەمدا چارەسەری باسی پەیوەندی دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسیم لەگەڵ بوەیهیەکاندا کردووە، کە بەسەردەمی قەڵەمڕەوی فارسی ناو دەبرێت، ئەمەش سەردەمی سێیەمی عەبباسییە و لەساڵی(٤٤٧ك/١٠٥٥ن)دا کۆتایی پێهات.

بەشی دەیەمم تایبەت کردووە بە ڕووداوەکانی سەردەمی چوارمی عەبباسیەوە کەسەردەمی قەڵەمڕەوی سەلجووقی تورکییە،پەیوەندی نێوان دەوڵەتی عەبباسی و تورکە سەلجووقیەکانم ڕوونکردۆتەوە، کە ئەویش خۆی لەنێوان دوژمنایەتی و هاوکاریدا دەبینێتەوە، ئەم سەردەمەیش بەداڕمانی دەوڵەوتی خیلافەتی عەبباسی لەساڵی (٦٥٦ك/١٣٥٨ن) و لە سەردەمی مەغۆلەکان کۆتایی پێهات.

من دڵنیام خوێنەر لەم لێکۆلینەوەیەدا سوود وخۆشیەك وەردەگرێت، هەروەك تیایدا بێلایەنی و خۆدابڕین لە چارەسەری ڕووداوەکاندا بە دیدەکات.

لەخودا دەپارێمەوە ئەم کارەم پاك وپوخت لەپێناو خۆیدا بێت و خوێتەری عەرەبی و خوێنەری موسڵمانیش سوودی لێوەربگرێت،خوای گەورە بیسەرو نزاوەرگرە.

دکتۆر محمد سهیل طقوش

بیروت /١٩٩٦/٢/١

# سەردەمی یەکەمی عەبباسی

## سەردەمی هێز و فراوانخوازی و گەشەسەندن

## (١٣٢ـ٢٣٢ك/٧٥٠ـ٨٤٧ز)

### خەلیفەکانی سەردەمی عەبباسی یەکەم و ماوەی خیلافەتی هەریەکەیان:

ئەبولعەبباس عەبدوڵلای سەففاح ١٣٢ـ١٣٦ك/٧٥٠ـ٧٥٤ز

عەبدوڵلا ئەبوجەعفەری مەنسوور ١٣٦ـ١٥٨ك/٧٥٤ـ٧٧٥ز

ئەبوعەببدوڵلا موحەممەدی مەهدی ١٥٨ـ١٦٩ك/٧٧٥ـ٧٨٥ز

ئەبوموحەممەد مووسای هادی ١٦٩ـ١٧٠ك/٧٨٥ـ٧٨٦ز

ئەبوجەعفەر هاروون ڕەشید ١٧٠ـ١٩٣ك/٧٨٦ـ٨٠٩ز

ئەبوموسا موحەممەدی ئەمین١٩٣ـ١٩٨ك/٨٠٩ـ٨١٣ز

ئەبوجەعفەر عەبدوڵلای مەئموون ١٩٨ـ٢١٨ك/٨١٣ـ٨٣٣ز

ئەبوئیسحاق موحەممەدی موعتەسەم٢١٨ـ٢٢٧ك/٨٣٣ـ٨٤١ز

ئەبوجەعفەر هاروونی واثق ٢٢٧ـ٢٣٢ك/٨٤١ـ٨٤٧ز

# بەشی یەکەم

## دامەزراندنی دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی ڕێکخستنی بانگەوازی عەبباسی

سەرهەڵدانی دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی تەنها ئەوە نەبو لە جیاتی ئومەوییەك بەیعەت بە عەبباسییەك بدرێت، یان فەرمانڕەوایی کردنی موسڵمانان لەئومەوییەکانەوە بگوازرێتەوە بۆعەبباسیەکان، ئەم ڕووداوە گەورەترە لەوەی دادەنرێت، کە تەنها گۆڕانی بنەماڵەی فەرمانڕەوایی بێت، شۆڕشی عەبباسی و ئەوگۆڕانە ڕیشەییەی ناوکۆمەڵگەی ئیسلامی، کە لێوەی بەرهەمهات، خاڵێکی گرنگی وەرچەرخان وجیاکەرەوەی ناو ئەوکۆمەڵگەیە بو بەدرێژایی سەردەمی یەکەمی عەبباسی هەبو.

ئەویش چەسپاوە کە ڕێکخستنی بیروباوەڕی لەماوەی ئامادەسازی شۆڕشدا لێهاتوویی و هەڵکەوتەییەکی باڵای ئامادەسازی ورێکخستنی هەبوە، عەبباسیەکان لەڕێکخستنی نهێنیدا ڕێبازێکیان دانا، کە بویە نموونەیەك بۆ پێشەنگی پێوەکردن و هەندێ دەوڵەت کە لە کۆشی خیلافەتی عەبباسیدا بەرپابون پەیڕەویانکرد وەك فاتیمیەکان، ئەمە وێڕای ئەو بزووتنەوە نهێنیانەی لە وڵاتی موسڵماناندا سەریان هەڵداوە وەك قەرمەتیەکان، ئەو ڕێکخستنە لەسەر نهێنی پارێزی ڕەها کە بەرپا بو بو، عەبباسیە یەکەمەکان ئەو شێوازە نهێنیەیان لە ئەنجامی ئەو چەرمەسەریانەدا گرتەبەر کە ئال وبەیت بە درێژایی سەردەمی ئەمەوی تووشیان دەبو دەوڵەتی ئومەوی هەوڵی لە ناوبردنی بزووتنەوەی عەلوییەکان و بە تایبەت سەرکردەکانی بزووتنەوەکانی دەدا، بەجۆرێ نەیدەهێشت شوێن پێیان بمێنێتەوە.

بانگەوازی نهێنی لە سەردەستی پێشەوایەکی ئال وبەیت بەرپابو، کە ئەو بزووتنەوە نهێنەی بەڕێوەدەبردو چاودێری و سەرپەرشتی ئەو ڕێکخستنانەی

دەکردو نەقیب و بانگخوازانی ئاراستە دەکرد و پلەی پێدەدان[1].

ئەو ڕێکخستنە نهێنیە لە ماوەیەکی قۆناغی تەواو گرنگدا، پێشەوایەتی کەوتە دەست عەبباسیەکان.[2]

---

١ـ سەرپەرشتکارانی بانگەوازی عەبباسی ڕێکخستنی کارگێڕی نهێنییان دانا کە زنجیرەیەك پلەوپایەی بەشێوەیەکی زنجیرەیی لەخۆ دەگرێت بەو ئامانجەی ئەوانەی پەیڕەوی دەکەن بە ئاسانکاری بەڕێوەبچێت، ئەو زنجیرەیە بەپلەی نەقیبە یاریدەدەرەکانی پێشەواکان دەستپێ دەکات و ژمارەیان دوانزە نەقیب بو، تەنها ئەمانە نهێنی پێشەوایان دەزانی ولای خۆیان ئەو نهێنیەیان دەپاراست، لە توانی سەربازی و ڕۆشنبیری و دڵسۆزی بۆ بانگەواز و توانای ڕاکێشانی پشتیوانانیدا وەك: یەکتر و هاوڕێرەو بون، لە دوای ئەمانە پلەی نەزیرەکان دێت، کە ژمارەیان حەفتا بانگەواز بویارمەتی نەقیبەکانیان دەداو فرمان وکارەکانیان بەجێ دەگەیاندن و خاوەن توانایەکی باشی بانگەوازی و سەربازی بون، لەناو ئەمانەیشدا ژمارەیەك لەبانگخوازی دەرکەوتن، کە ئەرکی ئامادەسازی دەروونی و ڕۆشنبیری پشتیوانان و ڕوودانی شۆرشیان گرتبوە ئەستۆی خۆیان وکۆمەڵێ هەڵوێستی دیار وتایبەتییان هەبو، دوای پلەی بانگخوازان پلەی بانگخوازی بانگخوازان دێت. بە دوایدا بانگخوازان لە چەند پلەیەکی چینەکانی تری خوارەوە دێت، کە چینی خوارەوەچینی ئیشکەرانن، هەر بانگخوازێك چەند ئیشکەرێکی هەبو تادەزگای نهێنی بەڕێوەببەن، دەزگاکە بەچەند شانەیەکی نهێنی کۆتایی دێت کە لە هەموو بەشەکانی وڵاتدا ڕودەچێتە قووڵایی کۆمەڵگەوە، ئیش و بنەمای ئەم دەزگانهێنیە لەسەر چەند دروشمێکی بانگەوازکاری وەستا بو، کە بریتی بون لە یەکسانی و پێشەوایەتی بۆ بنەماڵەی موحەممەد و بانگەواز بۆ چاکسازی.بڕوانە: مؤلف مجهول: أخبار الدولة عباسية. (٢١٦ـ ٢٢٢).

٢ـ عەبباسیەکان چیرۆکێك دەگێڕنەوە و وا ڕاڤەی دەکەن کە ئەوان مافی شەرعی وەرگرتنی خیلافەتیان هەیە. ئەویش ئەوەیە ئەبوهاشمی ڕابەری بانگەوازی شیعی کیسای لە سەر داوای خەلیفە سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیك چوو بەرەو دیمەشق، ئەویش ڕێزی گرت و لەگەڵیدا بو، کاتێ سولەیمان ڕەوانبێژی و توانای سەرکردایەتی و زانستی ئەبوهاشمی بینی، کە جێی حەسوودی بو، لێ ترساپێی وابو شیعە حیزبی نەیاری ئومەوییەکانن، بۆیە ژەهرخواردی کرد. ئەبوهاشم هەستیکرد ژەهرەکە لە جەستەیدا دێت و دەچێت، بۆیە زانی دەمرێت. ئەو لە نزیك شاری (حمیمە) بو. لەوێ دابەزی و لەگەڵ عەلی کوڕی عەبدوڵڵای عەبباسیدا کۆبویەوە و هەواڵی پێدا، کە ئەو دەمرێت و وەسیەتی بۆ کرد لەمافی پێشەوایەتی خۆی بۆ ئەو نەوازشی کردو پێشڕەوی بانگەوازی کیسانی دایە دەست و نازناوی بانگخوازی بانگخوازانی خۆی لەکوفەو بانگخوازەکانی تریشی پێدا، هەروەك کۆمەڵێ نامەی پێدا تا بیاندات بە بانگخوازەکانی، لەسەر

پێشەوا موحەممەدی کوڕی علی عەبباسی (١١٨ـ١٢٥ك) کە بانگەوازی عەبباسی گرتە دەست و هەوڵی گرتنەدەستی خیلافەتی دا، هەستی بەوە کرد گواستنەوەی مافی پێشەوایەتی لەبنەماڵەیەکەوە بۆبنەماڵەیەکی تردەبێ پێشتر ئامادەسازی بیرو هزرودەروونەکانی بۆ بکرێت تا ئەو بارە نوێیە قبوڵ بکەن، بۆیە وریایی و هۆشیاری وەرگرت و داوای لە شوێنکەوتوەکانی کرد تاخەڵکی بۆ ئەوە بانگ بکەن دەبێ ئال وبەیت دەسەڵات بگرێتە دەست بەبێ ئەوەی ناوی هیچ کەس بهێنن.

لە پێگەکەی خۆی لە(حەمیمە)وە کەوتە رێکخستنی بانگەوازەکەوکاروبارەکانی بەرێوە دەبردو بانگخوازو نەقیبەکانی بۆ بەرەو شوێنەلەبارەکان دەنارد کە لە هەموویان گرنگ تر خوراسان بو، ئەمەش لە رێگەی تۆرێکی نهێنی فرەبازنەوە کە ناوی (بانگەوازی ئال وبە یت)ی لەخۆگرت بو و سوبون لەسەر شاردنەوەی نیازو خواستی گرتنەدەستی خیلافەتی لەبەر چاو گرتبو، بێگومان ئەمەش زۆرێك لەپاڵپشتانی بانگەوازەکەی لەخشتە برد، چونکە ئەوان پێیان وابو ئەو بانگەوازە کار بۆ نەوەی عەلی کوری تالیب دەکات، توانای پیشەوا موحەممەد لەدانانی پەیکەری ئەو رێکخستنە نهێنیەدا، کە لەسەر چەند دروشمێکی پروپاگەندەی دەست نیشانکردنی مەڵبندی بانگەوازو دروشمەکانی ئەو ناوچانەی ئەوبانگەوازەی تێدا ئەنجامدەدرێت لەدەست نیشان کردنی پێگەی باگخوازان پیشە وئەرك لە رێگەی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ خەڵکدا دەرکەوت، لە رووی مەڵبەندی بانگەوازەوە(حەمیمە)ی هەڵبژارد بەو پێیەی پێگەجوگرافیەکەی لەلایەکەوە لەسەر

---

بنەمای ئەمەش عەلی کوری عەبدوڵلای عەبباسی و دوای خۆیشی موحەممەدی کوری چی نەخشە ورێ و بانگەوازی نهێنی شیعەی کیسانی بو بە میراتیان گرت، ژمارەیەك لە مێژوو نووسان بەر پەرچی ئەم گێرانەوە دەدەنەوەوبرِوایان بەڕاستی و دروستیەکەی نیە.

لە بارەی ئەم باس و خواسەوە بگەرێرەوە بۆ: إبن كثير ج٤ ص١٥٩، و بەراوردی بکە بە إبن طباطبا: الفخري في الآداب السلطانية و الدول الأسلامية. ل (١٤٣) کەباس لەوە دەکات هیشامی کوڕی عبدلمليك ئەبوهاشیمی بۆ لای خۆی بانگ کردووە. العبادي، أحمد موختار: في التأريخ العباسي و الأندلس ص(١٩ـ ٢٠). العمر و، علي عبدالرحمن: أثار الفرس السياسي في العمر العباسي الأول ص(٨٢ـ ٨٢).

هێڵی کاروانە بازرگانییەکان و ڕێگەی حەجە، هەروەها لە مەیدانی سیاسیەوە دوورە.

لە ڕووی دروشمەوە: بانگەوازی یەکسانی وبانگەواز بۆ ڕەزامەندی ئال وبەیتی موحەممەد وچاکسازی دەکرد، ئەم دروشمەیش لەسەر کەوتی بانگەواەکەدا ڕۆلی بینی لە ڕێگەی:

- تێکەڵ کردنی ئەو گەلانەی لە دەوڵەتی ئیسلامیدا موسڵمان ببون.
- زامنکردنی کوتلەگەرایی تالیبیەکان لە پشت بانگەوازەکەوە.

لە ڕووی ئەوناوچانەی کە بانگەوازەکەی لێوە دەربچێت، موحەممەدی کوڕی عەلی فرمانی بە بانگخوازان کرد تا جەخت لە سەر خوراسان بکەنەوە، ئەمەش لەڕاستیا مێژوویەکەیدا واتە: عەرەبە جەنگاوەرو سەقامگیرەکان و مەوالیەکان[1] وادیارە موحەممەدی کوڕی عەلی هەستی بە تەنگەژەی باری خوراسان و نزیکی تەقینەوەی بەهۆی ململانێ هۆزایەتیەکان و ناڕەزایی مەوالیەکانەوە کردووە، ئەو پێی وا بو(مەرو) کە پایتەختی خوراسانە، شوێنی لە باری ڕاکێشانی پشتیوانانە تا سوپای شۆرشی لێ پێك بێت، بەمەدەسەلمێت، کە موحەممەدی کوڕی عەلی تەواو لە باری سیاسی ودابەش کاری سیاسی هەرێمە ئیسلامیەکان تێگەیشتووە.[2]

---

١ـ بگەڕێرەوە بۆ وەسیەتەکەی پێشەوا موحەممەد بۆ بانگخوازەکانی لە ڕووی دەست نیشانکردنی خوراسان وەك مەڵبەندێك بۆ بڵاوکردنەوەی بانگەوازەکە. بڕوانە: المقدسی: أحسن التقاسیم في معرفة الأقالیم، ص(٢٩٣ـ ٢٩٤).

٢ـ لە ڕاستیدا ئەو بانگخوازە شیعیە بەناو ئال وبەیتەوە سەری هەڵدا و بانگەوازی ئەوەی دەکرد تالیبیەکان میراتگری سروشتی خیلافەتی پێغەمبەرن(ﷺ)خوراسانی بۆ گەشەسەندی خۆی بەزەویەکی لەبار دەزانی. لە ڕۆژانی (زیادی کوڕی ئەبیهی) کۆچپێکردنی ژمارەیەکی زۆری شیعە لە کوفە و بەسرە وە بۆ ناوچەی بەلخ لە خوراسان دەستی پێکرد و تا ڕۆژانی حەججاجی کوڕی یووسفی سەقەفی بەردەوام بو. بێگومان ئەو دوور فراوانە هەرێمە فارسیەکانیان بەزەویەکی لەبار دەزانی بۆبڵاوکردنەوەی بیروهزری پێشەوای چاوەڕوانکراو، کە(مەهدی) یە، بەو پێیەی مەوالیە فارسەکان هێشتا هەستیان بە پێویستی فەرمانڕەوایەکی ڕەها دەکرد، کە بەپێی بەڵێنی سەردەمی ئەکاسیرەکان دەبێ سیەفەتی سەروو مرۆڤی هەبێت بەپێ باری

لە ڕووی دەستنیشان کردنی پێگەی بانگخوازانەوە، پێشەوای عەبباسی کوفەی هەڵبژارد، کە بەهۆگری بۆئال وبەیت ناسراوە، ئەمەش بۆ ئەوە لە بارە بێتە ئەڵقەیەکی پەیوەستکردنی هاشمی لە (حمیمە) و مەیدانی بزووتنەوەکە لە(مەرو) بەو پێیەی کەش و هەواکەی هۆگر و یاریدەری شۆڕشە دژ بەئەمەویەکانە.

موحەمەدی کوڕی عەلی ئاماژەی بۆ بانگخوازەکانی کرد تا پیشەی بازرگانی بگرنە خۆ بەئامانجی بانگەوازی دەسەڵات گرتنە دەستیان بشارەوە هەروەك وەسیەتی بڵاوکردنەوەی بانگەواز بە ژیری و دانایی بۆ کردن.

بەو جۆرە بانگەوازی عەبباسی سەرکردەی لێهاتوو بانگخوازی دلسۆز و کەشی لە باری بۆ بو.

---

کۆمەڵگەی ساسانی بیرۆکەی مافی خودایی بە سەر مەملووکدا هەبێت و پاشایەتی لە پاشاوە بە میرات بۆ بنەماڵەکەی دەمێنێتەوە ونابێت بۆ هیچ بنەماڵەیەکی تر بگوازرێتەوە، پەیوەندی باشی نێوان خوراسان وهەریەك لە کوفە و بەسرە، کە دوو مەڵبەندی کۆکردنەوەی تالیبیەکان بو. هۆکارێك بو تا فارسەکان بیروڕا دژ بە ئومەوییەکان وەربگرن، بۆیە چوون بەدەم بانگەوازی عەبباسیەوە تا لەفەرمانڕەوای ئومەویەکان ڕزگاریان ببێت و هیوای گێرانەوەی ئەو دەسەڵاتەیان هەبو، کە موسڵمانان لە ناویان بردووە، ئەمە پاڵنەری زۆربەیان بو تا هەوڵی یارمەتیدانی هەر شۆڕشگێڕێکی دژ بە دەوڵەتی ئومەوی بدەن.

سەبارەت بە هۆکاری پەتاخوازی عەبباسیەکان بۆ فارس و بەدەمەوەچوونی فارسەکان بۆ عەباسیەکان بڕوانە، العمر: سەرچاوەی پێشوو ص(١١٠ـ ١١٥).

# قۆناغەکانی بانگەوازی عەبباسی

## بانگەوازی عەبباسی بە دوو قۆناغی گرنگدا تێپەر بو.

**قۆناغی یەکەم:**

ئـەم قۆناغـە لەسـەرەتای سـەدەی دووی کۆچـیەوە دەسـت پـێ دەکـات و بەپەیوەسـت بـونی ئەبوموسـلیمی خوراسـانی بانگەوازەکـەوە کۆتـایی پـێ دێـت، ماوەکەی نێوان دوو ساڵی (١٠٠ـ١٨ك/٧١٨ـ٧٤٦ز) دەگرێتەوە.

لەو قۆناغەدا بانگەوازەکە تایبەتمەندی نهێنی تـەواو ودوور لـە شـێوەی تونـد و تیـژی هـەبو، لـە کاتێکدا دەوڵـەتی خیلافـەتی ئەمـەوی لـەو مـاوەدا پەیوەسـت و یەکانگیر بو.

سێ بانگخواز بانگەوازیان لە عێراق ڕێکخست، کە بریتین لە: مەیسەرەتولعەبدی، ئەمەمەولای عەلی کوڕی عەبدوڵلای کـوڕی عـەبباس بـو، بـەکیری کـوڕی ماهـان کـە بەگرنگترین بانگخوازەکانی عێراق دادەنرێت، ئەبوسەلەمەی خـەللال، کـە لـە پێـنج سـاڵی کۆتـایی پـێش گرتنـە دەسـتی دەسـەڵاتی عەبباسـیەکان سـەرکردایەتی بانگەوازەکەی دەکرد.

لـە خوراسـان بانگەوازەکـە لەسـەر شـانی کۆمـەڵی بـانگخوازدا دامـەزرا، کـە ناودارترینیان بریتین لە: ئەبوعیکرمەی سەراج مەولای ئیبن عەبباس و موحەممـەدی کـوڕی خونـەیس وحـەییانی عـەتتار، کـەثیری کـوفی و خەدداشـی بـەلخی و نـەقیبی نـەقیبان سـولەیمانی کـوڕی کـەثیری خـوازاعی وادیـارە دەسـەڵاتی فـەرمانڕەوا بەنگەوازەکـەیان زانیبێـت، بۆیـە بانگخوازەکـانی ڕاوەدوونـا و هەنـدێکی لێکوشـتن، هەروەك هەندێکی تریان بونە قوربانی زێدەڕۆییەکەی وەك خەدداشی بەلخی.

پێشەوا موحەممەدی کوڕی عەلی عەبباس گۆرانکارییـەکی گرنگـی سـتراتیژی لـە بانگەوازەکـە داکـردو تایبەتمەنـدی کـرد بەخۆیـەوە، ئەمـەش بـۆ بانگخوازەکـانی ئاشکراکرد، بەڵام دەبێ تەنها خۆیان بیزانن و خەڵکی بەگشتی نەیزانن.

پێشەوا موحەممەد لەساڵی (۱۲۵ك/۷٤۳ز) لە دوای ئەوەی هەنگاوێکی دووری بانگەوازەکە بڕی و لە دوای وەسیەتی پێشەوایەتی بۆ ئیبراهیمی کوڕی کۆچی دوایی کرد.[۱]

**قۆناغی دووەم:**

ئەم قۆناغە لەو کاتەوە دەست پێدەکات، کە ئەبوموسلیم پەیوەستی بانگەوازی عەبباسی بو تاساڵی (۱۳۲ك،۷٥۰ز) بەردەوامبو لەو ساڵەدا دەوڵەتی خیلافەتی ئەمەوی ڕووخا و دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی دامەزرا.

بانگەوازی عەبباسی لە دوای مردنی پێشەوا موحەممەدی کوڕی عەلی دوچاری لەرینەوە و داهەژانێك بو لەبەر ئەوەی کۆمەڵێ بزووتنەوەی شیعی سەربەخۆیی خۆیان ڕاگەیاند پێشەوا ئیبراهیم لەوە ترسا پێشڕەو کاروبارەکانی لەدەستدا نەمینێت و ئەو بزووتنەوانە بانگەوازەکەی بگرنە دەست بۆیە هەستا تا گوێڕایەلی عەرەبە خوراسانیەکان بەشێوەیەکی تایبەت بگێڕێتەوەو توانی قەڵەمڕەوی شەخسی خۆی سولەیمانی کوڕی کەثیری خوزاعی سەرکردەیان بەلای خۆیدا ڕابکێشێت، کەتوانی جیابونەوەی کۆمەڵەی خوراسانی و نێوان سەرکردایەتی(حمیمە)یەکبخاتەوە لەوقۆناغەدا بانگەوازەکە تایبەتمەندی بەکارهێنانی هێزی بۆ بە دیهێنانی ئامانجەکانی هەبو، جا لەدوای ئەوەی شانەکانی فراوان بون و ڕیشەکانی بەناو کۆمەڵگەی خوراسان ڕووچوون، دەبو سەرکردەیەکی لێهاتووی بەتوانای هەبێت بە ئەوەی سەرپەرشتی کاروبارەکانی بکات، پلان بۆ جوولانەوانەکانی دواتر دابنێت، پێشەوا ئیبراهیم سەرکردایەتی نەقیبی نەقیبانی پێشکەش بە سولەیمانی کوڕی کەثیر کرد، بەڵام سولەیمان لەبەر ئەوەی پیر و بەتەمەن بو ئامادەنەبو ئەو پۆستە وەربگرێت[۲]، پاشان پێشکەشی ئیبراهیمی کوڕی سەلەمی کرد، ئەویش ئامادەنەبو وەریبگرێت[۳] ئەوکات هەنگاوی یەکلاکەرەوەی

---

۱ ـ إبن کثیر:ج۱۰ ص٥.

۲ـ سولەیمانی کوڕی کەثیر کاتێ سەرکردایەتی بانگەوازەکەی بۆ خرایە ڕوو وتی: (کاری دوو کەسم بۆ بەرێوەناچێت). إبن الأثیر ج٤ ص۲۹٥.

۳ـ ئیبراهیمی کوڕی سەلەمە بیانووی ئەوە بو کەسی لەو چاکتر هەیە. هەمان سەرچاوە.

گرتەبەر و ئەبوموسلیمی خوراسانی هەڵبژارد[١] تا لە خوراسان نوێنەرایەتی کاری ئەو بکات و کاروباری دایە دەست و ناردی بۆ ئەوێ[٢].

هەڵبژاردنی ئەبوموسلیمە هەنگاوێکی سەرکەوتو وکرانەوەی قۆناغێکی نوێی ڕاپەڕاندنی ژیانی بانگەوازەکە بو بەو پێیەی مەولایەك لە خوراسان کاروبارەکان بگرێتە دەست، کە خاوەن قەڵەمڕەوی ڕوونی فارسی و پێکدادانی هۆزایەتی بێت، متمانەی لە عەرەبێکی ئازاد زیارترە، ئەو نامەی پێشەوا ئیبراهیم پێیدا، کاتێ دەست پێ کردنی کاروبارەکانی لە خوراسان پێ سپارد بەڵگەیە لە سەر ئەوەی هەواداری و ڕاکێشانی عەرەبی یەمەنی بەردی بناغە و کلیلی سەرکەوتنەیە[٣]. لە ئەنجامی هەوڵە سیاسی وسەربازییەکانی ئەو وموسلیمدا کاروباری عەبباسیەکان لەخوراسان سەقامگیربو ئەوپیاوە توانی بەهۆی لێهاتووی خۆیەوە ببێتە بانگخوازی عەبباسی و لە دوای بە دەست خستنی متمانەی سولەیمانی کوڕی کەثیر دەست بە سەر هەموو ڕۆژهەلاتدا بگرێت[٤].

---

١ـ گێرانەوە مێژووییەکان ڕای زۆریان لە سەر ئەوەیە کە ئەبوموسلیم لە بنەڕەتدا فارسە و مەولای فارسێك بوە بە ناوی حەقیقی بەهزوان. بنەڕەتەکانی بانگەوازەکەی لە کوفە وەرگرت و خوازیار بو چاودێری وریایی بانگخوازانی ئەوێی هەبێت. ئەوانیش بردیانە لای پێشەوا ئیبراهیم ئەویش هەستی کرد ئەبوموسلیم ژیرییەکی نائاسایی و کارگێری بەهێزی هەیە و دڵنیا بو ئەو کەسەیە کە دەکرێ پشتی پێبەستیت. لە بارەی بنەڕەت و ژیانی ئەبوموسلیمەوە بڕوانە: الطبري ج٧ ص١٩٨ـ ١٩٩: الخطيب البغدادي: تأريخ بغداد ج١٠ ص(١٠٧ـ ١٠٨): إبن خلكان: وفيات الأعيان ج٣، ص(١٤٥ـ ١٤٦).

٢ـ إبن خلكان: هەمان سەرچاوە، ل (١٤٧).

٣ـ بۆ دەقی نامەکە بگەڕێرەوە بۆ الطبري: ج٧ ص٣٣٤. شایەنی باسە هەندێ لە مێژوونووسان بڕوایان بەبونی ئەو وەسیەتە نیەودەڵێن: لەلایەن دوژمنانی شۆڕشی عەباسی و لە پێناو شێواندنی سروشتی وئامانجی بانگەوازەکە وهەڵنانی عەرەب دژ بە بانگەوازەکە ئەو نامەیە دروست کراوە، چونکە لە نامەکەدا وەسیەت بە لە ناوبردنی عەرەب دەکات، بەڵام ڕووداوەکان جەخت لە سەر ئەوە دەکەنەوە، کە هەندێ لەو نامەهاتووە بە تایبەت ئەوەی پەیوەست بە ڕاکێشانی یەمانیەکان تا دژبە (موزر)ئیش بکەن.

لە بارەی قسەکردن لە بونی ئەو وەسیەتە بگەڕێرەوە بۆ: عمر، فاروق: التاريخ الأسلامي و فكرالعشرين، ص٧٨ـ ٧٩.

٤ـ محمود، حسن أحمد و الشريف، أحمد إبراهيم: العالم الأسلامي في العنر العباسي ص(٤٨ـ ٤٩).

ئەمەو چوارساڵی کۆتایی ژیانی دەوڵەتی خیلافەتی ئومەوی (۱۲۹ــ۱۳۲ك/۷٤٦ــ۷٥٠ز) خاوەن چەند گەشەسەندنێکی خێرابو و ڕیشە ژیانی عەبباسی پێکهێناو بەشێوەیەکی گشتی دیمەنی لاوازی ڕەگەزی عەرەبی تیادا بەدیارکەوت، چونکە چەند ناکۆکی ودابەشبونێکی سەخت زاڵبوبەسەریدا، لەوماوەیەدا بەشێوەیەکی تایبەت لاوازی ئومەویەکان بەدیارکەوت و چالاکی پاکتاوکردنی نیزامی ئومەوی بەخۆیەوەبینی وهێزەکان لە نێوەندی جەنگەکاندا لەسەر دوو قۆناغدا دەرکەوتن: قۆناغی ئەبوموسلیمی خوراسانی وقۆناغی قوحتەبی کوڕی شەبیب، بەدامەزراندنی دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی کۆتایی پێهات.

# قۆناغی ئەبو موسلیمی خوراسانی

ئەبو موسلیم لەگەڵ ئەوەی گەیشتە خوراسان لە بەلخ دابەزی و دوای ماوەیەکی کەم متمانەی سولەیمانی کوری ئەثیری دەست کەوت، پاشان بە ژیری و لێزانی کەوتە بەڕێوەبردنی کاروبارەکان و لەگوندەکانی رۆژهەڵاتەوە دەیگواستەوەو دەچوو بۆ ئەویتر و خەڵکی هاندەدا تالە دەوری بانگەوازەکە کۆببنەوە لەمەیشدا سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێنا و مەوالیەکانی کۆکردەوە ودیمەنی گەندەڵی فەرمانڕەوی ئومەوی و هاواریان بەدەست ستەمی ژێر سایەی ئومەوی بۆباسکردن و بە لای خۆیدا ڕاکێشان و بەڵێنی پێدان دواتر دەیان کاتە گەورەو کاربەدەست و زەوییان پێ دەدات، هەروەك توانی دیهقانەکان و خەڵکی دەشت و دەر و کشتوکاڵەکان بە نزیکردنەوەی نێوانی بیروباوەڕی ئیسلامی و بیروباوەڕە جەماوەرییەکان بە تایبەت لەوەی پەیوەندی بە (تەناسوخ لئەرواح)ەوە هەیە. بۆ لای خۆی ڕابکێشێت،[1] پاشان هۆزە عەرەبییە یەمەنیەکانی بۆ لای خۆی هێناو خەڵکانێکی پێشڕەویش کە بە بەرهەڵستکارییانە بۆ نیزامی ئومەوی ناسرا بون ئەوانیشی دایە پاڵ خۆی.

پاش ئەوەی ئەبوموسلیم لەهێزو تواناو بڵابونەوەی بانگەوازەکە دڵنیابو، نوسراوێکی لەوبارەیەوە بۆ سەرکردایەتی لە(حمیمە) بەرزکردەوە، پێشەوا ئیبراهیمی کوڕی موحەمەدیش لەلایەن خۆیەوە پێشڕەوی کارەکەی گرتە دەست و مێژووی دەست پێکردنی بزاوتەکەی دەستنیشان کرد و باری ناوخۆیی هێزو توانای بانگەوازەکە وباری ناوخۆی نالەباری دەوڵەتی ئومەویشی لە بەر چاو گرت، لە رۆژی پێنج شەمە لە ۲٥ی ڕەمەزانی ساڵی ۱۲۹ك/ مانگی حوزەیرانی ساڵی ۷٤۷ز و لە سەر دەستی سولەیمان کوڕی کەثیر شۆرشەکە لە خوراسان ڕاگەینرا و شیعە عەبباسیەکان لە دەوری ئەبوموسلیم کۆبونەوە و ڕەنگی ڕەشیان بۆ جل وئاڵاکانیان

---

۱ـ إبن أعثم: أبو محمد أحمد: كتاب الفتوح، ج٤ ص٣٤٨، بارتولد: تركستان من الفتح العربي إلى الغزو المغولي ص٣١٤.

بەکارهێنا، بۆیە بەڕەش پۆشەکان ناسران.[١]

لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و لە(سفیذنج) یەکەم نوێژ بۆ پشتیوانی عەبباسیەکان کراو بەدیارکەوتن[٢]، هەر دەبو لەگەڵ هێزە ئومەویەکان پێکدابدەن، تا هەڵوێستی سیاسی و سەربازی دەست نیشان بکرێن، ئەبوموسلیم لە شێوازی کارکردنی پشتی بە تێکەڵکردنی دوو ڕەفتاری سیاسەت وهێزی سەربازی بەست بەو ئامانجەی ناکۆکی بخاتەنێوان هێزە خوراسانیەکان[٣] وپاڵی پێوەنان تا پێکدابدەن و یەك دەنگ نەبن خۆی لەو نێوەندەدا بەهێز ببێت، ئەمەش مەترسی بۆ سەر بانگەوازی عەبباسی هەبو. لەم کارەیدا بە ژیری خۆی توانی ناکۆکی و دوژمنایەتی نێوان والی ئومەوی لە سەر خوراسان نەسری کوڕی یەسار و نەیارەکانی بهێڵێتەوە و یارمەتی جەدیعی کرمانی و دواتر عەلی کوڕیشی بدات، هەروەها یارمەتی شەیبانی حەروری بدات تا ئومەویەکان لە ناوبەن، پاشان تۆی ناکۆکی و دووبەرەکی لە نێوان والی ئومەوی و سەرۆك هۆزەکاندا چاند و لەکۆتاییدا لەدەست شەیانی حروری و عەلی و عوسمانی دوو کوڕی کرمانی ڕزگاری ببێت.

بەو جۆرە ئەبوموسلیم بە سەر هەموو بەرەکانی هێزە سیاسیەکاندا جووڵا[٤] و توانی بەرهەمی هەوڵەکانی بە لەناوبردنی دوژمن و نەیارەکانی بچنێتەوە و بەتەنها حوکمی خوراسان بگرێتەدەست ونەسر رایکرد بۆ نەیسابور[٥]. ڕێبەری خوراسانی لە

---

١ـ إبن أعثم: ج ص٣٤٨.
٢ـ الطبري: ج٧ ص٣٥٧.
٣ـ لە سەر مەیدانی خوراسان چوار هێزی کێبڕکێکەر هەبون:
(١) هێزی دەوڵەتی ئومەوی کە نەسری کوڕی یەساری والی خوراسان بەرپرسی بو.
(٢) هێزی یەمەنی و ڕەبیعە بەسەرکردایەتی جەدیعی کرمانی.
(٣) هێزی حەروری خەواریج بە سەرکردایەتی شەیبانی حەروری.
(٤) هێزی شۆرشی عەبباسی بە سەرکردایەتی ئەبوموسلیمی خوراسانی.
٤ـ لە بارەی ئەو سیاسەتەی ئەبو موسلیم گرتیەبەر و توانی فورمانڕەوایی خوراسان بە تەنها بگرێتە دەست. بڕوانە: إبن أعثم ج٤ ص٣٣٨: الطبري: ج٧ ص٣٥٥، ٣٦٧، ٣٧٧، ٣٨١.
٥ـ الطبري: هەمان سەرچاوە: ص٣٧٧ـ ٣٨١.

دوای سەقامگیربونی لەو ناوچانەی دەستی بەسەر داگرتبون، کەوتە ڕزگار بون لەو سەرکردە دیارانەی کە کێبڕکێکەری خۆی لەسەر سەرکردایەتی دەزانین، بۆیە سولەیمانی کوری کەثري خوزاعی نەقیبی نەقیبانی کوشت. هەروەها موحەممەدی کوڕی سولەیمانی کوشت[1]. هەروەك لە دەست ژمارەیەك لەو پشتیوانانەی شۆرش ڕزگاری بو کە لە کاری سەربازی و سیاسی بەشدارییان لەگەڵ کرد.

بەو جۆرە کەش و بارودۆخەکە تەنها بۆ ئەبوموسلیم مایەوە و بو بە تاکە فەرمانڕەوای وڵاتی رۆژهەڵات و نازناوی (ئەمیر ئال موحەممەد)[2]ی لە خۆی نا. واتە خۆی زیاتر لە والیەکی سەر پارچە هەرێمێك دەزانێت.

لە ماوەی جەنگی خوراساندا توانا سەربازی و سیاسی و کارگێریەکانی ئەبوموسلیم دەرکەوتن. ئەو توانا گەورانەی بۆ ئەو والیە کۆبونەوە وایانکرد لە گەورەترین سەرکردەی دەوڵەتی عەبباسیەکان بێت.

ئەو پیاوە لە دوای ئەوەی لە خەڵکی ناوچەی خەڵکی وڵات نزیکبویەوە، بو بە هیوای ئەو مەوالیانەی لەگەڵیدا بون لەبەرپەرچدانەوەیان و بۆ زیندوو کردنەوەی میراتی کۆنی فارسی توانایان تێدا بەدیدەکرد، دەکرێت ئەبوموسلیم بە سەرەتایەك بۆ دەرکەوتنی بەرمەکی و تاهیری و بوەیهیەکان دابنێن. بەمەیش بنەڕەتی دەوڵەتی خوراسانی دانا.

---

١ـ شیاوی باسە ڕووداوی کوشتنی سولەیمانی کوڕی کەثیر بەبێ گەڕانەوە بۆ لای خەیفەیان وەرگرتنی ڕای ئەمیر ئەبوجەعفەر کە ئەو کات لە خوراسان بو ڕوویدا. بگەڕێرەوە: عمر: سەرچاوەی پێشوو ص ٨١.

٢ـ الطبري: ج٧ ص٣٨٦ـ ٣٨٨.

# قۆناغی قوحتوبەی کوڕی شەبیب

هێشتا شۆرشی عەبباسی لە خوراسان تازە سەقامگیر دەبو سەرکردایەتی خۆی بۆ وەشاندنی گورزی کۆتای لە دژی کوڕی نەسری کوڕی سیار کە بەرەو نەیسابور و لەگەڵ پشتیوانە عەرەبەکانی هۆزەکانی تەمیمە وبکر وقیس ڕایکرد بو ئامادە دەکرد، لەو کاتەدا سەرکردایەتی چالاکیە سەربازیەکان لە ئەبوموسلیمەوە بە فرمانی پێشەوا ئیبراهیم کوڕی موحوممەد گوازرایەوە بۆ قوحتوبەی کوڕی شەبیی تائی.[1]

سەرکردایەتی حومەیمە لە ڕوودواوەکانی ئەو دیو خوراسان بە ئاگا بوە پێی باش بوە ئەبوموسلیم لەو ناوچەیە زیاتر تێپەر نەکات و لە ناوچە عەرەبیەکاندا دەبێ سەرکردەیەکی عەرەب چالاکیە سەربازییەکان بگرێتە دەست قوحتوبە دەستی بەسەر(تووس و نەیسابور)[2] داگرت و نەسری لە لای خۆیەوە زانی هەرگیز ناتوانێ بەرگری بکات و دەسەڵات بگێڕێتەوە. بۆیە لە نەیسابورەوە بەرەو (ڕەی) ڕایکرد.[3]

حکوومەتی مەرکەزی لەدیمەشق لەم گەشەسەندنەخێرایانەی خراسان ڕاچڵەکی و یەك لە دوای یەك سوپای دەنارد تا هێزی شۆرش لەناو ببەن، بەڵام دەوڵەت لەو کارەیدا سەرکەوتوو نەبو و شارەکانی وەك ئەسفەهان و نەهاوەند و چەندێکی تر[4] دران بەدەستەوە و ڕێگەی عێراق لە بەردەم سوپای شۆرشدا کرایەوە.

نەسر لە(ڕەی)لە کەشی شکستخواردن وبەبێ ڕوودانی جەنگ مرد[5]. بە مردنی نەسر ئومەویەکان سەرکردەیەکی گەورەیان لە دەستدا، کە لەو ململانێ بەردەوامە سەرکردایەتی دەکردن. ئەمەش کاریگەری خراپ و سلبی لەسەر باس وخواس و کێشەکەیان بەجێهێشت.

---

١ـ هەمان سەرچاوە: ص٣٣٨.

٢ـ هەمان سەرچاوە: ص٣٨٩ـ ٣٩٠.

٣ـ هەمان سەرچاوە ٣٩٠، إبن أعثم ج٤ ص٣٥٣.

٤ـ الطبري: ج٧ ص٤٠٥ـ ٤٠٨، اليعقوبي: تأريخ اليعقوبي ج٢ ص٢٧٥.

٥ـ إبن أعثم: ج٢ ص٣٥٣

قوحتوبە لە کەشی سەرکەوتن و بە سوپاکەیەوە بەرەو کوفە چوو، لە کاتێدا یەزیدی کوڕی هوبەیرەی والی ئومەوی دەسەڵاتی عێراقی لە دەست بو بەرەو ڕووی دەچوو، جەنگێك لە نێوان هەردووکیان ڕوویدا و بە سەرکەوتنی قوحتوبە کۆتایی پێهات، ئیبن هوبەیرە بەرەو(واست) ڕای کرد ولەوێ سەنگەری گرت، بەڵام قوحتوبە نەژیا تائەنجامی کۆتایی ببینێ و لەو کاتەی لە ڕووبار دەپەڕیەوە خنکا[1] وحەسەنی کوڕی لەکشانە سەرکەوتووەکەیدا شوێنی گرتەوە و لە چواردەی مانگی موحەرەمی ساڵی (١٣٢ك/٧٤٩ز)دا چوویە ناو کوفە و دانی بە ئەبوسەلەمەی خەللای سەرۆکی بانگخوازانی عێراقدا وەك وەزیر بنەماڵەی پێغەمبەر نا و بوبە خاوەنی دەسەڵاتی کرداری.[2]

بەمەیش سەرەنجامی عێراق سەقامگیر بو، سەقامگیر بونی شۆرش لەو وڵاتە لە دوای مەشریق دەستکەوتێکی گەورە بو بە جۆرێك دەکرا بانگەوازەکە دەربکەوێت و خوراسانیەکان پێشەوای خۆیان لە بنەماڵەی موحەممەد بناسن.[3]

---

١ـ هەمان سەرچاوە، (٣٥٧): اليعقوبي: ج٢ ص(٢٧٧).

٢ـ هەمان ئەو دوو سەرچاوە.

٣ـ محمود الشريف: سەرچاوەی پێشوو، ص(٦٤).

# عەبباسیەکان دەسەڵات دەگرنە دەست

ئەبو موسلیم بەردەوام ئاگاداری ڕووداوەکانی عێراق بو، ئەمەش لە ڕێگەی ئەبولجەهمی کوڕی عەتیەی نوێنەری سیاسی خۆیەوە، کە هاودەمی سوپاکەی قوحتوبە بو و هەژموونی بە سەر هێزە چەکدارەکانی هەبو. ئەبوسەلەمەی خەللال دانی پێدا نا و لەو پایە سیاسیەی خۆیدا هێشتیەوە.

ئەبوسەلەمەیش بەو پێیەی بە (وەزیری بنەماڵەی موحەممەد) وەسف دەکرا بەرپرسی کوفە بو[1]، ئەو پایەو نازناوەش تازە داهاتن[2] لە سروشتی ئەو کارانەی کە پەیڕەوی دەکردن وئەو بەر پرسیارێتیانەی لەوماوەیەدا لەسەر شانی بون، ئەوەمان بۆدەردەکەوێت، کە فرمانکەر وڕێکەر هەر خۆی بوە، هەموو پشتیوانانی شۆرشەکەیش دانیان بەو دەسەڵاتەیدانا وە، بەڵام بە تەواوی قەڵەمڕەوی بەسەر سوپادا نەبوە، پاش ئەوەی پشتیوانانی شۆرش دەستیان بە سەر عێراقدا گرت.

کاتێ ئەوە هات کەسێ لە بنەماڵەی پێغەمبەر(ﷺ) کە بەو دروشمەوە شۆرشەکە بەرپاکرا دەستنیشان بکرێت، ئەویش ئیبراهیمی پێشەوا بو، ئەو ناوە بلاوبو، بەڵام ئەم هێنان و بردنە پەردەی لە سەرهەڵدا وکاری بۆ ئومەویەکان ئاسان کرد تا پەیوەندی نێوان ئەو شۆرشەکە ئاشکرا بکەن، بۆیە مەڕوانی دووەم پێشەوا ئیبراهیمی لە حەڕان گرت، پاشان لە مانگی موحەڕەمی ساڵی (١٣٢ك/مانگی ئەیلولی ساڵی ٧٤٩ز)دا کوشتی[3]. گێرانەوەکان جەخت لە سەر ئەوە دەکەنەوە پێشەوا ئیبراهیم لەکاتی گرتندا کۆتا قسەی خۆی بۆ بنەماڵەی کەی خۆی کردووە و وەسیەتی بۆ ئەبولعەبباس عەبدوڵڵای کوڕی موحەممەدی برای کردووە و کردویەتی بەخەلیفەی دوای خۆی فرمانی بە بنەماڵەکەی کردووە تا لەگەڵ ئەبولعەبباسدا بچن

---

١ـ الطبري: ج٧ ص٤٥٠.

٢ـ شعبان، محمد عبدالحي: الثورة العباسية، ص (٢٥٧).

٣ـ الدينوري: الأخبار الطول ص٢٥٢ـ ٢٥٣، اليعقوبي: ج٢ ص٢٧٤، مؤلف مجهول: أخبار الدولة العباسية ص٣٩٣.

بۆ کوفە و لەپێش مردنی سەبارەت بەو دەستنیشانکردنە هەواڵی بە هاوەڵەکانیش داوە.[١]

کاتێ بنەماڵەی عەبباسی گەیشتنە کوفە، پاش ئەوەی سوپای شۆرش چووەیە ناو کوفە، ئەبوسەلەمە بنەماڵەی عەباسی لە ماڵی وەلیدی کوڕی سەعدی مەولای بەنی هاشمدا دامەزراند و فرمانی کرد تا بیان شارنەوە ودەرنەکەون، نەهێشت هیچ سەرکردە و لایەنگرێکی تا ماوەی چل شەو پێیان بزانێت و ڕازی نەبو خەرجی ئاڵ و گۆریان بۆ بدات[٢]. لە هەمان کاتدا نامەی بۆ سەرکردەکانی ئاڵ وبەیتی نەوەی عەلی کوڕی ئەبوتالیب نارد و بە چەند مەرجێکی دیاریکراو گرتنە دەستی کاروباری باوەڕدارانی بۆ کردن[٣]، لە ڕاستیدا ئەو کاتێ هەواڵی مەرگی پێشەوا ئیبراهیمی کوڕی موحەممەدی پێگەیشت سوور بو لە سەر ئەوەی کارەکە بگوازێتە بۆ دەست بنەماڵەی عەلی. بەڵام ئەوان ئامادە نەبون ئەوە قبوڵ بکەن[٤].

پێویستە پرسیار بکەین: ئەو بڕوبیانوانە چی بون، کە ئەبوسەلەمە بۆ گواستنەوەی خیلافەت بۆ بنەماڵەی عەلی کوڕی ئەبوتالیب دەهێنایەوە؟ ئەو مەرجانەش چی بون کە بۆ دانە دەستی ئەو پایە داینا بون؟

وادیارە وەزیر ئالو مەحەممەد زۆر گوێی بە وەسیەتەکی پێشەوا ئیبراهیم بۆ ئەبولعەبباسی برای نەداوە، یان بەلایەنی کەم ئەو پێی وانەبو ئەبولعەباس بۆ گرتنە دەستیی کاروباری باوەڕداران لە هاشمیەکان چاکتر و لە بار تربێت، بەڵام بێگومان ئەو پیاوە کەوتبوە ژێر فشاری ڕووداوە فرەئاڕاستە سیاسیەکانەوە. ناودارترینیشان ئاڕاستەی عەلەوی و ئاڕاستەی خوراسانی و ئاڕاستەی ڕازیکەری

---

١ـ الطبري: ج٧ ص٤٢٣.

٢ـ هەمان سەرچاوە، ص٤٣٠.

٣ـ ئەبوسەلەمە نامەی بۆ جەعفەری سادق و عەبدوڵلای مەحز و عومەری ئەشریف نووسی کە هەموویان لە حیجاز بون.

٤ـ سەبارەت بەوەی پەیوەندی بەنامە ناردنی ئەبوسەلەمە بۆ ئەو سەرکردانە و پەرچەکرداریان بۆ ئەو کارەیە، بگەڕێرەوە بۆ اليعقوبي: ج٢ ص٢٨٢ـ ٢٨٣، إبن الطبا طبا: ص١٣٧ـ ١٣٩.

نەتەوەی فارسی. ئەو دەبو کەسێ هەڵبژێریت کە هەموویان پێ ڕازیبن، بەتایبەت بە ڕوونی ناکۆکی و جیاوازی لە نێوان دوو تێروانینی یەکەمدا سەبارەت بە سەڵاحەتیان خۆی نواند[1].

لەو گۆڕان و لادانەی بەلای بنەماڵەی عەلیدا، ئەوە تێدەگەین ئەبوسەلەمە لە ڕوانگەی باری سیاسی دەوروبەری و پێشبینی کردنی بۆ داهاتوو ئەوەی بۆ دەرکەوتووە پێشڕەو سیاسیەکانی پێ دەچێ لە ژێر سایەی فەرمانڕەوای عەبباسی نەیەتە دی، هەروەها کەمەڵێ سەرکردەی فارسی خوراسانی نوێنەرایەتی ئاڕاستەی ڕازیکەری نەتەوەیان دەرکرد. ئەویش دەیویست کارەکە بداتە دەست تالیبیەکان و لە گواستنەوەی دەسەڵاتدا فەزل و جێ دەستی هەبێت بەو نیازەی ئامانجی زیندوو کردنەوەی خەونی نەتەوەی فارس بێنێتە دی[2].

لە ئەنجامی ئەو ناکۆکیە لە دیدی سیاسی و بیروباوەڕییەوە، ئەبوسەلەمە ماوەی دوو مانگ ڕۆچووبوە گەڕان بە دوای کەسێکی بنەماڵەی موحەممەد، کە هەمووان لێ ڕازیبن و ئەویش بەپێی مەرجە سەختەکانی خوراسانیەکان بەو پایە ڕازیبێت، بەڵام لەو ئاڕاستەوە بەردەوام سەرکردەکانی ئال وبیت بەرپەرچی داواکەیان دەدایەوە[3].

لە کۆتاییدا خوراسانی کەسی هەڵبژێردراوی عەبباسی خۆی ئەبولعەبباسی عەبدڵڵای کوڕی موحەممەدی وەك ئەمیری باوەڕداران داناوله ڕۆژی هەینی (دوانزەی ڕەبیعولئاخیری ساڵی(١٣٢ك/مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ٧٤٩ن)دا بەیعەتی خیلافەتی پێدرا٤. ئەوەی پێویستە لێرەدا باس بکرێت، ئەوەیە مێژووی خیلافەتی

---

١ـ تالیبیەکان دوایان دەکرد خودی ئەمیر ببێتە ئەمیری باوەڕداران، واتە فەرمانڕەوای سیاسی و ئایینی لە یەك کاتدا هەبێت. بەڵام دیدی خوراسانی پێی وابو دەبێ گۆڕای پیشەی لە پەیکەری نیزامی پێشووی سیاسیدا ئەنجام بدرێت بە جۆری ئەمیری باوەڕداران تەنها دەسەڵاتێکی سنووورداری ئاینی هەبێت بە جیا لە دەسەڵاتی کاتی سیاسی. سەبارەت بەم بابەتە بڕوانە: شعبان، سەرچاوەی پێشوو، ص٢٥٨.

٢ـ العمرو: هەمان سەرچاوە، ص(١٤١).

٣ـ شعبان: ص٢٥٨ـ ٢٥٩.

٤ـ إبن كثير: ج١٠ ص٥٢.

ئەبولعەبباس لەدوای کوژرانی مەڕوانی دووەمی کۆتاخەلیفەی ئومەویەکان لە٢٧ژیلحەجەی هەمان ساڵدا بەرامبەر بە مانگی تەمووزی ساڵی٧٥٠ز، کەمێژووی دامەزراندنی دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسیە دەست پێ دەکات، ئەبوسەلەمە کە بەبێ ئەوەی ئاگای لێبێت هەموو شتەکان بڕابونەوە، تەنها ئەوەی لە بەردەم مابویەوە بەو بارەیە ڕازیبێت لەبەردەمیاندا بیانووی ئەوەی هێنایەوە: (من تەنها ڕێك کردنەوەی بارەکەم ڕێکدەخست ئەگەر کارم تێدانە دەکرد)١.

وادیارە ئەبوموسلیم پێش ڕوودانی ئەو کارەدا ڕاوێژی پێ کرابێت وپێ ڕازی بوبێت، بەوبەڵگەیەی ئەبوجەهمی نوێنەری سیاسی ئەبوموسلیم لە دەست نیشان کردنی ئەبولعەباسدا چالاکیەکی دیاری نیشاندا[2].

---

١ـ الیعقوبي: ج٢ ص٢٨٣، الطبري: ج٧ ص٤٢٠.

٢ـ الطبري: هەمان سەرچاوە، ص ٤٢٩ـ ٤٣١.

# ئاڕاستە گشتیەکانی دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی

دەوڵـەتی خیلافــەتی عەبباســی هــەر لــە دامەزرانیەوەسیاســەتێکی ڕوونــی ڕۆژهــەڵاتی گرتەبەروهــەر لەســەرەتای پێگەیشتنەوە ڕووی لــە خوراســان بــو، ئــەم گۆڕانەیەشی لەئەنجامی چەند هۆکارێکەوەبو، کە گرنگترینیان بریتین لە:

خـەڵکی شـام نـەیاری عەبباسیەکان بـون، چـونکە هێشتا هـەوادار و پـشتیوانی ئومەویەکان بون.

- گواستنەوەی پایتەخت لە دیمەشقەوە بۆ بەغداد.
- کاریگەری فارسەکان لە سەر ڕێکخستنەکان و ژیانی عەبباسی.
- زیندوو بونەوەی بازرگانی ڕۆژهەڵاتی.
- دەوڵەتی عەبباسی لە جیهانی دەریای ناوەڕاست دوورکەوتەوە.
- عەبباسـیەکان گرنگیـان بەدامەزرانـدنی کەشـتیگەلێکی دەریـای لـە دەریـای ناوەڕاستدا نەدا، کە هاوشێوەی کەشتیگەلی ئومەوی بێت.

بێگومان گواستنەوەی خیلافەت لە ئومەویەکانـەوە بـۆ عەبباسیەکان گـۆڕانێکی ڕیشەیی وگەشەسەندنێکی بەرفراوان و قووڵی لە هەموو ژیانی ئیسلامیدا لەگەڵدا بو، ئەمەش لەئاڕاستەی گشتی خیلافەتی عەبباسیدا دەرکـەوت وهـەر لـە سـەرتاوە بـە گواستنەوەی پایتەخت لەدیمەشـقەوە بۆبەغـداد خـۆی نوانـد، بـەم کـارەیش جـۆرە هەنگاوێکی لەگواستنەوە لە جیهانی بیزەنتیەوە بۆ جیهانی فارسی پێکهێنا.

ئەمەو ئـەو چـالاکیە جەنگیـە گـەورەی سـەردەمی ئومـەوی لەبـەرەی ڕۆژئـاوایی جیهانی دەریای سپی ناوەڕاستدابە خۆیەوە بینی، پاشەکشەی کرد، عەبباسـیەکان واسـەیریان دەکـرد کـەناراوەکان وسـنوور وکۆتـایی دەوڵەتەکەیانـەو دەبـێ بـەگری لێبکـەیت، نـەوەك هێرشـی لێوەبکـەیت، لەئـەنجامی ئـەم پاشەکشەیـشدادەسەڵاتە ئیسلامیەکانی مەغریب و ئەندەلوس بەرپرسیارێتی بەرگریکردن لە حەوزی ڕۆژئاوای ئـەو دەریایـەیان گرتـە ئەسـتۆ، عەبباسـیەکان بەشـێوەیەکی گـشتی ڕوویـان کـردە ڕۆژهــەڵات، لەتورکــستان مەترســی کــشاوی چــینییان بۆســەر وڵاتــی موســڵمانان

وەستاند. پاشان دوای ئەوە پەیوەندیەکی پتەو لەگەڵ جیهانی چینیدا کەوتە نێوانیان، بەتایبەت لەبواری بازرگانیدا، موسڵمان لەهەرێمی(سند)دا بڵاوبونەوە و لەوێ قەڵەمڕەوی ئسلامییان پتەوکرد.

دەریایی ئیسلامی لە زەریای هیندیدا گەشەیکرد تاچەند ڕۆلێکی بازرگانی ببینێت، ئەمەش دەرفەتی بۆ بازرگانی هیند کردەوە تابەدڵنیایی و ئارامیەوەبێنە بازاڕەکانی عێراق، هەروەك دەرفەتی بۆ رۆشنبیری هیندی کردەوە تا لەگەڵ بازرگانیدا بێت. لێکتێگەیشتنی عەبباسیەکان لەگەڵ چیندا بویە هۆی ئەوەی بازارەکانی ڕۆژهەلات دوور لە بەردەم بازرگانیەکی دەوڵەمەندی ئاڵووگۆڕکردندا بکرێنەوە، هەروەك لێکتێگەیشتنی عەبباسیەکان لەگەڵ پاشافرەنجەکاندا دەرفەتی بۆ بازرگانی ئەوان کردەوە تا بەرەو رۆژئاوا و باکووری رۆژئاوای ئەورویا درێژببێتەوە، بەڵام جەخت کردنەوەی ئەوان تەنها لەسەر ڕۆژهەلات بو، لە ئەنجامی گواستنەوەی پایتەخت ودوورکەوتنەوە لەگرنگیدان بە کاروباری ڕۆژئاوا، قەڵەمڕەوی عەبباسی لە رۆژئاوای ئیسلامیدا لاواز بو و بوبە هۆی ئەوەی ئەوناوچە ڕۆژئاواییانە لەدەسەلاتی مەرکەزی جیاببنەوە، بۆیە ئەندەلوس لە سەر دەستی عبدوڕەحمانی داخلی ئومەوی سەرەخۆی وەرگرت و مەغریبی دووریش لە سەر دەستی ئەداریسە عەلەویەکان جیابویەوە و بەنو ڕۆستەمیش، کە خەورایجی ئەبازی بون لەمەغریبی ناوەڕاست سەربەخۆیان وەرگرت، عەبباسیەکان بەدانانی دەوڵەتێکی بەرەبەستی ئەوان و هەواداری خۆیان لە مەغریبی نزیکدا، کە دەوڵەتی ئەغالیبەیە وەستان و هەنگاوی زیاتریان نەنا.

سەردەمی عەبباسی لەگەڵ خۆیدا گەشەسەندنێکی تری هەڵگرتبو، عەبباسیەکان سیاسەتیان لەگەڵ ئایندا کۆکردەوە لەم بوارەدا ئەمان لەو خەلیفە ئومەویانە جیابون، کە گرنگییان بە کاروبارە دنیاییەکان دەدا. عەبباسیەکان ڕایان گەیاند کە دەیانەوێت سوننەتی پێغەمبەرﷺزیندوو بکەنەوەودادپەروەری بەرپاکەن، زانایان و شەرعناسان لەدەوری خۆیاندا کۆکردەوە وعەباکەی پێغەمبەرﷺ یان هەڵدایەوە، ئەمەش وەك مەڵبەندێك بۆ دەسەلاتی ئایینیان، بیرۆکەی مەهدییان قۆرخ کرد تا ئەوەی بو بە دروشمی ئایینی و سیاسیان.

پشتیان بەبیرۆکەی ئیمامەت بەست، کە میحوەری بیروباوەڕو بانگەوازەکەیان بو، ئەوسیاسەتەئاییینیە جۆرە پیرۆزییەکی بەخیلافەتی عەبباسی بەخشی، وای لێهات دەسەڵاتی خەلیفە لەخوای گەورە و بێ هاوتا وەربگیرێت[1] و چەمکی خیلافەت وەك چەمکی مافی خودایی لە فەرمانڕەواییدا وەرگرت، هەمان ئەوشێوەی، کە لە سەردەمی ساسانیەکاندا باو بو[2].

خەلیفە عەبباسیەکان هەندێ نەریتی فارسیان گرتە بەروەك گرتنەدەستی دەسەڵات بۆ خۆ، دوور کەوتنەوە لە خەڵك، دەرکەوتن لە نێوەندی پاسەوان و دەربارداا، لە ئەنجامی ئەمەدا پیشەی پەردەداری سەریهەڵدا، هەروەك ڕێگەیەکی تایبەتی سەلام کردن لە خەلیفەیش هاتە دی وەك: سەرداندانەوەندن، ماچ کردنی زەوی یان جل شۆڕکردنەوە، بەمەش عەبباسیەکان پێچەوانەی ئەو گیانە عەرەبییەبون کە لە ژیانی ئومەوییەکاندا هەبوە.

---

١ـ لەم بارەیەوە بگەڕێرەوە بۆ دەقی ووتارەکەی ئەبوجەعفەری مەنسوور إبن کثیر: ج١٠ ص١٢٢ـ ١٢٣.

٢ـ ئەوەی نووسەر لێرەدا دەیڵێت هەمان وتەی ڕۆژهەلاتناسانە، کە بە پێوەری جیهانی خۆیان سەیری جیهانی ئیسلامیان کردووە، ئەگەرنا ئەم دیدی مافی خوداییە لە دەسەڵاتی عەبباسیدا نەبوە، ئەگەرچی خەلیفەی موسڵمانان بڕیاری یەکەمی بە دەستە، بەڵام سەرچاوەی بڕیارەکانی لە شەریعەتەوەیە و خودی خەلیفەیش بڕیاردەر نیە، دەتوانین بە چەند خاڵێك شتێك لەم جۆرە تێڕوانینە ڕاست بکەینەوە:

(١)ئەگەر سەیری نووسینەکانی سەردەمی عەبباسی بکەین سەبارەت بەچەمکی دەسەڵات و خیلافەت زۆر پێچەوانەی ئەم تێروانینەن.

(٢) چەندین خەلیفە لە دەسەڵات لابراون یان کوژراون، یان دوور خراونەتەوە، دەی کەی ئەمە لەگەڵ ئەم بیردۆزە دەگونجێت.

(٣) چەندین نموونە هەیە کە خەلیفەکان لە بەردەم بڕیاری زانایان دەستەوسان وەستاون و ملیان کەچکردووە.

(٤) بونی وەزیر و ڕاوێژکار و زانایان مافی خودایی خەلیفە ناهیلێت.

(٥) بونی دەسەڵاتە هەرێمایەتیەکانیش دژ بەم دیدەن.

خوێنەر بۆ زانیاری وردتر بگەڕێتەوە بۆ نووسینەکانی ماوردی و إبن تيمة و چەندینیتر یان کتێبی (نظام الخلافة في الفكر الأسلامي) د. مصطفى. (وەرگێر).

ژیـانی خەلیفـەکان و شـێوەی کارکردنیـان و ڕێگـەی فـەرمانڕەواییان لـە ژێـر کاریگـەری شـێوە و ئـسلوبی فارسـیدا بـو، نـەریتی فارسـی بـە سـەر ڕێکخـستنە کارگێڕیەکانـدا زاڵ بـو، پایـەی وەزارەت و وەزیـر لـە ڕووی دیمـەن وتایبەتمەنـدی و ناونانەوە مۆرکێکی نوێی وەرگرت، کە پێشتر نەبو، تێبینی ئـەوە دەکرێـت زۆربـەی وەزیرە عەبباسیەکان لە خێزانە فاسیەکان بون، وەك بەرمەکیـەکان، بـەنی سـەهل، بەنی تاهیر، بـەنی لفورات و بـەنی خاقـان و چـەندینی تـر، وەزیـرو نوسـەروپیاوانی دەوڵەتیش لەکار و پەیوەندیاندا نەریتی کۆنی فارسیان گرتەبەر.

# دابەشکردنی مێژووی دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی

دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی نزیکەی ٥٢٤ ساڵ فەرمانڕەوای کرد (١٣٢ـ٦٥٦ك/٧٥٠ـ١٢٥٨ز) لە ئەبولعەباسی سەففاحەوە دەستی پێکرد و بە مردنی موستەعسەم کۆتای پێهات و لە سەر دەستی مەغۆلەکان ئاوا بو، ئەم ماوەیە لە ڕووی توانای دەوڵەت و خیلافەتەوە لە سەریەك ڕێرەو نەچووە.

مێژوونووسان بۆ دابەشکردنی مێژووی دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی بەپێ تواناکانی خیلافەت و گەشەسەندنی بارە سیاسیەکانی و ژیانی ڕۆشنبیری و هزری ئەو دەوڵەتە بۆ چوار سەردەم دابەشی دەکەن، کە بریتین لە:

**سەردەمی یەکەم:**

سەردەمی هێز و فراوانخوازی و گەشەسەندن (١٣٢ـ٢٣٢ك/٧٥٠ـ٨٤٧ز).

**سەردەمی دووەم:**

سەردمەی قەڵەمڕەوی تورکی (٢٣٢ـ٣٣٤ك/٨٤٧ـ٩٤٦ز).

**سەردەمی سێیەم:**

سەردەمی قەڵەمڕەوی بوەیهی فارسی (٣٣٤ـ٤٤٧ك/٩٤٦ـ١٠٥٥ز).

**سەردەمی چوارەم:**

سەردەمی قەڵەمڕەوی سەلجووقی تورکی (٤٤٧ـ٦٥٦ك/١٠٥٥ـ١٢٥٨ز).

# سەردەمی عەبباسی یەکەم (١٣٢ــ٢٣٢ك/٧٥٠ــ٨٤٧ز)

ئەم سەردەمە بەخیلافەتی ئەبولعەبباسی سەفاح دەست پێ دەکات، بە خیلافەتی واثق کۆتایی پێدێت وتایبەتمەندی بەهێزی خیلافەت وسەربەخۆیی تەواوی خیلافەتی هەیە، جەخت کردنەوە لەدەسەڵاتە باڵاکانی دەوڵەت لەدەستی ئەو خەلیفانەدا بو، کە خاوەنی توانای شەخسی وسیاسی و کارگێری باڵا بون، توانییان لەو ڕوانگەوە یەکبونی دەوڵەت بپارێزن ئاژاوەو شۆرشەکانی ڕووبەڕووی دەوڵەت دابمرکێنەوە، فارس لەو سەردەمدا پایەکی چاك وباڵای لەدەوڵەتداهەبو. قەڵەمڕەوی فروانیشیان کاریگەریەکی گەورەی لەئاراستەکردنی سیاسەی دەوڵەتەکەدا هەبو، تا ئەوەی لەکۆتاییدا دەستیان بەسەر دوو دەزگای کارگێری و سەربازی لە بەغداد و هەرێمەکانی ژێر قەڵەمڕەوی دەوڵەتەکەدا گرت و بەتوندی دەستیان بەسەر سەرکردایەتی سوپا و پایە کارگێریە گەورەکانی وەك وەزارەت و نووسین و میراتی شار و وڵاتەکاندا گرت[1].

ئەندامانی سوپا یاریدەری خیلافەت وئامرازێکی تەواو گوێڕایەڵی دەستی خەلیفەکان بون، ئەم ماوەیش بەکۆتایی هاتنی سەردەمی ئەو خەلیفانەی خۆیان سەرکردایەتی سوپایان دەکردو دەچوونەگێژاوی مەرگ وسەرقاڵی ڕابواردن و پاڵدانەوە نەبون کۆتایی پێهات.

ئەم سەردەمە ڕازاوەو پڕشنگدارە هەریەك لەم خەلیفانە لەخۆ دەگرێت: ئەبولعەبباس، مەنسوور، مەهدی، هادی، ڕەشید، ئەمین، مەئموون، موعتەسەم، واثق.

---

١ــ الزهراني، محمد بن مسفر: نفوذ السلاجقة الساسي في الدولة العباسية، ص(١٤).

# سەردەمی عەبباسی دووەم ( ٢٣٢ـــ٣٣٤ك/٨٤٧ـــ٩٤٦ز )

ئەم سەردەمە بەخیلافەتی متەوەکل دەست پێدەکات، لەسەردەمی موستەکفیدا کۆتایی پێ دێت، تایبەتمەندی خیلافەت بەرەبەرە نەمانی شان وشکۆی هەیە، تائەوەی میرەکانی ناوچەکان کەوتنەخشەدانان بۆ جیابونەوە لەخیلافەت. لەو سەردەمەدا تورکەکان خۆیان چەسپاند ودەستیان بەسەر دەزگاکانی دەوڵەتدا گرت، لە سەردەمی متەوکلدا بەزیادبونی قەڵەمڕەویان بەرەبەرە هەڵوەشانەوە دزەی دەکرد ناویان، ئەم هەڵگەڕانەوە لە فەرمانڕەوایی عەربیەوە بۆ فەرمانڕەوایی تورکی دیمەنێکی ئەو شۆڕشەبو، کە زۆربەی بەشەکانی خیلافەت هەستیان پێکرد، بوبەهۆی لاواز بونی دەسەڵاتی خەلیەفە و لە کۆتاییدا لێك هەڵوەشانی ئەو دەسەڵاتەی[1].

لەو سەردەمدا بەهۆی ئەوەی مەترسی ئەو دەوڵەتە سەربەخۆیانەی، کە لەجەستەی خیلافەت جیابونە زیادی کرد، لاوازی خیلافەت زیادی کرد، لە ناو فارسدا شان و شکۆی عەلی کوڕی بوەیە بەهێز بو و(ڕەی)وئەسفەهان و ناوچەی شاخ کەوتە دەست حەسەنی کوڕی بوەیهی برای، حەمدانیەکانیش لە موسڵ و دیاربەکر و دیار ڕەبیعە وموزر سەربەخۆییان وەرگرت، موحەممەدی کوڕی توغجی ئەخشیش لە میسر و شام سەربەخۆی وەرگرت و نەسری کوڕی ئەحمەدی سامانیش دەستی بەسەر خوراساندا گرت.

لە ئەنجامی ئەمەدا ناوچەو خاکی دەوڵەتی خیلافەت کەمیکرد وتەنها عێراق و چەند ناوچەیەکی فارس وئەهواز لە دەستی خەلیفەکاندامایەوە، بەڵام ئەوهەرێمانەی باسکران پڕ پێکدادان وئاژاوە بون، بارەکە گەیشتە ئەوەی مەملووکیەکی تورکی، یان دەیلەمی، کە نازناوی(میری میران)ی لێندەنرا دەسەڵاتی بەغدادی دەگرتە دەست، قەڵەمڕەوی تەواو و دەسەڵاتی ڕەها و والیەتی گشتی لە دەستدا بو، خەلیفە هیچی بۆ نەدەمایەوە[2].

---

1 —Lane— poole,s: History of Egypt in the middle ages: p29

٢ـالخضري: الشيخ محمد: الدولة العباسية ص٤٨٤.

بــەڵام خیلافــەت لــە مــاوەی نێــوان ســاڵانی (٢٥٦ـــ٢٩٥ك)دا تاڕاسـتێکی زۆر دەسـەڵاتی خـۆی گێڕایـەوە، ئـەم مـاوەیش سـەردەمی ئـەم خەلیفانـە دەگرێتـەوە (موعتەمەد، موعتەزد، موکتەفی). ناوی (ڕابونی خیلافەت) لەو ماوەیە نرا[1].

ئـەو سـەردەمە هەریـەك لـەم خەلیفانـەی لـەخۆ گـرت: موتـەوەکیل، مونتەسـەر، موستەعین، موعتەز، موهتەدی، موعتەمەد، موعتەزەد، موکتەفی، موقتەدیر، تـاهیر، ڕازی، موتتەقی، موستەکفی، کە لە سەردەمی ئەمدا بوەیهیەکان دەسـەلاتیان گرتـە دەست.

١ـ الزهراني: ص١٤.

## سەردەمی عەبباسی سێیەم (٣٣٤ـ٤٤٧ك/٩٤٦ـ١٠٥٥ز)

ئەم سەردەمە لە کاتی خیلافەتی موستەکفیدا دەستی پێکرد، لە کاتی خیلافەتی قائیمدا کۆتایی پێ هات، تایبەتمەندی ئەوەی هەبو کە پەیوەندی بە مێژووی ئەو بوەیهیانەوە هەبو، کە خاوەنی قەڵەمڕەوی حەقیقی و دەسەڵاتی کرداری ناو عێراق بون و خەلیفە تەنها ناوی هەبو، وەك کارمەندێکی بوەیهیەکان وا بو، چی بکردایە دەبو لە بوەیهیەکانەوە فرمانی وەربگرتایە و مافی ئەوەی نەبو لە هیچ کاروبارێکی خیلافەتدا بەبێ گەڕانەوە بۆ لای بوەیهیەکان وەرگرتنی ڕەزامەندییان هیچ بڕیارو هەڵوێستێك بنوێنێت.

خەلیفە لەو سەردەمەدا قەڵەمڕەوی خۆی لە دەستداو فرمانی پێدەکرا ئەویش جێبەجێ دەکردو داوای چی لێبکرایە ئەوەی دەکرد، لەبەر جیاوازی مەزهەبی لەگەڵ بوەیهیەکان خەلیفە هیچ دەسەڵاتێکی ئایینی بەسەریانەوە نەبو، چونکە ئەوان شیعەی زۆر توند بون تەنها لەبەر خزمەتکردن بە ئامانجەکانی خۆیان بە مانەوەی پایەی خیلافەت ڕازیبون.

بیرونی وەسفی باری عەبباسیەکان لە ڕۆژانی بوەیهیەکاندا بەم جۆرە دەکات: (دەوڵەت ودەسەڵات لەکۆتا ڕۆژەکانی موتتەقی ڕۆژانی سەرەتای موستەکفی لە دەست عەبباسیەکانەوە گوازرایەوە بۆ بوەیهیەکان، تاکە شتێك لە دەست دەوڵەتی عەبباسیدا مابویەوە بوارێکی بیروباوەڕی ئایینی بو، هیچ دەسەڵاتێکی دنیاییان نەبو)[١]. هەریەك لەم خەلیفانە لەو سەردەمدا بون: موستەکفی، موتیع، تائیع، قادر و قائیم.

---

١ـ البيروني: أبو الريحان: الآثار الباقية عن القرون الخالية ص١٣٢.

## سەردەمی چوارەمی عەبباسی ( ٤٤٧ـــ٦٥٦ك/١٠٥٥ـــ١٢٥٨ز)

ئەم سەردەمە لە کاتی خیلافەتی قائیمدا دەستی پێکرد و بەمردنی موستەعسەم کۆتایی پێهات، تایبەتمەندی ئەوەی هەبو، کە دەسەڵاتی کرداری گوازرایەوە بۆ دەست ئەو سەلجوقیە تورکانەی، کە لە وڵاتەی شاخدا نیشتەجێ بون، باری خیلافەت لەگەڵ ئەو سەلجوقیانەدا لە باری خیلافەت لەگەڵ بوەیهیەکاندا زۆر باشتر بو، چونکە ئەوان بەو پێیەی لە سەر مزهەبی سوننە بون ڕێزی خەلیەفەکانیان دەگرت ودیمەنی بەگەورە دانان و شکۆدارییان بۆ خەلیفەکان دادەنا، ئەمەش پایەی ئایینی خەلیفەکانی دەگێڕایەوە.

خەلیفەکان لەم سەردەمەدا لەسەریەك ڕێڕەوی تواناوهەڵسوکەوت کردن نەبون، چونکەهەرلەسەردەمی مو ستەرشیدەوە خەلیفەکان کەوتنە گێرانەوەی هەندێ لە قەڵەمڕەوی کرداری خۆیان و فەرمانڕەوایی بەغداد و ناوچەیەکانی سەر بە بەغدادیان لە سەردەمی موقتەفیەوە بە سەربەخۆی لە دەستدا بو، لە سەردەمی ناسریشدا قەڵەمڕەوی خۆیانیان گێڕایەوە و بەسەربەخۆی فەرمانڕەوای عێراقیان گرتە دەست وماوەی شەست و شەش ساڵ ملکەچی هیچ دەسەڵاتێك نەبون تائەوەی مەغۆلەکان بەبزاوتی فراوانیانەوە بەرەو ڕۆژئاوا هاتن و چی ناوچە هەبوایە دەیانگرت و شارەکانیان وێران دەکردن تائەوەی گەیشتنە بەغداد و گرتیان و خیلافەتی عەبباسییان ڕووخاند.

ئەوسەردەمە هەریەك لەم خەلیفانەی لەخۆگرت: قائیم، موقتەدی، موستەزهیر، موستەرشید، ڕاشید، موقتەفی، موستەنجید، موستەزی، ناسر، زاهیر، موستەنسیر و موستەعسەم.

لایەنی جیاوازی نێوان سەردەمی یەکەم و سەردەمەکانی تری ژیانی دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی دەرکەوتنی ڕەگەزێکی نوێ بو، کە ئەویش ڕەگەزی تورکیە، گواستنەوەی خیلافەت لە مەرکەزیەتەوە بۆ لامەرکەزی لەنیزامی فەرمانڕەواییدا، لە ئەنجامی دروست بونی چەند دەولەتێکی جیا، یان بەتەواوەتی جیابون، یان لەگەڵ

دانانن بەدەسەڵاتی خەلیفەدا خۆیشیان سەربەخۆ بون.

پاش ئەوەی قەڵەمڕەوی تورك خۆی سەپاند، فارسەكان چالاكی خۆیان بۆ ڕۆژهەلات گواستەوە وتوانیان لەهەندێ هەرێمی دەوڵەتی عەبباسیدا چەند دەوڵەتێكی جیادابمەزرێنن، دەوڵەتی تاهیری لە خوراسان (٢٠٥ــ٢٥٩ك/٨٢٠ــ٨٧٣ن) دامەزرا، یەعقووبی كوڕی لەیثي سەففار لە شوێنی دەوڵەتی تاهیریدا دەوڵەتی سەفاری دەمەزراند (٢٦١ــ٣٨٩ك/٨٧٤ــ٩٩٩ن)، لە كۆتاییەكانی سەدەی چوارەمی كۆچی واتە: (دە)ی زایینیدا ڕووخان و غەزنەویەكان شوێنیان گرتنەوە و دەوڵەتی غەزنەویان دامەزراند (٣٥١ــ٥٨٢ك/٩٦٢ــ١١٣٦ن) بوەیهیەكانیش دەستیان بەسەر فارس وعێراق وئەهواز وكرماندا گرت دەوڵەتی بوەیهییان دامەزراند (٣٣٤ـ٤٤٧ك/٩٤٦ـ١٠٥٥ن) توركە سەلجووقیەكانیش دەوڵەتی بوەیهییان لە عێراق لەناوبردو توغرولبەگی سەلجوقی چوویە ناوشاری بەغدادو دەسەڵاتی ئەوێی بە سەربەخۆی وەرگرت و دەسەڵاتی خۆی لە شوێنی دەسەڵاتی بوەیهیەكاندا دامەزراند.

# بەشی دووەم

## ئەبولعەبباسی سەففاح ــ ئەبوجەعفەری مەنسوور

### ئەبولعەبباس عەبدوڵڵای سەففاح (١٣٢ــ١٣٦ك/٧٥٠ــ٧٥٤ز)

*** ناساندنی ئبو لعەبباس:**

ناوی عەبدوڵڵای کوڕی موحەممەدی کوڕی عەلی عەبباسیەو کونیەی ئەبولعەبباسی هەیە[1]. لە ساڵی (١٠٥ك/٧٢٣ز) لەحومەیمە لەخاکی(الشراة) لەبەلقاء لەشام لەدایکبوە، لەوێش گەورە بوە[2]. لەڕۆژی هەینی دوانزەی مانگی ڕبیعولئاخیری ساڵی(١٣٢ك/ مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ٧٤٩ز) بەیعەتی خیلافەتی پێدراوە[3].

تێبینی لێکچوونێکی نێوان هەردوو ناوی ئەبولعەبباسی سەففاح وئەبوجەعفەری مەنسوور(عەبدوڵڵای کوڕی موحەممەدی کوڕی عەلی عەبباسی) دەکرێت، ئەمە پاڵی بەزانایانەوە ناوەتا نازناوی عەبدوڵڵای بچووك لە خەلیفە سەففاح بنێن،[4] چونکە سەففاح تەمەنی لە مەنسووری برای بچووکتر بو.

وەك نەریتی خەلیفەکان ئەبولعەبباس لەکاتی هەڵبژاردنیدا لەمزگەوتی کوفە وتارێکی پێشکەش کردو تیایدا ئامانجی ئەوشتەی، کە شۆڕشی عەبباسی لە پێناویدا بەرپابو و ڕوونکردەوە و سەرزەنشتی ئومەویەکانی کرد، بە داگیرکەری خیلافەتی ناو بردن، بەڵێنیشی بەکوفیەکاندا کە پاڵپیشتی شۆڕشەکە بون تابەخششیان زیاد بکات، لەگەڵ ئەوەیشدا پێی وتن: (من سەففاحی ڕەواکەر و

---

١ــالیعقوبي: ج٢ ص٢٨٢.

٢ــالبغدادي: الخطیب: تأریخ بغداد ج١٠ ص٤٦ــ ٤٧، إبن کثیر: ج١٠ ص٥٢.

٣ــ بگەڕێرەوە بۆ لاپەڕە (٢٥).

٤ــ العبادي:ص٤١.

تۆلە سێنی لە ناو بەرم)[1].

خەلیفە ئەبولعەبباس لە کوفە نیشتەجێ بو، لەبەر ئەوەی باری تایبەتی کووفەی دەزانی، چونکە زۆربەیان پاڵپشتی شۆرشی عەبباسی نەبون و شیعە ولایەنگرانی عەلی بون، بۆیە ئەبولعەبباس لەکوفەوە گواستیەوە بۆ شوێنێکی نزیك لەوێ، کە بە (هاشمیة الکوفة) ناسرا بو، بەڵام لەوێش زۆر نەمایەوە و گواستیەوە بۆ ئەنبار لە باکووری کووفە و لە سەر ڕووباری فورات و لە ساڵی (١٣٤ك/٧٥١ن)دا و لە پاڵیدا شارێکی بۆ خۆی دروست کرد بە(هاشمیة الأنبار) ناسرا، سەففاح تامردنی لە ساڵی (١٣٦ك/٧٥٤ن)لەوێ مایەوە،[2] ئەبولعەبباس زۆربەی سەردەکەی خۆی لەچەسەپاندنی فەرمانڕەوایەکەیدا بردە سەر و لەگەڵ ئەو عەرەبانەدا جەنگا، کە پاڵپشتی ئومەویەکان بون، پاشان خۆی لە هەندێ لەو سەرکردانە ڕزگار کرد کە لە گەیشتن بە دەسەلات یارمەتی و پاڵپشتی بون، ئەمە لە دوای ئەوەی نیشانەی جیابونەوەی لێ بەدی کردن وەك ئەبوسەلەمەی خەللال.

ئەبولعەبباس کەسێکی نەرم ونیان وژیر وتەواو بەشەرم وحەیابو، ڕفتاری جوان بو، لەهەمووان دەست کراوەتربو، هەر بەڵێنێکی دابێت لەکاتی خۆی دوای نەخستووە ولە کۆرەکەیدا هەڵنەساوە تا بەجێی گەیاندووە، لە سەرمۆرەکەی ئەمەی نەخشاند بو (خوا جێ متمانەی عەبدوڵلا و عەبدوڵلا بڕوای بەوەیە هەیە). لە

---

١ـ بگەڕێرەوە بۆ دەقی وتارەکە لە (الطبري ج٧ ص٤٢٥ــ ٤٢٦). ڕای ڕاسترە ئەویە، کە مەبەستی بە سەففاح بەڕێزی و بەخشندەیی بێت بەو بەڵگەیەی ووشەکەی لە بازنەی وەسفکردن و پیاهەڵدانی خەڵکی کووفە و زیاد کردنی بەخششیاندا بەکارهێناوە، ئەمەش لەگەڵ واتای بەخشندەییدا دەگونجێ ئەو لەگەڵ دۆستەکانیدا بەخشندەو بەڕێزو لەگەڵ دوژمنەکانیشیدا لەناو بەرو تۆڵەسێن بو. شایەنی باسە واتای زمانەوانی وشەی سەففاح چەند واتایەك لەخۆ دەگرێت، لەوانە: خوێن ڕێژ، بەڕێز و بەخشندەیەك، کە دینار و پارە دەبەخشێت، هەروەها ە واتای زمانپاراودێت. بگەڕێرەوە بۆ إبن منظور: لسان العرب ج٢ ص ٤٨٥ــ ٤٨٦، سەبارەت بەو بابەتە بگەڕێرەوە بۆ: العبادي، عبدالحمید: صور و بحوث من التأریخ الإسلامي ج٢ من ٧٠.

٢ـالطبري: هەمان سەرچاوە، ص٤٦٤، الدینوری ص٢٦٣.

یەکێ لە قسەکانیدا دەڵێت: (کەسە سووک و ڕیسواکان ئەوانەن کە بەخیلی بە ئازایی و نەرم و نیانی بەسەر شۆڕی دەزانن).

هەروەها دەڵێت: (ئەگەر نەرم و نیانی خراپە و گەندەڵی بێت، ئەوا لێبوردن دەستەوسان وەستانە، خۆراگری شتێکی باشە تەنها لەڕووی ئەوەدا نەبێت، کە لە ڕووی ئایین ودەسەڵاتدا بوەستێ وترس وبیم بنێتەوە، لە سەر خۆییش شتێکی سوپاس کراوە تەنها لە کاتی دەرەفەت هەڵکەوتندا نەبێت).

ئەبولعەبباس حەزی دەکرد لەگەڵ پیاواندا بێت ولەگەڵ زانایاندا دابنیشێت، هانی ئەدەب و گۆرانی داوە وپاداشتی شاعیران وگۆرانیبێژانی بە چاکە دەدایەوە، لە پشت پەردە تەپڵی بۆ لێدەدراو گۆرانی بۆ دەواترا[1].

## بارودۆخی ناوخۆیی لە سەردەمی ئەبولعەبباسدا

ئەبولعەبباس کاتێ بەیعەتی خیلافەتی پێدرا، تەنها سەربازەکانی خۆی هەبو، سوپاکانیشی ئامادەی هێرشی کۆتای بون بۆسەر ئومەویەکان و هەموو کاروبارەکان بەدەست سەرکردەو بانگخوازەکان بون، ئەرکەکەی ئەویش قورس وسەخت بو، دەبو جێ پێی عەبباسیەکان لە فەرمانڕەواییدا بچەسپێنێ و پایەکانیان دابکوتێ. ئەو پێی باش بو پەنا بۆ براو مام و برازاکانی ببات وپشتیان پێببەستێت، لەوکارەیدا بەشدارییان پێ بکات، تا لەلایەکەوە سەرکردەو بانگخوازەکان بەتەنها کارەکە نەگرنەدەست ولەلایەکی تریشەوە ویستی بەرەبەرە دەسەڵات بگوازێتەوە بۆ دەست ئەندامانی بنەماڵەی عەبباسی.

بۆیە سولەیمانی کوڕی عەلی مامی خۆی کرد بە والی بەسرە ودەوروبەری، ئیسماعیلی کوڕی عەلی مامیشی لە سەر ئەهوازو داوودی کوڕی عەلی مامیشی لە سەرحیجاز ویەمەن دانا لە دوای ئەوەی لە سەر کووفە لایبرد، عەبدوڵلای کوڕی عەلی مامیشی کرد بە پرسی جەنگی دژ بە مەڕوانی دووەم، ئەبوجەعفەری مەنسووری برایشی بۆ جەنگی یەزیدی کوڕی هوبەیرە دانا[2].

---

١ـ الطقطقا: ص١٣٤، السيوطي: تأريخ الخلفاء، ص٢٥٨.

٢ـ الطبري: ج٧ ص٤٣٢، ٤٥٠، ٤٥٨، ٤٥٩.

لە لایەن هەندێ لەو سەرکردانەی شۆڕشەکەیان لەسەر شان بەرپا بو تووشی بێ هیوای بون، لەوەترسان کەسانی ترجگە لە خۆیان بەرهەمی هەوڵەکانیان بچننەوە، ئەمە خەلیفەی هاندا تادڵنیاو ڕازییان بکات بەوەی بەشداری پێکردنی خزم و کەسی خۆی تەنها بۆ ڕێز لێنانە، نامەی بۆ حەسەنی کوڕی قوحتوبە نووسی، کە ئەبوجەعفەری برای لەگەڵیدا کاری دەکرد (سەربازگەکە هی تۆیە سەرکردەکانیش هی تۆن، بەڵام حەزم کرد براکەم لەوێ بێت و کارەکە بگرێتە دەست)[1] ئەبولعەبباس دوای ئەوەی کەوتە پاکتاوکردنی ئومەویەکان، لە دوای ئەوەی هێزەکانی بەسەرکردایەتی عەبدوڵڵای کوڕی مامی لەسەر زێ هێزەکانی مەڕوانیان شکاند وتامیسر کەوتنە شوێنی و لەوێ کوشتیان، ئاژاوەو پێکدادانە ناوخۆییەکان لەدژی دەسەڵاتەکەی لەناوچە عەرەبیەکانی وەك فەلەستین وشام وجەزیرەدا، کەمەڵبەندی قەڵەمڕەوی ئومەوی بو هەڵگیرسان، پاشان هەستی بەوە کرد ئەو قەڵەمڕەوە هێشتا ماوەیەتی و چوو بۆ خوراسان،[2] پاشان سەرکردەکانی مەڕوانی دووەم ترسیان لە عەبباسیەکان هەبو، کەتوندیەکی زۆریان لەڕووی دوژمنەکانیاندا بوترسان ئەوانیش والێبکەن، هەندێکیشان دەیانویست دەوڵەتی خیلافەتی ئومەوی زیندوو بکەنەوە[3].

لەم بزووتنەوانەدا باسی دەرچوونی هەریەك لە حەبیبی موڕڕەی موڕری، کە لە هەرێمی (بثنية) لە فەلەستین وبەلقان و حوران دەرچوو، دەرچوونی ئەبولوەرد لە قنسرین وبزووتنەوەکەی ئوسامەی کوڕی موسلیم لە جەزیرە دەکەین[4]. تێبینی ئەوە دەکرێت سەرکردەکانی ئەو بزووتنەوانە ئاڵای سپیان بەرز کردەوە خۆیان بە سپی ڕەنگەکان ناودەبرد، ئەمەش وەك بەڵگەی هەڵگەڕانەوەیان لە فەرمانڕەوای عەبباسی کەڕەشی کرد بو بە دروشمی خۆی وخۆی بەڕەش ڕەنگ ناوزەد دەکرد.

عەبدوڵڵای کوڕی عەلی چەند مانگێکی لە چالاکی سەربازی بەردەوامدا بە سەر

---

١ـ الدينوري: ص ٢٦٠.

٢ـ العبادي: ص٤٤.

٣ـ الطبري: ج٧ ص٤٤٦.

٤ـ هەمان سەرچاوە: ص٤٤٣ـ ٤٤٧.

برد لە پێش ئەوەی بە تەواوی ئەو بزووتنەوانە لە ناو ببات و شارەکانی (ڕقە و حەڕران و ڕەها وماردین ودیمەشق وبەیتولمەقدیس) ملکەچ بکات.

ئەبولعەبباس لایکردەوە بەلای چارەسەری کێشەی هەڵگەڕانەوەی یەزیدی کوڕی هوبەیرە، کە لەواست سەنگەری گرتبو، ئەبو سەلەمەیش بەسەرکردایەتی حەسەنی کوڕی قوحتوبە سوپایەکی ناردو لەوێ گەمارۆیدا، چەند وردە جەنگێک لە نێوان هەردوولا ڕوویدا ئەنجامێکی نەبو، ئەمە پاڵی بە ئەبولعەباسەوەنا تا ئەبوجەعفەری برای خۆی بنێرێت، بۆئەوەی سەرکردایەتی گەمارۆدانی واسیت بکات، کاتێ ئیبن هوبەیرە هەواڵی کوژرانی مەڕوانی دووەمی بیست، داوای ڕێکەوتنی کرد، چەند دانوستانێك لەنێوان هەردوولادا بەڕێوەچوو و لە ئەنجامدا ئیبن هوبەیرەو پشتیوانەکانی پەنادران، ئەبوجەعفەر نامەی پەنادانەکەی بۆ خەلیفە ناردو ئەویش لەمەدا ڕاوێژی بە ئەبوموسلیم کرد، لە سەرئامۆژگاری ئەبوموسلیم ئەبولعەبباس فرمانی بە ئەبوجەعفەری برای کرد تا ئیبن هوبەیرە و کۆمەڵێ لە هاوەڵەکانی بکوژێت[١]. بەکوژرانی ئیبن هوبەیرە پاکتاوی ئومەوییەکان کرا.

ئەبولعەبباس کەوتە پاکتاوی ڕکەبەری سیاسی، کە دەیوست بچێتە سەر دەسەلات بەلام حکومڕانی نەکات کە ئەویش ئەبوسەلەمەی خەللای وەزیری بنەماڵەی موحەممەد بو، ئەبولعەبباس بەوە تۆمەتباری کرد کە دەیەوێت خیلافەت لە عەبباسیەکانەوە بۆ بنەماڵەی عەلی کوڕی ئەبوتالیب بگوازێتەوە کاتێ بەیعەتی خیلافەتی پێدا خەریك بو لێی بدات، بەلام بار و دۆخی دەوڵەتە سەرەتاییەکەی دەرفەتی ئەوەی پێنە دەدا، بۆیە لەو پایە و نازناوەیدا هێشتیەوە.

سەففاح دەرفەتی بۆلوا تالەدەست وەزیرەکەی ڕزگار ببێت لە دوای ئەوەی بزووتنەوە بەرهەڵستکارەکانی دەسەلاتەکەی لە ناوبرد وجێپێی لە دەسەلاتدا چەسپا، بەلام داوودی کوڕی عەلی ئامۆژگاری کرد تانامە بۆ ئەبوموسلیم بنوسێ و

---

١ـ هەمان سەرچاوە: ص٤٥٠ـ٤٥٧.

باسی باری ئەبوسەلەمەی بۆ بکات، تا ئەویش نەترسێت، ئەبوموسلیمیش مەڕاری کوڕی ئەنەسی ضەبِّي نارد تابیکوژێت، ئەویش لەگەڵ ئوسەیدی کوڕی عەبدوڵڵادا بۆسەی بۆنایەوە وپێکەوە لە(مانگی ڕەجەبی ساڵی ١٣٢ک/مانگی شوباتی ساڵی ٧٥٠ز)دا کوشتیان[1].

---

١ـالجهشياري، محمد بن عبدوس: الوزراء و الكتاب، ص٩٠.

# بار و دۆخی دەرەکی لە سەردەمی ئەبولعەبباسدا

*** بەرەی ڕۆژهەلاَت:**

لەو کاتەی ئەو ڕووداوانەی لە عێراق و شام و جزیرەدا ڕوویاندەدا، ئەبوسلیمی خوراسانی سەرکردەی یەکەمی شۆرشی عەبباسی، وەك کار بەدەستی خەلیفە لە خوراسان و ناوچەی شاخدا دەسەلاَتی گرتبویە دەست و جێ پێی عەبباسی، وەك کار بەدەستی خەلیفە لە خوراسان و ناوچانەدا جێگیر دەکرد وشۆرشی نەیارانی حکوومەتی مەرکەزی لە ناو دەبرد[1].

لە هەمان کاتدا ولاَتی ئەودیو ڕووبار دووچاری مەترسیەکی گەورەی چینیەکان بویەوە، ئەوان نالەباری باری موسڵمانان و ئەو بۆشاییەیان بەهەند وەرگرت، کە بەهۆی کەوتنی دەوڵەتی ڕۆژئاوای تورکیەوە ڕوویدا بو، تا دەسەلاَتیان بە سەر ولاَتی ئەو دیو ڕووباردا بلاَوبکەنەوە، کە فەرمانڕەواکانی پێشووی هەر لە سەردەمانی کۆنەوە لە سەر ئەوە ڕاهاتبون چەند باڵوێزێك بۆ چین بنێرن، تا هۆگری خۆیان بۆ ئیمپراتۆری چینی بخەنە ڕوو، ئەوانیش دەستی یارمەتییان بۆ فەرمانرەوای ناوچەکانی نەیاری حوکمی ئیسلامی درێژ دەرکرد.

لە ڕاستیدا ململانی نێوان دوو لایەنی ئیسلامی و چینی،چەند پاڵنەرێکی ژیاری و بازرگانی دەیان جوولاَند، ئەو پرسیارەی ئەو کات دەخرایە ڕوو ئەوەیە: کامیان دواتر دەستی بەسەر ئەو ناوچانەدا دەگرت، ژیاری ئسلامی؟ یان ژیاری چینی؟[2] لە بواری بازرگانیەوە موسڵمانان دەسەلاَتی خۆیان بە سەر ناوچە بازرگانیە جیهانیەکان لەگەڵ ڕۆژهەلاَت وهیند و چیندا گرت بو و ڕۆڵی چینی لە بازرگانی جیهانیدا سنووردارو وەستاو بو.

جا لە ساڵی (١٣٢ك٧٥٠ز)دا سوپای چینی دەستی بەسەر شاری (سویاب)دا گرت و وێرانی کرد، لە ساڵی داهاتوودا چینیەکان ناکۆکی نێوان ئەخشید فرغانە و

---

١ـإبن أثير: ج٤ ص٣٤١، بارتولد: سەرچاوەی پێشوو ص٣١٤ـ ٣١٥.

٢ـ بارتولد: ص٣١٦.

پاشایی (شاش) و پانەبردنی ئەخشید بۆ لای چینیەکانیان بەهەند وەرگرت و کەوتنە بڵاوکردنەوەی دەسەڵاتیان بەسەر ناوچەکەداو لەبەردەم فرغانەدا خۆیان نواند و هێرشیان بردە سەر شاری (شاش) و گەمارۆی پاشاکەیان داو ئەویش چوویە ژێر دەسەڵاتیان[١].

سەرکردەی موسڵمان زیادی کوڕی صالح، کە دەستی بەتاڵ بو لەکوژاندنەوەی شۆڕشەکەی شەریکی کوڕی شێخی مهری لەبوخارە، توانی لەسەر ڕووباری تراز لە(مانگی ذیلحەججەی ساڵی١٣٣ك/ مانگی ئابی ساڵی٧٥١ن)دا شکست بە سوپای چینی بهێنێت[٢].

ئەمەو لەگەڵ تەوفیق ئەبوداود خالیدی کوڕی ئیبراهیمدا، کە ئەبوموسلیم وەك فەرمانڕەوای (بەلخ)دایناب‌و، هاوپەیمانی بەست، ئەمەش لەو چالاکیە سەربازیانەیدا کە لە ناوچەکانی(ختل) و (کش) جێبەجێ کردن، فەرمانڕەوای(ختل)ڕای کرد بۆ چین و دیمقانی کش کوژراوبراکەی شوێنی دەسەڵاتەکەی گرتەوە[٣].

پاشان وا ڕوویدا چین بەرەو ڕووی چەند گرفتێکی ناوخۆیی بویەوە وبەهۆی ململانێ لەسەر دەسەڵات جەنگی ناوخو تیایدا هەڵگیرسا، ئەمە وای کرد چینیەکان دەست بەرداری وڵاتی ئەودیو ڕووبار بن، جەنگی تراز بە کۆتایی دەست تێوەردانی چینی لەو ناوچەیە دادەنرێت کەماوەیەکی دوور ودرێژ لە ژێر سایەی فەرمانڕەوایی عەبباسیدا لەخۆش گوزەرانیدا بون.

*** بەرەی بیزەنتی:**

دەوڵەتی بیزەنتی سوودی لەناکۆکی و پێکدادانا نەبینی، کە لە ئەنجامی گواستنەوەی خیلافەت لەئومەویەکانەوە بۆ عەبباسیەکان و گواستنەوەی پایتەخت لەدیمەشقەوە دەوڵەتی ئیسلامی گرت بویەوە، بۆیە هێرشیکردە سەرناوچەکانی باکووری دەوڵەتی ئیسلامی وئیمپراتۆر قوستەنتینی پێنجەم توانی سنووری و

---

١ـإبن أثير: ج٤ ص٣٤٢.

٢ـ هەمان سەرچاوە.

٣ـ هەمان سەرچاوە، ص٣٤٣.

وڵاتەکەی فراوان بکات وبەرە و ڕۆژهەڵات دوور بکەوێتەوە، ئەمە کاتێ شاڵاوی بردەسەر ناوچە سەرسنووریەکانی شام وجەزیرە ودەست بەسەر شارو قەڵاکانیدا گرت[١].

ئمپراتۆر لە ساڵی (١٣٣ک/٧٥١ن)دا سەرکردایەتی هەڵمەتێکی بۆ ناوچەی سنووری لەگەڵ ئەرمینیا کرد ودەستی گرت بەسەر قەڵای(ثیودوسیبولیس) (ئەرزرۆم)داو سوپای عەبباسی، کەموخەلەدی کوڕی موقاتلی کوڕی حەکیم سەرکردایەتی ئەکرد نەیتوانی لە ڕوویدا بوەستێت[٢].

ئیمپراتۆر درێژەی بەکشانی بۆ ناوچەکەدا، پاش بەرگرییەك دەستی گرت بەسەر قەڵای (کماخ) لەسەر ڕووباری فورات، هێرشیشی بردەسەر سەرسنوورەکانی جەزیرەو سەنگەرگیریەکانی فوراتی وێرانکردوە دەستیگرت بەسەر(حەدەث) و (مەلتیە) و (قلوذیة)داو قەڵای سومەیساتی وێرانکرد[٣].

قوستەنتینی پێنجەم لەو کشانەی بۆ ئەو ناوچەیە ئامانجی وێرانکردنی مەڵبەندی فریاگوزریەکان و بنکەکانی هێرش بردنی ئیسلامی بو، تاسنوور بۆکشانی موسڵمانان بۆ ناو سنووری بیزەنتیابنێت بەو پێیەی دەیزانی کاتێ بیزەنتیەکان لەوێ سەقامگیربن لە بەر دووری لە پایتەخت ناتوانن بەرگری لێبکەن بۆ فرمانی کرد،تا وێران وکاولی بکەین بەمەیش هەڕشەی لەنیزامی سەرسنووری ئیسلامی کرد.

لە ڕاستیدا بیزەنتە لەوە دڵنیا بو، کە چالاکی ئیسلامی لەگەڵ چرو پڕییەکەیدا کاریگەری بۆ سەر ئاسایشی نابێت وەك ئەوەی لەدەوڵەتی خیلافەتی ئومەویدا بو، لەگەڵ ئەوەیشدا نیزامێکی بەرگریکاری جێگیری دانا وناوچەکانی سنووری بەرەو ڕووی موسڵمانی کرد چەند ناوچەیەکی بەردەوامی سەربازی، کە لەوێ کۆمەڵێ هێزی سەربازی دانا[٤].

---

١ـ تأريخ خليفة إبن خياط: ج٢ ص٤٣٥ــ ٤٣٦، البلاذري: فتوح البلدان: ص٢٦٢ــ ٢٦٣.

٢ـإبن خياط: هەمان سەرچاوە ص٤٢٦.

٣ـالبلاذري: ص٢٦٢ــ ٢٦٣، إبن الأثير: ج٤ ص٣٤١.

٤ـ عبدالله، وديع فتتي: العلاقات السياسية بين بيزنطة و الشرق الأدني الأسلامي ص١٤٥.

لە سەرەتاوە پەرچەکرداری ئیسلامی سنووردار بو، پاشان بەرە بەرە بەهێز دەبوبزووتنەوەی وەڵامدانەوەی هێرشە بیزەنتیەکان لەگەڵ نزیك بونەوەی سەقامگیری بارودۆخی خیلافەتدا دەرکەوت وبزووتنەوەی هاوینە و زستانەی لێهاتەکایە[١].

لەساڵی(١٣٤ك/٧٥٢ز)دا ئەبولعەبباس دوو سوپای هاوینەی بۆ (مەلتیە) نارد، یەکەمیان بە سەرکردایەتی صالح و عیسای هەردوو کوڕی عەلی کە مامی بون شوراکانی (مەلتیەیان) وێرانکرد، دووەمیش بە سەرکردایەتی موحوممەدی کوڕی نەسری بریمی حمیری، کە چوویە قەڵای(توانە)[٢]، هەروەك لە کۆتایی ئەو ساڵەدا بەسەرکردایەتی عەبدوڵڵای کوڕی حەبیبی فەهری هەڵمەتێکی دەریاییشی ئاڕاستەی سقلیەوسردینیا کرد[٣].

ئەبولعەبباس ویستوویەتی هێزی بیزەنتی بڵاو و بەش بەش بکات تا فشاری سەربازیەکان کەم بکات، خەلیفە لەسەر ئەوەسووربو، کە ئەو ناوچانەی بیزەنتیەکان دەستیان بەسەر داگرتون وەك ئەرزرۆم بیگێڕێتەوە و ئەو ناوچانەی وەك مەلتیە وێران بون نۆژەن بکرێتەوە، هەروەك گەشتنی دەریایی ئیسلامی بۆ دوورگەکان بەڵگەی بەردەوامی چالاکی دەریایی بو، بۆیە والیەکەی خۆی لەسەر شام، کە عەبدوڵڵای کوڕی عەلی مامی بو لە ساڵی(١٣٦ك/٧٥٣ز)دا ڕاسپارد تاهەڵمەتێك بۆ سەرئاسیای بچووك ئامادەبکات، هەڵمەتەکە لە (دابق) باکووری حەلەب وەك ئامادەسازی بۆ کەوتنەڕێ و کۆبونەوە، بەڵام مردنی خەلیفە لەو ساڵەداوای لە عەبدوڵڵای کوڕی عەلی کرد تا سەرکردایەتی ئەو شاڵاوە بوەستێنێ و چاوچنۆکی خۆی بۆدەست گرتن بەسەرخیلافەت نیشان بدات، بەشێوەیەکی گشتی دەکرێ پێکدادانی سەربازی نێوان هەردوو لا لەو ماوەیەدا بە جەنگی سنوور وەسف بکەن[٤].

---

١ـ علي محمد كرد: خطط الشام ج٥ ص١٦.

٢ـ تأريخ خليفة إبن خياط: من ٤٦٧.

٣ـ إبن الأثير: ج٤ ص٣٤٥.

4--Ostrogorsky: op— cit p167.

# وەزارەت لە سەردەمی ئەبولعەبباسدا

لە دوای ئەوەی سوپا عەبباسیەکان بە سەر سوپا ئومەویەکاندا سەرکەوتن و لە پێش بەیعەتدان بەخیلافەتی ئەبولعەبباسی سەففاح، ڕاستەوخۆ پایەی وەزیر داهات، ئەو پایەش نیزامێکی کۆنی فارس بو،[1] ئەبولعەبباس کاتێ نیزامی وەزارەتی دانا، کەوتە چاودێری کردنی گەشەسەندنی دەوڵەت و ئاڕاستەکردنی بەرەو مەکەزیەت ودابەشکردنی دەسەلاتەکان ئەمەش بەهاندانی فارس وکاریگەری خوراسانیەکان ڕوویدا، چونکە ئەوان ئەبوسەلەمەی خەلالی وەزیری بنەماڵەی موحەممەدیان بانگ کردو ئەبولعەبباسیش داینا.

بەلام دەسەلاتی وەزیر لە سەردەمی ئەبوسەلەمەدا بەشێوەیەکی ڕوون سنووردار نەکران ولەگەڵ ئەوەی ناوی وەزیر هەبو، بەلام سەلاحیاتیان دەسەلاتی تەواوی لە هەموو دیوانەکاندا نەبودیوانی خەراج ودیوانی سەربازی لەدەسەلاتی ئەودا نەبون، زۆرجار پێکدادان لە نێوان دەسەلاتی خەلیفە ودەسەلاتی وەزیردا ڕوویدەدا، بەو پێیەی سەلاحیاتی وەزیر دیاری نەکرابون، لە کاتێکدا سەلاحیاتی یەکەم بەشێوەیەکی ڕوون دیاریکراو بون. وەزیر دەیویست دەست بەسەر هەموو دەزگای کارگێریدا بگرێت و هەموو سەلاحیەتەکان جێبەجی بکات، دەسەلاتی خەلیفەیش لەبەردەم هەوڵەکانی وەزیردا دەوەستا.

پاشان ئەونیزامە گەشەی دەسەند تا ئەوەی سەقامگیر بولە سەردەمی یەکەمی عەبباسیدامەشخەڵەکانی ڕوونکرانەوە، ئیتر وەزارەت چەند تایبەتمەندیەکی دیاریکراو و بنەمایەکی جێگیری هەبون کە لە گرنگترینیان بریتی بون لە چاودێریکردنی کاروباری دارایی جاوەزیر خۆی کاروباری پارە وەرگرتن و خەرجکردنی لەدەست بو، دیوانی خەراج و خەرجی (النفقات)ی لە دەستدا بو و سەرپەرشتی باجەکانی دەکرد و دوو دەسەلاتی مەدەنی و سەربازی لە دەست

---

1ـأمين، أحمد: ضحي الأسلام ج1 ص165، الصالح، صبحي: النظم الأسلامية من 296.

خۆیدا کۆدەکردەوە، ئەمە بەزیاد لە ئەرکە گشتیەکانی وەك ئامۆژگاری کردن ویارمەتیدانی خەلیفە و لەجیاتی خەلیفەیش فەرمانڕەوایی وڵاتی دەکرد، واتە: وەك دەست ڕایی خەلیفە وا بو.[١]

لەسەردەمی عەبباسیەکان دوو جۆر بو: وەزارەتی جێبەجێ کردن، وەزارەتی پێسپاردن. وەزارەتی جێبەجێ کردن لە جێبەجێ کردنی فرمانەکانی خەلیفەدا بەرتەسك دەبویەوە و وەزیر هیچ هەڵسوکەوتێکی شەخسی سەربەخۆی تێدا ئەنجام نەدەدا بەڵکو لەمبارەدا تاکە ئەڵقەی پەیوەندی نێوان پێشەوا و گەلْ بو[٢].

وەزارەتی پێسپاردن لەسەر هەڵسووکەوتی ڕەهای وەزیر لەکاروباری دەوڵەتدا ڕاوەستا بو، ئەمە لە دوای ئەوەی خەلیفە ئەو کارەی پێدەسپارد و خەلیفە مافی هەڵسوکەوتنواندن لە جێگیرایەتیدا (ولایة العهد)و لابردنی هەندێ لەو کاربەدەستانەدا هەبو کە وەزیر دایدەنان و ئەو لێیان ڕازینەبون[٣].

کاتێ دەسەڵاتی خەلیفە عەبباسیەکان لاواز بو، قەڵەمڕەو لەخیلافەتەوە بۆوەزارەت گوازرایەوە و شان و شکۆی وەزیرەکان بەرزبویەوەو وەزارەتی پێسپاردن لەجیاتی وەزارەتی جێبەجێکردندا کەوتەکار، بەڵام لە ماوەی بەهێزی دەوڵەتدا خەلیفەکان کاروباری دەوڵەتەکەیان سپاردە وەزیرەکانیان لە ناودارترین وەزیرەکانی پێسپاردن لەسەردەمی یەکەمی عەبباسیدا بەرمەکیەکان بون.

وەك لە سەردەمی یەکەمی عەبباسیدا دەردەکەوێت پایەی وەزارەت لەهەمان کاتداگرنگیەکی گەورە و مەترسیداریشی هەبو لەڕووی گرنگیەوە، وەزارەت لەدوای پایەی خیلافەت گرنگترین پایەی دەوڵەتی عەبباسی بو، لەڕووی ترسناکیشیەوە وەزیرەکان لەهەموو بەشەکانی ژیانی سیاسی و ئابوری و کارگێری و هزریدا جێ

---

١ـ سەبارەت بە تایبەتمەندیەکانی وەزیری عەبباسی بڕوانە: إبن خلدون، المقدمە ج٢ ص٧٧٦ـ٧٧٨.

٢ـ الماوردي: الأحكام السلطانية و الولايات الدينية، ص٢٥.

٣ـ هەمان سەرچاوە ص١٥ـ١٦، ماوەردی مەرج و سیفەتی هەریەك لە وەزیری جێبەجێکردن و وەزیری پێسپاردن دەستنیشان دەکات.

دەستی ڕوونیان بەجێهێشت و هەندێکیان ئەو پایەیان بۆ مەبەستی سیاسی هەرێمایەتی نەیاری سیاسەتی دەوڵەتی عەبباسی قۆرخ کرد، بەتایبەت ئەگەر بزانین زۆربەی ئەو وەزیرانەی لە سەردەمی یەکەمی عەبباسیدا پایەی وەزارەتیان وەرگرتوە فارس بون.

ئەبولعەبباس لە دوای ئەبوسەلەمە خالیدی کوڕی بەرمەکی کرد بە وەزیر، ئەویش لەترسی ئەوەی تووشی دەردی پێشینەکانی نەبێت ڕازی نەبو ناوی وەزیری لێبنێت، ئەمە لەگەڵ ئەوەی گرنگترین کارەکانی خۆی دابو بەدەست جگەلە هەموو ئەرکەکانی تر کە پێ هەڵسا وگرنگترینیان سەرپەرشتیکردنی دیوانی خەراج ودیوانی سەرباز بو بەزیاد لە دەستکەوتەکانی جەنگ[١].

---

١ـ إبن الطقطقا: ص١٥٦.

# جێگیرایەتی (ولایة العهد) ـ مردنی سەففاح

سەففاح لە ساڵی(١٣٦ك/٧٥٤ن)دا ئەبوجەعفەری برای خۆی دانا، تا لە دوای خۆی خیلافەت بگرێتە دەست، پاشان عیسای کوڕی موسا کوڕی موحەممەد بێت، ئەمەشی نووسی دای بەعیسای کوڕی موسا ـ سەففاح تووشی نەخۆشی گولبون بو، ئەمە لەوکاتەی لەئەنباربو، (لە سیانزەی مانگی ذیلحیجەی ساڵی١٣٦ك/مانگی حوزەیرانی ساڵی ٧٥٤ن)دا مرد و لە کۆشکەکەی لە ئەنبار بە خاکسپێردرا[١].

## عەبدوڵڵا ئەبوجەعفەری مونسوور (١٣٦ــ١٥٨/ ٧٥٤ــ٧٧٥ز)

ناساندنی ئەبوجەعفەر: ناوی عەبدوڵڵای کوڕی موحەممەدی کوڕی عەلی عەبباسی ئەبوجەعفەری مەنسوورە، لەحومەیمە لە ساڵی٩٥ کۆچی لەدایك بوەو دایکیشی ئوم وەلەدە و بە سەلامە بانگکراوە، لە نێوەندی کۆمەڵگەی هاشمیدا پەروەردە بوەو لەگەنجیەوە بەدوای زانستدا گەڕاوە وهەوڵی شارەزایی ئایینی داوەو پشکێ لەزانستی فەرموودەی وەرگرتووە و بە ئەدیبی و زمان پاراوی و وابەستە بون بە ژیانی پاشاکانەوە گەورە بوە.[٢]

ئەبوجەعفەر لەگەڵ براکەی وخێزانیدا لەحومەیمەوە گواستیەوە بۆ کووفە، کاتێ ئەبولعەبباسی برای خیلافەتی گرتە دەست، ئەبوجەعفەر یاریدەدەری باڵای ئەو بو لەڕێکخستنی کاروباری خیلافەتدا، بۆیە ئەبولعەبباس جەزیرە و ئەرمینیاو ئازەربایجانی دایە دەست و بەرەو خوراسانیش بەڕێیخست تابەیعەتی بۆ وەربگرێت، هەروەك بەڵێنی خیلافەتی لەدوای خۆی پێدا.

کاتێ سەففاح مرد ئەبوجەعفەر لەحیجاز بەرپرسی جەح بو، بۆیە عیسای کوڕی موسای برازای لە ئەنبار بەیعەتی بۆ وەرگرت و هەواڵی بۆ ئەبوجەعفەر نارد.

---

١ـ الطبري: ج٧ ص٤٧٠ــ ٤٧١.

٢ـ إبن كثير: ج ١٠ص ١٢١ــ ١٢٢.

مەنسوور بەتوندی و ڕەقی و وریایی ویەکلایی وچاکەخوازی وگرنگیدان بەبەرژەوەندی هاولاتیان ناسراوە، حەزینەکردووە خوێن بڕێژێت مەگەر بەحەقی خۆی نەبێت، واناسرابو کە لەکاتی سەختییەکاندا سەقامگیر وخۆڕاگر بو، بێگومان ئەم سیفەتە لە ناودارترین ئەو سیفەتانەدایە کە سەرکەوتنیان بۆ بەدیهێنا.

# باردۆخی ناخۆیی لە سەردمی مەنسووردا

## سەرکەشی عەبدوڵلای کوڕی عەلی:

ئەبوجەعفەری مەنسوور خیلافەتی گرتە دەست و هێشتا پاڵپشتەکانی خیلافەتەکەی پتەو سەقامگیر نەبو بون، ئەو لە ڕکەبەری عەبدوڵلای کوڕی عەلی مامی دەترسا، کەداوای خیلافەتی دەکرد، هەروەك لەگەورەیی قەڵەمڕەویی ئەبوموسلیمی خوراسانی و دەرچوونی ئامۆزاکانی لە بنەماڵەی عەلی کوڕی ئەبوتالیب لە دەسەڵاتەکەی ئاگایی و بێداری وەرگرت بو.

دەی دەبێ مەنسوور چۆن بەرەو ڕووی ئەم سێ کێشەیە ببێتەوە؟

دیارە خەلیفە دلێری و ورەبەرزی و لێزانی و فێڵزانی هەبو، بۆیە بڕیاریدا دوژمنەکانی بەگژی یەکتردا بدات، تامەیدانی سیاسی بە چۆلی بۆ خۆی بمێنێتەوە.

عەبدوڵلای کوڕی عەلی دیدێکی تایبەتی بۆ کێشەی فەرمانڕەوایی هەبو، ئەو وێڕای ئەوەی چاوی بڕیبویە خیلافەت، لە ئەبولعەبباس و ئەبوجەعفەری کوڕەزاکانی خۆی بێزاربو بەو پێیەی ئەوان زۆر دابویان بەلای فارسدا.

ئەبو جەعفەر لەسەر حەق بو، کە لە چاوچنۆکیەکانی مامی دەترسا، ئەو مامەی کە لەسەردەمی ئەبولعەبباسدا بە سوپایەکی گەورەو ژمارە زۆری عەرەبەوە چوو، تا لەگەڵ بێزەنتیەکاندا بجەنگێ کاتێ گەیشتە(دلوك) لە ناوچەی دەوروبەری حەلەب بە مەرگی سەفاح و بەیعەتی ئەبوجەعفەری مەنسووری زانی، بۆیە لە کشانەکەی وەستا و چوو بۆ حەڕان و لەوێ پایەکانی جەنکی کۆکردەوەو لە کۆتاییدا بڕیاریدا خۆی بۆ خیلافەت کاندید بکات، سەربازەکانیش بەیعەتیان پێداو دواتر بەرەو جەزیرە کشا [١].

بەو جۆرە عەبدوڵلای کوڕی عەلی ئەو سوپایەی کە بۆجەنگی خاچپەرستان

---

١ـالطبري: ج٧ص ٤٧٤.

ئامادە کرا بو، بۆ بەدیهێنانی خواستی گرتنە دەستی خیلافەت بەکاریهێنا و بانگەشەی ئەوەی دەکرد ئەبولعەبباس کاتێ ناردوویەتی بۆ جەنگی مەڕوانی دووەم بەڵێنی خیلافەتی لە دوای خۆی پێداوە[١].

مەنسوور بەرامبەر ئەو مەترسیە ژیرانە و بەدانایی هەنگاوینا ئەمە بەڵگەی ئەوەیە لەباس وخواسە بنەڕەتیەکاندا بە سۆزداری بڕیاری نەداوە، بۆیە ئەمە ئەبومەسلیمی ڕاسپارد تا لەگەڵ عەبدوڵلادا بجەنگێ، ئەمە لەگەڵ ئەوەی ڕقیشی لە ئەبوموسلیم هەبو، بەمەیەش لێهاتوویی سیاسی بۆ بەیەکدادانی دوژمنەکانی بەکارهێنا، وێرایی ئەوەی هیوای وابو سوپا خوراسانیەکانی ناو سوپای عەبدوڵلا مامی بە هۆی فەرمانڕەوای خوراسانەوە، کە ئامادەیی بۆ ڕێگریکردنی بزووتنەوەی هەڵگەڕانەوە نیشاندا بێنە ناو سوپای خیلافەتەوە[٢].

ئەبو موسلیم بە لێزانی سیاسی وسەربازی خۆیەوە توانی لە جەنگێکی نێوانیان لە نزیك نسیبین لە ناوچەی جەزیرە بەسەر عەبدوڵلادا سەرکەوێت[٣] و عەبدوڵلا لەدوای شکستخواردنی بەرەو بەسرە ڕایکردو پەنای بۆ لای سولەیمانی کوڕی عەلی برای برد و لەوێ لە لای مایەوە، تا ئەوەی مەنسوور بەمەی زانی، بۆیە ناردی بە شوێنیداو متمانەی دڵنیایی و پەنادانی پێدا، کاتێ عەبدوڵلا هات، مەنسووری گرت و کردیە بەندیخانە، ئەمەیەش لەساڵی (١٣٩ك/٧٥٧ن)دا بو، عەبدوڵلا تا ساڵی (١٤٧ك/٧٦١ن) لە بەندیخانەدا بو تا لەو ساڵەدا ئەبوجەعفەری مەنسوور کوشتی.[٤]

---

١ـ المسعودي: ج٣ص ٢٨٩.

٢ـالطبري: ج٧ص ٤٧٥.

٣ـهەمان سەرچاوە: ص ٤٧٥ـ ٤٧٨.

٤ـ سەرچاوەی پێشوو: ج٨ ص٧ـ ٩ اليعقوبی: ج٢ص ٣٠٢.

# کۆتـایی ئەبو موسلیمی خوراسانی

فارســە خوراســانیەکان لــە دامەزرانــدنی دەولــەتی خیلافــەتی عەبباســیدا بەشدارییەکی دیاریان هەبو، لە سـەروو هەموویشیانەوە ئەبوموسـلیمی خوراسـانی، بەو هیوایەی خواستەکانیان کە لەم خاڵانەدا دەیانخەینەڕوو بەدیبهێنن:

١ـ تاکو دەسەڵاتی نوێ بە چاوی سۆزەوە بۆ کێشەی ئەوان بڕوانێت لەدوای ئـەو ستەمەی لە کاتی فەرمانڕەوایی ئومەویدا بەرەو ڕووی بونەوە.

٢ـ خواستی ڕزگاربون لەو دەسەڵاتە توندەی ئومەوی، کە تایبەتمەنـدی ڕەگـەزی عــەرەبی بــە ســەر ئــەوانی تــردا دابــو، ئەمــەش لەهــەموو بەشــەکانی ژیانــدا ڕەنگیدابویەوە.

٣ـ گێرانــەوەی شــان وشــکۆی لــە دەستــچویان و زیندووکردنــەوەی دەســەڵاتی هەڵوەشاوی فارسییان(کیسرا ئەنوشیروان) [١].

عەبباسیەکان سیاسەتی خۆیان بەرامبەر ئـەو ڕەگـەزە پێشڕەوە ئێرانیانـەدا لـە دوو بواری سیاسی و سەربازیدا لەدوو ڕووانگەوە دەستنیشان کرد:

یەکەم: بەشداری پێکـردن و هاوسـەنگی ڕاگـرتن لـە چوارچێوەی گوێڕایـەڵی بـۆ بنەماڵەی عەبباسی.

دووەم: ئەگەر لەو پشتیوانیە لایاندا سەرکوت بکرێن [٢].

ئـەو سیاسـەتە چـەند پاڵنـەرێکی ڕووداوگـەلێکی گـەورەمان پێدەبەخـشێت، کـە لەسـەردەمی یەکـەمی عەبباسـیدا بـەڕوونی دەرکـەوتن، کـاتێ دەوڵـەتی خیلافـەتی عەبباسـی بـەهێزبو سیاسـەتی ڕوونبویـەوە، فارسـەکان تێبـینی ئـەوەیان کـرد کـە دەوڵەتی نوێ بەو جۆرەی ئـەوان دەیانـەوێت خواسـتەکانی بەدینـەهێناون و پێیـان وابو عەبباسیەکان ئەو بەڵێنـەیان نابەنەسـەر، کەلـەماوەی ئامادەسـازی شۆرشـەکە

---

١ـ العمرو: ص٣٠٧.

٢ـ محمودو الشريف: ص١٠١.

پێیان دابون، ئەمەش پاشەکشەیەکە جێی ممتمانە نیە، وێڕای ئەمەش قەناعەتیان بەو ڕێبازە نەبو، کە عەبباسیەکان ڕایانکێشابو و جەختی لەسەر ئیسلام و عەرەبایەتی دەکردەوە، ئەمە بەپێی دیدی ئەوان بۆ بونی چەند ئامانجێکی دوورترو قوڵترو بەرژەوەندی فراوانتر، کە جەختی لەسەر زیندووکردنەوەی میراتی کۆنی فارس و کردنەوەی دەرفەت بۆ سەرهەڵدانەوەی بیروبۆچوونە مەجووسی و ئاگرپەرستەکان دەکردەوە[1].

بۆیە هەڵوێستیان لە ڕووی نیزامی نوێدا گۆڕا وبە ئامانجی لەناوبردنی دەوڵەت چەند بزووتنەوەیەکی هەڵگەڕانەوەیان بەرپاکرد، بزووتنەوەکەی ئەبوموسلیمی خوراسانی سەرەتا و کرانەوەی ئەو بزووتنەوە دوژمنکاریانە بون، ئەمەش وێنەیەکی ڕاستی بەرنگاربونەوەی نێوان هێزی خوراسانی، کە هێزی خۆی ئامادەکردبو و خواستی قەڵەمڕەو ودەسەڵاتی هەبو و نێوان مەرکەزیەتی دەسەڵاتی خیلافەتە[2].

لەدەست نشانکردنی ماهیەتی بزووتنەوەکەی ئەبوموسلیمدا، ڕوون دەبێتەوە، کە ئەوپیاوە هەستی بەوە کردووە ئەو دامەزرێنەری ڕاستی دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسیە بۆ ئەمەش کاتێ بینی فارسەکان لەدەوری کۆبونەوەو بەڕابەری نەتەوەییان دەزانی، خەونی خواستی شەخیس دایگرت، تا بەتەنها هەموو دەسەڵاتی خوراسان و وولاتی ئێران ودیدی سەربەخۆیی، یان بەدیهێنانی لامەرکەزی لە پەیڕەوی سیاسی وکارگێریدا بەجێبگەێنێت، هەڵس وکەوتەکانی لەدوای سەرکەوتنی و شۆڕشی عەبباسی و پەیوەندی بە خیلافەتەوە هەر لە سەردەمی خەلیفەی یەکەمەوە بەڵگەی ڕوونی ئەو ئاڕاستەیەی ئەو هەوڵوێستی قورسی خۆی لە ڕووی ئەبولعەبباسیدا نیشاندا و نەیاری زۆری بۆی هەبو وفرمانی بەرپەرچدەدایەوە[3].

ئەبو جەعفەر حەساسیەتی زۆری بەرامبەر چاوچنۆکیەکانی ئەبوموسلیم هەبو، بۆیە ئەبولعەبباسی برای هاندەدا، تا ئەبوموسلیم بکوژێت، بەڵام سەففاح زۆر حەزی

---

١ــ عمر: ص٩٠.

٢ــ محمودو الشريف: ص١٠٢.

٣ــ الجمشياري: ص٩٣.

بۆ ئەو کارەنیشان نەدەدا، چونکە خزمەتی بە بانگەوازی عەبباسی کردبو، جگە لەوەی ئەبوموسلیم شوێنکەوتەیەکی زۆری هەبو، کە ئەم کارە کاری دەکردە سەر ئایین ودنیایان و دەبونە سەرچاوەی ڕاڕایی بۆ دەوڵەت [1].

سەبارەت بە پەیوەندی ئەبوموسلیم بە ئەبوجەعفەرەوە، پەیوەندییەکی زۆر خراپ بو، کۆمەڵێ ڕووداو ڕوویدا کە بوە هۆی دوورکەوتنەوەی ئەو دوو کەسە لەیەکتری، لەوانە:

- ئەبوموسلیم لە ساڵی١٣٦ویستی حەج بکات، ئەو دەیویست کاروباری حەج بگرێتە دەست، بەڵام خەلیفە ئەبولعەبباس ئەو کارەی دایە دەست ئەبوجەعفەر، ئەمەش ئەبوموسلیمی تووڕە کرد [2].

- ئەبوموسلیم لە سەر ئەوە سوور بو، کە ئەبوجەعفەر هەستی بەنرخی ئەو بکات،بۆیە شان و شکۆی خۆی نیشاندەداو ماڵ و سامانی زۆری بۆچاکسازی ڕێگە و خۆشگوزەرانی عەرەبەکان و پێشرەوە بۆ کردنی لە ڕێگەدا.

-کاتێ سەففاح مرد و ئەبوجەعفەر خیلافەتی گرتە دەست، لەبەیعەت پێدان خاوخلچکی نیشاندا، ئەوان لەحەج دەگەرانەوە، ئەبوموسلیمیش نامەی بۆ نووسی و سەرخۆشی مەرگی براکەی لێکرد بەبێ ئەوەی پیرۆزبایی خیلافەتی لێبکات، یان کەسێ بنێرێ بۆلای تابەیعەتی پێبدات، یان ڕێگەبگرێتەبەر تا پێ بگات، بەڵکو خۆی لە بینی ئەبوجەعفەر بە دورگرت ئەمەش ترس و ڕاڕایی خستە دەروونیەوە [3].

کاتێ مەنسوور خیلافەتی گرتە دەست، بڕیاریدا لە ئەبوموسلیم ڕزگاری ببێت، بۆیە ئەمەش ئسلوبێکی سیاسی لە سەر ئەم بنەمایانە گرتەبەر:

- لە ناوچەی قەڵەمڕەوی لەخوراسان دووریخستەوە، تاکەس وکاری لەدەوری کۆنەبنەوە و سەربەخۆیی دەسەڵات وەرنەگرێت.

---

١ـ إبن الأثير: ج٤ ص٣٤٦.

٢ـ الطبري: ج٧ ص٤٦٩ـ ٤٧٠.

٣ـ سەرچاوەی پێشوو: ح٧ ص٤٦٩ـ ٤٧٠.

ـ تا بە تەنها و بەدەر لە قەڵەمڕەو و دەسەڵات بیبینێ.
ـ سۆزداری لە نێوان هەردوو لادا دروست بکات، تا لە دڵیدا سام و ترس نەمێنێ.
ـ لە مەڵبەندی خیلافەت نزیکی بکاتەوە، تا بەئاسانی چاودێری بکات.

لەدوای ئەوەی ئەبوموسلیم بەسەر عەبدوڵڵای کوڕی عەلیدا سەرکەوت، تەنگەژەی نێوانیان تەقیەوە و ئەبوموسلیم دەستبەسەر ماڵ و سامان وخەزێنەی عەبدوڵڵا داگرت، مەنسوور ویستی ئەبوموسلیم تێبگەیەنێت، کە تەنها یەکێکە لە کاربەدەستانی ئەبوجەعفەر، بۆیە نوێنەرێکی نارد بۆ لای، تا دەستکەوتەکان ئەژمارد بکات، ئەمەش ئەبوموسلیمی تووڕەو بێزار کرد ولەو بارەیەوە وتی (لە حوێندا دڵنیام، لە ماڵ و ساماندا ناپاکم؟!) پاشان ئەبوموسلیم هەواڵی بۆ نارد ئەوەی لە دەستتدایە دەستی پێوە بگرە، ئەبوموسلیم بەمە تووڕە بو نیازی لابردنی ئەبوجەعفەر بیری داگیر کرد[1].

دوای ئەوەی ئەبوموسلیم زیاتر خۆ بەزلزانی گرتی تا ئاستێ نامەی خەلیفەی بۆ دەهات، ئەویش دەیخوێندەوە و دواتر وەك گاڵتە پێکردن دەیپێچایەوە [2].

مەنسوور نامەی بۆ نووسی پیرۆزبایی سەرکەوتنی لێکرد و هەواڵی پێدا تا شام و میسر بگرێتە دەست، بەڵام ئەبوموسلیم ژیر و زیرەك بو و بەو شتانە هەڵنەدەخەڵەتا، کە دەیویست ئەبوموسلیم لەسەربازە خوراسانیەکانی جیابکاتەوە، بە تووڕەییەوە سەبارەت بەو بڕیارەی ئەبوجەعفەر وتی: (ئەو شام ومیسرم دەداتە دەست، منیش خوراسانم لە دەست دایە). ئینجا بڕیاریدا بگەڕێتەوە بۆخوراسان ولە فرمانی خەلیفە لابدات[3]. ئەبوجەعفەر لە گەرانەوەی ئەبوموسلیم ترسا وترسی هەبو پشت بە لایەنگرەکانی ببەستێ و بتوانێ هەڕەشە لە دەسەڵاتی مەرکەزی بکات، ئەوکات هەواڵی ملکەچکردنییان بەسەردا سەرکەوتنی بدات.

لە ئەنجامی ئەم گەشەسەندنی هەڵوێستانەدا، مەنسوور پەنای بۆ شێوەی فێڵزانی و لێزانی برد، تادوژمنەکەی لە ناو ببات بۆ ئەمە چوو بەرەو مەدائین و

---

١ـالیعقوبي: ج٢ ص٣٠٣، إبن الأثیر: ج٤ ص٣٥٠.
٢ـ الطبري: ج٧ ص٤٧١.
٣ـ هەمان سەرچاوە: ص٤٨٢.

لەوێوە نامەیەکی بۆ نووسی تا بۆ کارێکی گرنگ سەردانی بکات، ئەمە لەو کاتەی ئەبوموسلیم لە ڕێگەیدا بۆ خوراسان بو، بەلام ئەبوموسلیم لە نیازی خەلیفە تێگەیشت و نامەیەکی بۆ ناردەوە وتیایدا ڕق وکینەو وریایی ناو دەروونی خۆی بۆ نیشاندا [١].

ئەبوجەعفەر لە لەناوبردنی نەیارەکەی بێ هیوا نەبو، ئەمجارە پەنای بۆ شێوەی موژدە پێدان و ترساندن بردو نێردراوی خەلیفە، کە ئەبوحەمیدی مروزی بو توانی کاربکاتە سەر ئەبوموسلیم و لەگەڵ ئەوەی پایە جەنگیەکانی ناڕازیبون کەچی ئەو ئەبوموسلیمی ڕازیکرد تا بەتەنها بێتە لای ئەبوجەعفەر [٢].

بەو جۆرە ئەبوموسلیم لە دوای چەند هەوڵێك کە خەلیفە سیاسیەتی هەڕەشەی تێدا بە دیدەکرد هاتە بەردەم مەنسوور. لە نێوان هەردووکیاندا لێدوانێکی خۆش بەڕێوەچوو، کەزیاتر لەدادگاییکردن دەچوو، ئەمەش دوژمنایەتی خودی ئەبوموسلیم و ئەو هەولانەی نیشاندەدا کە لە خزمەت عەبباسیەکاندا خستنیەگەڕ، ژێری مەنسوور و ترسی لە بەرپابونی هێزی فارسی خوراسانی بەجیابونەوە لەدەسەلاتی مەرکەزی نیشاندەدا، چونکە ئەبوموسلیم بوبویە مایەی ترسێك، کە هەڕەشەی لە دەوڵەت و یەکبونی دەوڵەت دەکرد، هەروەك لێدوانەکەی بەڕێگەی دوژمنایەتی کۆنی نێوانیان بو، بەلام لە هەمانکاتدا تۆمەتێکی مەترسیداری ئەبوموسلیمی لە خۆدەگرت کە هەوڵیداوە لە یەکێ لەم ڕێگەیانەوە بگاتە خیلافەت [٣].

- تێپەڕاندنی پەیوەندیە کۆمەلایەتیەکان، کاتێ ئەبوموسلیم داوای ئامینەی کچی عەلی پووری خەلیفەی کرد [٤].

---

١ـ بگەڕێرەوە بۆ دەقی نامەکە لە لای الطبري: ج٧ ص٤٨٣.

٢ـ الطبري: ج٧ ص٤٨٤ـ ٤٨٥، اليعقوبي: ج٢ ص٣٠٣.

٣ـ العمرو: ص٣٢٢.

٤ـ اليعقوبي: ج٢ ص٣٠٤. دیارە بنەماڵەی عەبباسی تەنانەت لە بنەماڵە عەرەبیەکانی تر زیاتر شوێنێکی تایبەتی داگیر کردووە، عەبباسیەکان پێیان وا بو هاوسەرگیری عەبباسیەك

ـ خۆی لە پایەی یەکەمی دەوڵەتدا دادەنا، ئەمە کاتێ نامەی بۆ ئەبوجەعفەر نووسی و بەناوی خۆیەوە دەستی پێکرد [١].

ـ بانگەشەی نەژادی عەبباسی، کاتێ بانگەشەی ئەوەی کرد، کە کوڕی سولەیتی کوڕی عەبدوڵلا کوڕی عەبباسە، [٢]واتە: پایەیەکی یەکسانی لەگەڵ باوکی مەنسوور موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەبباسدا بۆ خۆی دانا.

ئەو تۆمەتانەی تر، کە ئاڕاستەی کران:

ـ سولەیمانی کوڕی پیری نەقیبی نەقیبانی لە حوراسان کوشت.

ـ هەندێ سەرۆك هۆزی یەمەنی وەك عەلی کوڕی جەدیعی کرمانی و عوسمانی برای کوشت.

ـ بەبێ مۆلەت وەرگرتن و ڕەزامەندی وەرگرتنی خەلیفە بڕیاری چوون بۆ خوراسانی دا.

پاش ئەوەی ئەبوجەعفەری مەنسوور ئەم تۆمەتانەی بۆ نەیارەکەی خستەڕوو، ئەبوموسلیم هیچ وەڵامێکی بۆنەما هێندە نەبێت باسی خزمەتکردنی لە ڕێگەی بانگەوازی عەبباسیدا بۆ خەلیفە بخاتە ڕوو. پێش ئەوەی بەشمشێر لێی بدرێت پەنای بۆ خەلیفە بردو لەبەردەمیدا کەوتە پۆزش هێنانەوە لەو کارانەی، بەڵام ئەو هەوڵەی نەیتوانی ڕێ لەکوشتنی بگرێت ولەڕۆژی بیست و پێنجی مانگی شەعبانی ساڵی١٧٣ك/ مانگی شوباتی ساڵی ٧٥٥ز)دا کوژرا [٣].

بەو جۆرە مەنسوور لەو ڕکەبەرە پڕمەترسیە ڕزگاری بو، کە بەهۆی چەند هۆکارێکی سیاسی وشەخسیەوە شوێنی ئیسراحەتی تێکدا بو، کاتێ عیسای کوڕی مووسای برازای بیانووی بۆ کوشتنی هێنایەوە مەنسوور پێی وت: (سوێند بەخوا لە

---

لەگەڵ ناعەبباسیەکدا کارێکی ناهاوسەنگە، بۆیە لە سەر ئەوە سوور بون کە کچەکانیان بە جگە لە عەبباسیەکان نەدەن.

١ـ هەمان سەرچاوە.

٢ـ المسعودي: مروج الذهب: ج٣ ص٢٩١ـ ٢٩٢، إبن الأثير: ج٤ ص٣٥٤.

٣ـ الطبري: ج٧ ص٤٩٠ـ ٤٩١.

سەرزەویدا لەوە دوژمنی خراپتر نیە، ئایا لە ژیانیدا دەسەڵاتێکتان هەبو ؟)[١] کاتێ جەعفەری کوڕی حەنزە لە بە کوژرانی ئەبوموسلیمی زانی، بەخەلیفەی وت: (ئەی ئەمیری باوەڕداران لە مرۆژەوە خیلافەتەکەت ئەژمارد دەکرێت)[٢] ئەگەر ئەمە بەڵگەی شتێك بێت، تەنها بەڵگەی گەورەیی شان وشکۆ و بەهێزی دەسەڵاتی ئەبوموسلیمە.

١ـإبن الطقطقا: ص١٧١.

٢ـالطبري: ج٧ ص٤٩٢.

# دەرەنجامی کوژرانی ئەبو موسلیم

بزووتنەوەکەی سەنباد: ئەبوجەعفەری مەنسوور توانی ئەبوموسلیم لەناو ببات، بەڵام یادەوەری لە لای فارسەکانی خوراسان و تورك و ئەدیو ڕووبار مایەوە، لە دوای کوژرانی لەخوراسان چەند بزووتنەوەیەکی ئاییني سیاسی ونەتەوەیی نامۆ بە ئیسلام دەرکەوتن، کە خاوەنەکانیان ئیسلامیان نیشان دەدا، کەچی لەناخەوە ئامانجی ئاییني ئاگرپەرستی و سیاسی وێرانەکەر ودەمارگیری فارسییان هەبو، ئەبوموسلیمیشیان کردبو بەهێماو پێناوێك بۆ دەربڕینی نەیارییان بۆ دەسەڵاتی عەبباسی و دەربڕینی ئەوەی لە دەروونیاندایە، پاشان ڕزگارکەرێکی چاوەڕانکراوی بەدیهێنانی ئەو ئامانج و هیوایانەیان بێت، کە عەبباسیەکان بەدییان هێنان [١].

بزووتنەوەکەی سنباد[٢] یەکەم پەرچەکرداری بۆ کوژرانی سەرکردەی فارسی ئەبوموسلیم پێکهێنا و لەتاو تووڕەیی کوژرانی ئەبوموسلیم و داوای تۆڵەسەندنەوەی لەڕێدەرچوو شوێنکەوتوانی لەدەوری کۆبونەوەدەستی بەسەرخەزێنەکانی ئەبو موسلیمدا گرت و ڕایگەیاند کەدواتر هێرشدەکاتە سەرمەککە و وەك تۆڵەسەندنەوە کەعبە دەڕووخێنێت [٣].

لە ڕاسیتدا ئەوبزووتنەوەیە سێ پاڵنەری هەبون: سیاسی، بیروباوەڕی، ڕەگەز پەرستی.

لە ڕووی پاڵنەری سیاسیەوە، ئەو پیاوە بڕیاریدا تۆڵەی ئەبوموسلیم لە خەلیفە مەنسووری عەبباسی بکوژی بسێنێتەوە، ڕاپەرینەکەیشی دژ بە ئەو خەلیفەیەو دژ بەنیزامی عەبباسی و هەر ئاڕاستەیەکی تری سیاسی بو، کە سنوور بۆ قەڵەمڕەوی خوراسانی دابنێت.

---

١ـ عمر: ص٢٢١.

٢ـ ئەو بزووتنەوە ناوی ڕێبەرەکەی کە ناوی سەنباد بو وەرگرت، سەنباد کەسێك ئاگر پەرست بو لە یەکێ لە گوندەکانی نەیسابور کە پێی دەوترا ئەمروانە، بگەڕێوە بۆ إبن الأثیر: ج٤ ص٣٥٧.

٣ـ الطبري: ج٧ ص٤٩٥ـ

لە ڕووی پاڵنەری بیروباوەڕیەوە، ئەو بزووتنەوەیە ڕێبازەکەی خۆی لەسەر خورەمی و مەزدەکیەتی کۆن پێکهێناو شوێنەکەوتەکانی بڕوایان بە پێشەوایەتی و هەمیشە مانەوە و هەرگیز نەمردنی ئەبوموسلیم هەبو[1]. لەڕاستید ئەم بزووتنەوەیە بزووتنەوەیەکی ئاگرپەرستی دژموسڵمانان بو، چونکە ناوی فارسی (فەیروز ئەسبەهژی)[2]لە خۆنا و بڕیاری ڕووخاندنی کەعبەی نیشاندا.

لە ڕووی پاڵنەری ڕەگەزپەرستیەوە سەنباد دەیویست دەوڵەتی فارس سەر لەنوێ زیندوو بکاتەوە ودژ بەدەوڵەتی عەرەبی ڕەگەزی فارسی بەهێز بکات، ئەمە لەگەڵ ئەوەی عەبباسیەکان لە ڕوانگەی هەڵوێستی ئومەویەکان بەرامبەر بە مەوالی دژ ئومەویەکان بون، بەڵام فارسەکان دەوڵەتی عەبباسییان بە درێژەپێدەری دەوڵەتی ئومەوی دەزانی بەو پێیەی ڕەگەزی عەرەبین، کاتێ سەنباد تەواو دەرکەوت، ئەبوجەعفەر بە سەرکردایەتی جەهووری کوڕی مەڕادی عەجلی سوپایەکی بۆ نارد و ل نێوان هەمەدان و ڕەی پێکیانددادا وجەهوور سەنبادی لەناوبرد، بەو جۆرە لە ساڵی(١٣٧ك/٧٥٥ن) و لە دوای حەفتا ڕۆژ لە دامەزراندنی، ئەو بزووتنەوەیە کۆتایی پێهات [3].

## چەند بزووتنەوەیەکی تر

پشتیوانانی ئەبوموسلیم لە دوای لە ناوبردنی بزووتنەوەکەی سەندباد بە تەواوەتی ون نەبون، لەڕاستیدا ئەگەرچی خەلیفەی عەباسی توانی ئەو بزووتنەوەیە لە ناوببات، بەڵام نەیتوانی ئەو بیرو هزرانە لە ناوببات کە پاڵیان بە سەندبادەوە ناتاراپەڕین بکات.

---

١ـ هەمان سەرچاوە: المسعودي: ج٣ ص٢٩٣ــ ٢٩٤، إبن الأثير: ج٤ ص٣٥٧.

٢ـ فەیروز یەکێکە لەو ناوانەی پێشتر بە سەر چەندین کەسی دیاری مێژووی ئیمپراتۆریەتی فارسدا نراوە. ئەسبەهذیش نازناوێکە لە فەرمانڕەوایانی هەندێ ناوچەی ئەو ئیمپراتۆریەتە دەنرا. بگەڕێرەوە بۆ: العمرو: سەرچاوەی پێشوو ص٣٢٩.

٣ـالطبري: ج٧ ص ٤٩٥، إبن الأثير، ج٤ ص٣٥٧.

بۆیە وڵاتی فارس و ئەو دیوو ڕووبار کۆمەڵێ بزووتنەوەی دژ بە فەرمانڕەوایی عەبباسی بەخۆوە بینی، کە بەشێوەیەك لە شێوەکان بەناوی ئەبوموسلیمەوە بەرپادەبون وهەمان ئامانجیان هەبو، لەو ڕوانگەی لە دەرەوەی ئاییینی ئیسلام و دەوڵەتی عەبباسیدا ئەژمارد دەکران، سیفەتی دیار و تایبەتی پشتیوانەکانی لە کاتی دەرچوونیان پۆشینی ڕەنگی سپی و هەڵگرتنی ئاڵای سپی بو، بۆیە بەو کۆمەڵانە دەوترا (سپی دروشمەکان)[١] لەو بزووتنەوانە:

## بزووتنەوەی ڕاوەندی کە لە ساڵی (١٤١ك/ ٧٥٨ز)دا دامەزرا.

بزووتنەوەی (أستاژسیس) کە لە ساڵی (١٥٠ك/٧٦٧ن) لە خوراسانەوە سەریهەڵدا.

مەنسوور هەوڵی لە ناوبردنی دا و بێبکانە لەگەڵیاندا جەنگاو لەوەیشدا سەرکەوتوو بو.

## پەیوەندی لەگەڵ تالیبیەکاندا

### لە ڕێدەرچوونی موحوممەد نەفسوزەکییە

تالیبیەکان هەر لە کوژرانی حوسەینەوە لە کەربەلاو مافی خۆیان بۆ گرتنە دەستی خیلافەت لەبیرنەدەکرد، چونکە لە هەموو بەشێکی ژیانیاندا بەردەوام بە هەموو جۆری هەوڵی گەیشتن بە مافی خۆیانیان دەدا، ئەگەر هەلێکیان بە دیکردایە دەیان قۆستەوە، ئەگەریش هەستیان بە لاوازی خۆیان بکردایە ئارامیان دەگرت، کاتێ بانگەوازی عەبباسی سەریهەڵدا هەندێ شیعەکان چوونە ناوی ووایان زانی تالیبیە، لەکاتێکدا هەندێکیتریان بەبێ لایەنی وەستان ووازیان هێنا تا بارەکە بەڕێرەوەی سروشتی خۆی بڕوات، ئەمە لەگەڵ ئەوەی پاڵپشتی بیرۆکەی شۆرشی دژ بە ئومەوییەکانیان دەکرد.

---

١ـ بارتولد: سەرچاوەی پێشوو، ص٣١٧.

پەیوەندی نێوان عەبباسی وتالیبیەکان لەکاتی بانگەوازی عەبباسیدا باش بو، کاتێ شۆرش بەگواستنەوەی خیلافەت بۆ بنەماڵەی عەبباسی کۆتای پێ هات، تالیبیەکان و بەتایبەت لقی حەسەنی وایان دەزانی عەبباسیەکان فێڵیان لێکردون و لەگەڵ ئەوەی ئەوان شیاوتری خیلافەتن کەچی عەبباسیەکان داگیریان کردووە بۆ خۆیان، ئاسان نەبو دوای هەموو ئەو سەختییانەی لەسەر دەستی ئومەویەکان تووشیان بوە، تادوای ئەوە بانگەوازێك بەناوی ئەوانەوە بەرپابێت، ئینجا بەرگەی ئەوە بگرن، کە مافیان ببرێت بۆیە دوژمنایەتیان نواند.

عەبباسیەکان لەلایەن خۆیانەوە لەسەرتا ژیانی سیاسییانەوە هەوڵیاندا لەگەڵ تالیبیەکاندا یاریدەدەربن، تادەرفەتی سەقامگیری و چەسپان بەدەوڵەتەکەیان بدەن، پاشان هەردوولا کەوتنە دوورکەوتنەوە و بەرەبەرە لەیەك دوورکەوتنەوە، کاتێ سەففاح لەو تارێکی لە کووفە ڕایگەیاند کە خیلافەتەکە عەبباسیە و بە عەبباسیش دەمێنێتەوەو کەسی ترمافی خیلافەتی نیە، مەبەستی تالیبیەکان بو،[1] بەڵام پەیوەندی نێوان هەردوو ئارامی وئاشتەوایی پێوەدیاربو، پاشان دوای ئەوە لەسەردەمی مەسووردا گۆڕاو بەرەو تەنگەژەیی و دواترپێکدادان چوو، چونکە ئەوخەلیفەیە هەستیکردبو، کە بەرهەڵستکاری تالیبی بوتە نەیارێکی سەرسەخت و هەڕەشە لە هەموو ئەوانە دەکات کە لە دەوڵەت دەردەچن.

لە ڕاستیدا یەکەم ئەو تالیبیانەی لەفەرمانڕەوایی عەبباسیەکان دەرچوون، موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی حەسەنی ناسراو بە (النفس الزکیە) و ئیبراهیمی برای بون، ئەو دوانە لە لقی حەسەنی بون، لەکاتێکدا پێشەوا جەعفەری سادق، کە لەلقی حوسەینی بو کەوتە ئاگربەست و توانی شوێنکەوتەکانی بەوە ڕازیبکات کە باردۆخ بۆ دامەزراندنی خیلافەتی تالیبی لە بارنیە.

موحەممەد بانگەوازی بۆ خۆی دەکرد و پێش ئەوەی عەبباسیەکان بگەنە دەسەڵات هەوڵی وەرگرتنی خیلافەتی دەداو لایەنگرانێکی هەبون کە لە حیجاز و عێراق و خوراسان بانگەوازیان بۆ دەکرد، ئەویش چاوەڕێی ڕۆژی خۆی بو، بەڵام ئەو لە پێشبینیەکانیدا هەڵەیکرد کاتێ وایزانی ئەو بانگەوازەی لە خوراسان

---

١ـ بگەڕێرەوە بۆ دەقی وتارەکە لەلای الطبري: ج٧ ص٤٢٤ـ ٤٢٦.

بڵاوبوەتەوە و دروشمی ڕەزامەندی ئال وبەیتی هەڵگرتووە بانگەواز بۆ تالیبیەکانە و ئەویش کەسی کاندیدکراوی تالیبیەکانە بۆ خیلافەت [١].

کاتێ عەبباسیەکان دەسەڵاتیان گرتە دەست، ئەو بەوە ڕازی نەبو و ئامادە بەیعەت بە خەلیفە سەففاح بدات و هەوڵیدا لە دەسەڵاتی خەلیفە سەففاح دەربچێت، بەڵام باوکی لەبەر فەزل و گەورەیی خەلیفە بەسەریەوە ڕێگری لێکرد [٢].

کاتێ ئەبوجەعفەری مەنسوور خیلافەتی گرتە دەست، موحەممەد و ئیبراهیم ئامادە نەبون بەیعەتی پێبدەن و لە حیجاز لە شوێنێکی نهێنی [٣] نشتەجێبون، ئەمەش خەلیفەی بێزار و تووڕە کرد، بۆیە بەوردی کەوتە گەڕان بە دوایاندا تا شوێنەکەی ئاشکرا کردن.

ئەو کات موحەممەد نەفسوزەکیە باوەڕی وابو لە بەرچەند هۆکارێك کاتێ ئەوە هاتووە دەرچوونی خۆی ڕێ لێبگرێت:

- عەبباسیەکان فشاریان خستۆتە سەر.

- مەنسوور کەوتە سزادانی خێزانەکەی بەو ئامانجەی فشاریان بخاتە سەر تا موحەممەد و ئیبراهیم بدەن بەدەستەوە.

- هەروەك چەند نامەیەکی پاڵپشتی لە لایەن سەرکردەکانی هەرێمەکان و گەورە سەرکردەکانی مەنسوورەوە پێگەیشت کە لە سەر دەرچوون هانیان دەدا [٤].

- زۆرێك لە خەڵك بە تایبەتی خەڵکی حیجاز دانیان بە پێشەوایەتی ئەو دانا.

---

١ـ موحەممەد بەو بڕیارانەی ئەو کۆنگرەیەی بەست کە لە کۆتاییەکانی سەردەمی ئومەوی لە (الأبواء) بەستراو تیایدا بانگەوازی بۆ عەبدوڵڵای کوڕی حەسەنی باوکی دەکردو کەسە دیارەکانی تالیبی وعەبباسیەکان تیایدا ئامادە بون، ئامانجیش لێی کاندیدکردنی نەفسوزەکیە بو بۆ خیلافەت، لە بارەی ئەو کۆنگرەوە بگەڕێرەوە بۆ: إبن الأثیر: ج٤ ص٣٧٠، إبن الطقطقا ص١٦٤ـ ١٦٥.

٢ـ الأصفهاني: مقاتل الطالبیین ص١٦٥.

٣ـ إبن الأثیر: ج٤ ص٣٧٠.

٤ـ لەگەڵ ئەوەی تێبینی ئەوە دەکەین ئەو نامانە نامەی گومڕاکردن بون لە لایەن سەرکردەکانی مەنسوور و بەئاماژەی خودی مەنسووربون بەو ئامانجەی لە دەرکەتنیدا پەلە بکات. بگەڕێرەوە بۆ: هەمان سەرچاوە، ج٥ ص٣.

- هاوەڵەکانی زۆر داوایان لێدەکرد تا لەدوای بێزاربونیان لە چاوەڕوانی کردن لە دەسەڵات دەربچێت.
- باوکی پاڵپشتی کرد تا دەربچێت.
- پێشەوا مالیك فەتوای بۆ دا کە دروستە بەیعەتی پێبدرێت و بەیعەتەکەی مەنسوور هەڵبوەشێتەوە.
- باوەڕی وابو ئەو لە مەنسوور بەهێز ترە [1].

بۆیە لەسەرەتا (مانگی ڕەجەبی ساڵی١٤٥ك/ مانگی ئابی ساڵی٧٦٢ز)دا بانگەوازەکەی ڕاگەیاند و لەمەدینە دەرکەوت ونازناوی ئەمیری باوەڕدارانی لەخۆی نا[2] وئیبراهیمی برایشی چوو بۆ بەسرە تا لەوێ ئتلای ڕاپەرین بەرز بکاتەوە[3] و پشتیوانانی تالیبیەکان کەوتنە پۆشینی ڕەنگی سپی.

ئەوەی لەمەنسوور شاراوە ونادیاربو دەرکەوت، زانی مەدینە بنکەوبارەگای موحەممەد نەفسوزەکیەیە بۆیە گرنگیدانی خۆی بۆ ڕێگریکردن لەبڵاوبونەوەی بانگەوازەکەی لەسەر حیجاز توند کردەوە،پاشان پەنایبردە بەر هەنگاوی سیاسی و موحوممەدی بۆ ئەوە بانگ کرد تا بە ڕێگەی ئاشتی ناکۆکیەکانی نێوانیان چارەسەر بکەن، بۆ ئەمەش کۆمەڵێ ناردن و هاوردەی نامەی ئەنجامدا[4]. لەهەمان کاتدا پلانی پێویستی بۆجیاکردنەوەی حیجاز لە ناوچەکانی تر خستەکار تایارمەتی لێببڕێت وخەڵکی نەچنە ناوبانگەوازەکەیەوە، پاشان چوو بۆ کوفە، کە لانکەی شیعە بو، لەوێ دەسەڵاتی خۆی لەسەر توند کرد[5]، هەروەك توانی خوراسانیەکان هانبدات تابدەنە پاڵی ویاریدەدەری بن [6].

---

١ـالمسعودي: ج٣ ص٢٥٣، إبن الأثير: ج٥ ص٣.
٢ـاليعقوبي: ج٢ ص٣١٥.
٣ـ هەمان سەرچاوە.
٤ـ دەقی نامە گۆڕینەوەکان دەبینیت لە: الطبري ج٧ ص٥٦٦ـ ٥٧٢.
٥ـ هەمان سەرچاوە: ص٥٦٥.
٦ هەمان سەرچاوە: ص٥٤٧.

هـەنگاوی یەکلاکـەرەوەی بزووتنەوەکـەی موحەممـەد لەسـەر دەسـتی تاقمـە سەربازیەکان هات و بەپەلە موحەممـەد دەبـینیٚ بـەهۆی چـەند هۆکارێکـەوە بـەرەو ڕووی چەندین سەختی و ناڕەحەتی بوەتەوە:

- زۆربەی خەڵکی مەدینە ئامادە نەبون یارمەتی بدەن [١].

- لە دەست نیشان کردنی دەرچوونیدا هەڵـەی کـرد بـو، ئـەو لەگـەڵ ئیبراهیمـی برایـدا ڕێککـەوتبو تـا بەسـرە لـەو ڕۆژەی ئـەم لـە مەدینـە دەردەچـێت ئـەویش دەربـچێت، بـەڵام ئیبراهیمـی بـرای لەبـەر نەخۆشـیەك، کـە تووشـی بوبـو لـەڕۆژی دیـاریکراو دەرنەچـوو، موحەممـەدیش لـەپێش ڕۆژی دیـاریکراودا دەرچـوو، ئەمـە وایکرد ڕەگەزی ڕێککەوتنی پێویستی سەرکەوتنی لە دەست دەربچێت وهەلی چاکی دایە دەست مەنسوور تا بۆلێـدانی هـەردوو براکـەی بەهەنـدی وەربگرێـت و بەجیالـە هەردووکیان بدات.

- لە بەرنگاربونەوەی نەیارەکان ڕاڕا بو.

ـ لەکۆتاییـدا لەبەرەبـەیانی دوانـزەی ڕەمەزانـدا جـەنگ لـە نێـوان هـەر دوولادا ڕوویداو بەسەرکەوتنی سوپای عەبباسی کۆتایی پیٚ هات و حەممەدنەفسوزەکیە لـە عەسری ڕۆژی دوو شەممە لەچواردەی ئەو مانگەدا کوژرا و عیـسای کـوڕی مووسـای سەرکردەی سوپای عەبباسی، کە ئەرکەکەی لەئەستۆدابو پەنای خـەڵکی مەدینـەی دا، بەڵام دەستی بەسەرشمەکی حەسەنی کوڕی عەلیدا گرت [٢].

ـ بەمـەیش یەکـەم بەشـی ئـەم چەرمەسـەریە کۆتـایی هـات وتـەنها لـەناوبردنی بزوتنەوەکەی ئیبراهیم لەبەسرە لە بەردەم مەنسووردا مایەوە.

---

١ـ هەمان سەرچاوە: ص٥٨٢ـ ٥٨٣.

٢ـ الطبري: ج٧ ص٥٩٦، الأسفهاني: ص٢٣٦ـ ٢٣٧.

## دەرچوونی ئیبراهیمی کوڕی عەبدوڵڵا:

ئیبراهیمی کوڕی عەبدوڵڵا لە دوای ئەوەی حیجازی بەجێهێشت، لەبەسرە سەقامگیر بو وئەوێی بە خاکێکی لەباری پێگەیشتن وبڵاوکردنەوەی بیرو هزرە هەوادارەکانی باتینیەکان دەزانی و زەیدی وموعتەزیلەکان چوونە ژێر ئاڵاکەی و هەزاران و چینی بیّ دەسەلات وکەم دەستان بەدەوریدا کۆبونەوە بەوهیوایەی لە دەست ئەو نەبونیە ڕزگاریان ببێت، ئومەویەکانیش لەمەدا پاڵپشتیان کردو عوسمانیەکان لەبەر ئەوەی لە ڕەچەڵەکدا پەیوەندی لەگەڵ عوسمانی کوڕی عەففاندا هەبو پشتگیری بون، شەرعناسانی بەسرەیش دەستیان دایە ژێر باڵی و یارمەتیان دا.[1]

بەهۆی هەموو ئەمانەوە توانی بە ئاسانی دەست بەسەر بەسرەدا بگرێت و ئەهواز وفارس و مەدائینیش ملیان بۆ کەچ کرد[2]. کووفەیش دەیویست لەدەست دەسەلاتی عەبباسی ڕزگاری ببێت، مەنسوور لەوێ دەسەلاتی خۆی بەچاکی چەسپاند بو، ئەمە وایکرد کووفە نەتوانێت یارمەتی شارەکانی تر بدات [3].

بزووتنەوەکەی ئیبراهیم گەشەی کردو وەفدەکان دەهاتنە لای بۆبەسرە بەیعەتیان پیّ دەدا و شان و شکۆی بەهێز بو، ئیبراهیم وا هەستی کرد کە دەرفەتی پێکدادان لەگەڵ خەلیفەدا لەبارە، کاتیّ کوژرانی موحەممەدی برای بیست، بانگەوازی خیلافەتی بۆخۆی کۆدو نازناوی ئەمیری باوەڕدارانی لەخۆی ناو شوێنکەوتووەکانیشی بەیعەتی خیلافەت وئەمیری باوەڕدارانیان پێدا [4].

لەڕاستیدا ئەو بزوتنەوەیە بەیەکیّ لەو بزووتنەوانە دادەنرێت، کە بەرەوڕووی مەنسوور بویەوە بەو پێیەی ئیبراهیم دەسەلاتی بەسەر ناوچەیەکی فراوان

---

١ـالمسند، عبدالله بن علي: العلويون في الحجاز، ص١٧٠ـ ١٧١.

٢ـإبن كثير: ج١٠ ص٩٢.

٣ـالطبري: ج٧ ص ٦٤١.

٤ـإبن كثير ج١٠ ص٩١: إبن الطقطقا: ص ١٦٧.

ودەوڵەمەنددا هەبو، ئەمەش کاریگەری خراپی بەسەرتواناکانی دەوڵەت هەبو و خەلیفە ترسا، بۆیە هەوڵیدا لەکوفەوە مەهدی کوڕی ببات بۆ ڕەی، هەروەك هەوڵیدا لەگەڵ ئیبراهیم ئالوگۆڕی نامە و نوێنەر بکات تا لەنێوان یەکتردا ڕێکەوتن ببەستن[١].

لە کۆتاییدا لەمانگی ذیلقەعدەی ساڵی١٤٥ك/مانگی کانوونی دووەمی ساڵی٧٦٣ز لە گوندی باچمرا لەنزیك کوفە جەنگی چەکداری لەنێوان هەردولا ڕوویدا و خەریکبو سوپای عەبباسی، کە عیسای کوڕی موسا سەرکرایەتی دەکرد، شکست بخوات و عەلەویەکان تەواو خەریك بوسەربکەون، بەڵام لەکتووپڕێکدا ڕووی جەنگ گۆڕا و تیرێك بەرقورگی ئیبراهیم کەوت و ئیبراهیم کوژرا،بەمەیش نیزامی سوپاکەی شلەژا، پێکیدادا و سوپای عەبباسی هێرشێکی هەڵگەڕاوەی بەرپاکرد وتوانی سەربکەوێت[٢].

١ـالمسند: ص ١٧٢.

٢ـالطبري: ج٧ ص٦٤٦ـ ٦٤٧.

# بارودۆخەکان لە مەغریب

عەبدوڕەحمانی کوڕی حەبیب کەیەکێ لەسەرکردە دیارەکانی عەرەبی بو لەژێر سایەی ئەوپشێوییەی، کە جیهانی ئیسلامی لە ماوەی ململانێی عەبباسی وئومەویەکان لە سەر دەسەلات لەخۆی گرتبو، دەستی بەسەر دەسەلاتی ئەفریقیا (مەغریبی نزم)دا گرت وچوویە قەیرەوان و ویستی دەولەتێکی سەربەخۆ دابمەزرێنێ[1].

ئەبوڕەحمان پیاوی دەولەت نەبو و لەهەلسوکەوتە سیاسیەکانیەوە هەژاری خۆی لەهونەری فەرمانڕەواییدا نیشانداو بویە قوربانی چاوچنۆکی و منگەرایی خۆی لە ساڵی١٣٧ك/٧٥٤ز، لە ژێر سایەی پشێوی ململانێ لە سەردەسەلاتدا تیرۆرکرا[2].

لەو کاتەدا خەواریج لەسەرشانۆی ژیانی سیاسی لەئەفریقیادەرکەوتن، ئەوان قەڕەولیان بۆ ولات گرتبویەوە و هەولیاندەدا بیگرنەخۆ، بەهۆی ڕاکێشانی هەندێ هۆزی بەربەرەوە،[3] کە بەڕاکانیان و دامەزراندنی چەند دەولەتێك لە ئەفریقیا بۆیان کاریگەر بو بون توانییان سەرکەوتن بەدەست بهێنن.

لەو کاتەدا مەغریب دەرکەوتنی دوومیرنشینی دەرەکی بەخۆیەوە بینی، کە بە سەرکردایەتی چەند سەرکردەیەکی عەرەب و لەسەر شانی بەربەرەکان دامەزران و سەر بەخۆییەکی نیمچە تەواویان وەرگرت.

میرنشینی یەکەم میرنشینی سلجماسە بو کە دەولەتی بەنی میدرار یان بەنی واسوولی سەفەرین[4]. ئەم دولەتە سەر بە مەزهەبە صەفەری بو، لە ساڵی (١٤٠ك/

---

١ـ إبن عذاري: ج١ ص٦٥، مؤنس، حسين: تأريخ المغرب و حضارته من قبيل الفتح الأسلامي ألى العزو الفرنسي، ج١ ص١٦٤.

٢ـ مؤنس: هەمان سەرچاوە ص١٦٦.

٣ـ تێبینی ئەوە دەکرێت زۆربەی ئەو بەربەرانەی لە بزووتنەوە خەواریجەکاندا بەشدارییان کردووە، زەناتییەکان بون، واتە لە دەشتەکیەکان. مؤنس: ج١ ص١٦٥.

٤ـ پیاوێکی سوودانی بە عیسای کوڕی یەزیدی مەکانیسی سەفەری بانگدەکرا ئەم میرنشینەی دانا، سەبارەت بە بەنی میدرا و بەنی واسول لەبەر ناوی سەرکردەی سێیەمیان کە ئەبولقاسم سەمعونی کوڕی واسولن ناسراو بە میدرارە ناونراوە.

٧٥٧ز) لـە باشـووری مـەغریبی دوور لەناوچـەی نیمـچە بیابـانی مێرگـی ناوچـەی باشـووری شـاخەکانی ئەتڵەسـی لـە خـۆ دەگـرت و لەسـەر شـانی بیابـانی ناوچـەی باکوور بو، دامەزرا.

ئەو میرنشینەلە گرنگترین میرنشینە سەربەخۆکانی خەواریجە کە لەو سەردەمەدا (سەردەمی ئەبوجەعفەر) دەرکەوتن، ئەم میرنشینە ماوەی سەدوچل سـاڵ تەمـەنی کـرد، بەدەوڵەمەنـدی و پێگـەی گرنگـی بازرگـانی ناوبـانگی دەرکـرد بـو، هـەروەك بازارێکی گەورەیشی پێکهێنا بو، کـە تیایـدا ئـاڵوگۆری شمـەکی هـاتووی باشـوور و ڕۆژئاوای بۆ ئەوێ لـەخۆدەگرت، تـا لـەوێ بگوازرێتـەوە بـۆ حـەوزی دەریـای سـپی ناوەڕاست، یان لەو حەوزەوە بگوازرێتەوە بۆ ناوجەرگەی ئەفریقیا.

میرنشینی دووەم، ئیبازیەیە، ئەمـەش دەدرێتـە پـاڵ عەبـدوڵڵای کـوڕی ئیبـازی مـوڕی، ئـەم میرنـشینە لەسـاڵی (١٤٤ك/٧٦١ز) لـە مـەغریبی ناوەڕاسـتدا دامـەزراو پیاوێکی فارسی(بەڕای زیاتر) کە ناوی عبدولڕەحمانی کـوڕی ڕۆسـتەم بـوو نازنـاوی پێـشەوای هـەڵگرتبو دایمەزرانـد، خەلیفـەکانی نزیکـی سەدوسـی سـاڵ زیـاتر فـەرمانڕەواییان کـرد، ئەمانـە دەمـارگیرترین خەواریجـەکان بـو، کۆمەڵگـەی ئەومیرنشینە لەسەر بنەمای یەکسانی تەواوی نێوان ژیانی خەڵك و خەلیفەکان بنیاد نرابـو، بۆیـە بەربـەرەکان پێیـان وابـو ومەزهـەبی خـەواریج بـۆ بـاری کۆمەڵایـەتی و سیاسـیان لـە بـارە، بۆیـە کردیـان بـە دروشمێـك بـۆ دژایـەتی دەمـارگیری ڕەگـەز پەرستی.

لەبـەر جیـاوازی بـیرە ئایینیـەکانیان نـاکۆکی خـەریك بـو دەکەوتـە نێـوان ئـەو دووکۆمەڵە خەواریجەی سەفەری وئیبـازی. ئـەفریقیا لـە ژێـر ڕەحمـەتی خەواریجدا کۆمەڵ بە کۆمەڵ دەسەڵاتەکەیان وەردگرت، ئەمە پاڵی بە خەڵکەکەیەوەنا تـا پـەنا بۆ خیلافەتی عەبباسی ببەن.

مەنسوور لە بەردەم ئەم بزووتنـەوە بەرهەڵستکارانەدا دەستەوسـان نەوەسـتا و شاڵاوی سەربازی بـەرەو مـەغریب ناردتـا دەسـەڵاتی دەوڵـەت بەسـەر ئـەو ناوچـەدا بگێڕێتەوە.

یەکێ لەو هەڵمەتانە بەسەرکردایەتی یەزیدی کوڕی حاتەمی کوڕی قوبەیسە توانی لە ساڵی (١٥٥ك/٧٧٢ز) بەسەر خەواریجی ئیبازیدا بگرێت و قەیرەوان لە دوای گەڕانەوەی لە لایەن سوپاکانی عەبباسیەوە بۆ ماوەیەکی زۆر لە ژێر سایەی حوکمڕانی ئەهلی سوننەدا بە ئارامی و سەقامگیری ژیانی بردەسەر.

بەم جۆرە مەنسوور توانی ویلایەتی ئەفریقیا بگێڕێتەوە، بەڵام قەڵەمڕەوەکەی لە ناوخۆی مەغریب تێپەڕی نەکرد.

# زیندووکردنەوەی دەوڵەتی خیلافەتی ئومەوی لە ئەندەلوس

ئەندەلوس ئەو ویلایەتەبو کە بەگواستنەوەی خیلافەت لە ئومەویەکانەوە بۆ عەبباسیەکان زیاتر کاریگەر بو، لە ماوەی نەبونی دەسەلاتی مەرکەزیدا، کەلەنێوان دوو ساڵی(١٢٤ـ ١٣٨ك/ ٧٤٢ـ٧٥٦ز) بەردەوام بو، بەدەست پشێوی ململانێی دەمارگیری و ڕەگەزپەرستی و هەرێمایەتیەکانەوە دەینالاند و جەنگی ناوخۆی لە نێوان قیسس و یەمەنیەکاندا هەڵگیرسا و موزریە یەمەنیەکان لەشقندە لە بەردەم قورتوبە لەساڵی(١٣٠ك/٧٤٨ز)شکستیان خوارد[1]. لەوکاتەدا دەوڵەتی خیلافەتی ئومەوی لەسەر دەستی عەبباسیەکان لەساڵی(١٣٢ك/٧٥٠ز)دا ڕوخاو والیە عەبباسیەکان دەکەوتنە شوێن ئومەوییەکان و دەیانکوشتن، بەلام ئەمیرێکی ئومەوی، کە عەبدوڕەحمانی کوڕی موعاویەی کوڕی هیشامی کوڕی عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان بو توانی لە دەست عەبباسیەکان ڕابکات و ڕوویکردە بەرەی مەغریب، عەبدولڕەحمان چاوی لە دەسەلات بو بۆیە بڕیاری دامەزراندنی دەوڵەتێکی لە مەغریب دا، بەلام بەرهەڵستکاری والی ئەفریقیا عەبدوڕەحمانی کوڕی حەبیبی فەهری هاتە ڕێ، بۆیە چاوی بڕییە ئەندولس کە بارودۆخی شلەژاوی هەبو و دەرفەتی زیاتر لە مەغریبی لەوێدا بەدیکرد، بەدزی خزمەتگوزاری کە عەبدولڕەحمان ناردی بۆ ئەوەی تا لە بارەکە بکۆڵێتەوە توانی دەستەیەك بۆ بنکەی ئومەوی بە پاڵپشتی وپشتبەستن بەیەمەنیەکان پێك بهێنێ، لەڕاستیدا یەمەنیەکان، کەپەیوەندییان بەخێزانی مەڕوانیەوە هەیە، بەخۆشیەوە پاڵپشتی ئەمیری ئومەوییان کرد، تالە دەست کۆتی سەختی قیسیەکان ڕزگاریان ببێت و تۆلەی کوژراوەکانیان لە جەنگی شقندە بکەنەوە.

پاڵپشتانی ئەمیری ئومەوی بەخششیان دەست دەکەوت، ئەمەش زیاتر لەسەر بانگەوازەکەی هانی دەدات، ئەمیری ئومەوی لەمانگی ڕەبیعوثاني

---

١ـ مؤلف مجهول: أخبار مجموعة، ص٥٩.

ساڵی١٣٨ك/مانگی ئەیلولی ساڵی٧٥٥ز لە گەروو پەڕییەوەو وەك میوان لای ئەبوعوسمان لە قەڵای تەرشە دابەزی.[١]

ئەوکات فەرمانڕەوایی ئەندەلوس یوسفی کوڕی عەبدوڕەحمانی فەهری بو، بەڵام دەسەڵاتی کرداری لەدەست سەرکردەی قیسی سومەیلی کوڕی حاتەمدا بو، هەردوو سەرکردەیش مەترسی پەڕینەوەی ئەمیری ئومەوییان بۆ سەربازی خۆیان دەزانی، بەتایبەت کە ئەمیری ئومەوی لەکۆمەڵگەی ئەندەلوسیدا متمانەی خەڵکێکی زۆری بە دەست هێنا بو، بۆیە هەردووکیان بڕیاریاندا بەناچارکردنی بە گەڕانەوە، یان ملکەچ کردنی بۆ ئەوان ڕێی لێبگرن.

عەبدوڕەحمانیش لەلایەن خۆیەوە خۆی ئامادە کردبو تا لە ڕووی هەردووکیاندا بوەستێت، بۆیە قەڵای تەرشەی بەجێهێشت و چووە ئەرشەژونە کە پاڵپشتی خۆی بۆ عبدوڕحمان دەربڕیبو،[٢] پاشان چوویە ئیشبیلیە وخەڵکەکەی بەیعەتیان پێدا،[٣] ئەو تاقمە سەربازییانەی لەدیمەشق وحمیس و ئوردنەوە هاتبون دایانە پاڵی، دواتر چوو بۆقورتوبە و لەڕێگەدا لە مانگی ذیلحەجەی ساڵی (١٣٨ك/مانگی ئاياری ساڵی٧٥٦ز)دا بەرەوڕووی هێزەکانی سومەیل وفەهری بویەوە و بەسەریدا سەرکەوت وچوویە قورتوبە و لەمزگەوتی گەورەی قورتوبەدا نوێژی هەینی بۆخەڵکی کردو وتاری پێشکەش کردو دەوڵەتە نوێیەکەی خۆی ڕاگەیاند وهەریەك لە سومەیل و فەهری ناضر بون ڕابکەن[٤].

بەو جۆرە ئەو ئەمیرە ئومەوییە وەدەرنراوە توانی سەرلەنوێ دەوڵەتی خیلافەتی ئومەوی، کەلە ڕۆژهەلات ڕووخابو زیندوو بکاتەوەو ئەندەلوس بکاتە دەوڵەتێکی سەربەخۆ و یەکەم ویلایەت کە لە دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی جیابویەوە. عەبدوڕەحمانی داخیل[٥] لە سەرتای دەسەڵاتیەوە بەرەو ڕووی دووگرفت

---

١ـ إبن عذاري أبو عبدالله محمد المراكشي: البيان المغرب في أخبار الأندلس و المغرب، ج٢ ص٤٦.

٢ـ أخبار مجموعة: ص٨٥.

٣ـ هەمان سەرچاوە ص٨٦.

٤ـ هەمان سەرچاوە: ص٨٩ـ ٩٠.

٥ـ نازناوی (داخل) لە عەبدوڕەحمان بۆیە نرا چونکە چوویە ناو ئەندەلوس.

بویەوە:

یەکەمیان بەرپابونی چەند بزووتنەوەیەکی هەڵگەڕانەوە لەلایەن سومەیل و فەهرییەوە، ئەم بزووتنەوانەی لەناوبردو بە کوژرانی هەردوو سەرکردە کۆتایی پێهات[1].

کێشەی دووەم: هەوڵی خیلافەتی عەبباسی بو بۆ لە ناوبردنی دەوڵەتی تازە دامەزراو و گێرانەوەی دەسەڵاتی خۆی بە سەر ئەندەلوسدا لە دوای ئەوەی پێی باشنەبو ئومەویەکان بەشێ لە دەوڵەتی خیلافەتی ئسلامی ببڕن و جیای بکەنەوە.

لە ڕاستیدا ئەبوجەعفەری مەنسوور باری ڕاڕا و نالەباری بەردەوامی عەبدوڕەحمانی قۆستەوە و بەنهێنی پەیوەندی بە یەکێ لە سەرکردە عەرەبەکانەوە کرد کە بە عەلائی کوڕی موغیپی جوزامی بانگدەکرا و هانیدا تا لە دەست نەیارەکەی ڕزگاری بکات و بەڵێندا دەسەڵاتی ناوچەکەی بداتە دەست و ئالای دەوڵەتی عەبباسی وتۆماری دانانی عەلائی وەك ئەمیری ئەندەلوس بۆ نارد[2].

عەلائیش بەنهێنی خەڵکی بۆ گوێڕایەلی خەلیفە مەنسوور بانگ دەکرد و لە ساڵی(١٤٦ك/٧٦٣ن)دا هەڵگەڕانەوەی سیاسی چەند بزووتنەوەیەکی تاقمە دەمارگیریەکانی بەهەند وەرگرت وجەختی لەسەر یەمەنیەکان کردەوە، کە لە دوای فەرمانڕەوایی عەبدوڕەحمانی داخیل بێزار بوبون لەدوای ئەوەی بەتەنهادەسەڵاتی بۆخۆی وەرگرت ولە بەدیهێنانی خواستی دەسەڵاتداری لە بەرامبەر یارمەتیدانی عەبدوڕەحمان لەملمڵانێی لەدژی موزریەکاندا ملکەچی و بێدەسەڵاتی کردن. عەبدوڕەحمان ئامادەنەبو ببێتە ئامێرێکی دەستی ئەوانە، بۆیە دایە پاڵ قیسیەکان. ئەمەش ئەوانی تووڕەکردو پاڵی پێوەنان تابدەنە پاڵ بزووتنەوەکەی عەلاء، هەروەك فەهریە قیسیەکان لەبەر دوژمنایەتی سەختی نێوانیان دایانە پاڵ بزووتنەوەکەی عەلاو.

---

1- Provencal— Levi:histoire de L'Espgne Musulmane. Tom Ip 108

٢ـإبن عذاري: ج٢ ص٥٣.

لە دوای نزیکەی یەك ساڵ پەیوەندی و ئامادەسازی، عەلاو شۆرشی دژ بە نیوامی ئومەوی لە ساڵی(١٤٧ك/٧٦٤ز)دا ڕاگەیاند و ئاڵای ڕەشی عەبباسی بەرزکردەوە، بەڵام ئەمیری ئومەوی توانی بەسەر شۆرشەکەدا سەرکەوێت و عەلاء و ژمارەیەك لە پیاوەکانی بکوژێت وسەرەکانی نارد بۆ لای مەنسوور. بەمە ئەبوجەعفەر زانی بەرامبەر ئەمیرێکی بەهێزی وا وەستاوە کە پێدەچێ لە زیرەکی و لێزانی و قسە سەپێنی خۆیدا لەم زیاتر بێت شکستهێنانی ئەم هەوڵە ئەو بەسبو تا واز لە پرۆژەی گێرانەوەی ئەندەلوس بهێنێ. دوژمنایەتی و ڕقی ئەبوجەعفەر نەبوە ڕێگەی ئەوەی سەرسامی خۆی بۆ عبدوڕەحمان نیشان بدات و نازناوی(صقر قریش)ی لەعەبدوڕەحمان نا.

# بارودۆخی دەرەکی لە سەردەمی مەنسووردا

## پەیوەندی لەگەڵ بیزەنتیەکاندا

جەنگی نێوان موسڵمانان و بیزەنتیەکان لە سەردەمی مەنسوور خۆی لە ئاگر بەستدا دەبینیەوە و جەنگ و پێکدادانی سنوورداری سنووری ڕوویاننەدا، ئەمەش لەبەر ئەوەی عەبباسیەکان گرنگیان بەپاڵپشتی کردنی مەڵبەندی ناوخۆیی خۆیان دەدا، لە بەرامبەردا ئیمپراتۆری بیزەنتی قوستەنتینی پێنجەم لەلایەکەوە گرنگی بەجەنگی بولخار لە بەلقان دەداو لەلایەکی ترەوە سەرقاڵی کێشەی پەرستشی ئەیۆنەکان بو، لەو کاتەدا خەلیفەی عەبباسی دەیویست هەرچی قەڵاوسەر سنووره وێرانکراون چاکیان بکاتەوە و ئەو ئارامشە ڕێژییەی کە هەبو بەهەند وەربگرێت.

شتێکی ڕوونە مەنسوور بەرامبەر دەوڵەتی بیزەنتی سیاسیەتێکی دەگرتەبەر، کە لەگەڵ باری هێرشبەری پەیڕەو کاری ئیمپراتۆری بیزەنتیدا بگونجێت، ئەویش هەوڵی وەستاندنی هێرشەکەی بو لەڕێگەی قایمکردنەوەی سەرسنوورەکانەوەو چاك کردنەوەی قەڵا ڕووخاوەکان و دواتر ڕێکخستنی پێناوەکانی بەرگری لێکردنی. شیاوی باسە ناوچە سەر سنووریەکان بۆ دوو بەش دابەش دەبون:

یەکەم: ناوچەی سنووری جەزیری، کە تایبەت بەبەرگریکردن لە جەزیرە واتە: باکووری عێراق بو، گرنگترین قەڵایشی (مەلتیە، مسیسە، مەرعەش) بون.

دووەم: ناوچەی سەرسنووری باکوور، کە دەکەوێتە ڕۆژئاوای سنووری جەزیری، ئەمە تایبەت بو بە بەریگریکردن لە وڵاتی شام و لەکرنگترین قەڵاکانی بریتین لە: تەرسوس، ئەژنە، عەین زربە.

مەنسوور ئەو ناوچانەی سەنگەرگیرکردو حوکمی کارگێری سەربەخۆی پێداو هەزاران جەنگاوەرو سەنگەرنشینی بۆ کۆکردەوە و زەوی وخاکی کشتوکاڵی بۆ بڕینەوە وخانوو وبینای بۆ بنیادنان و ماڵ و سمانی بۆ بڕینەوە ونیزامێکی سەربازی بۆ دانان تاپەیڕەوی بکەن.

ناوچەی سەرسنووری شام تایبەتمەندی ئەوەی هەبو، کە لەیەك کاتدا شالاّوی دەریایی و وشکانی هەبو[١].

کەشتیگەلی میسر و شام لەو ناوچانەوە ڕۆلێکی گرنگی هاوبەشیان دەبینی.

بەو نیزامە سنووریە مەنسوور توانی سنوورێك بۆ چاوچنۆکی بیزەنتیەکان دابنێ.

لە سەردەمی ئەودا ناوچە سەرسنوورییەکان چەند وردە جەنگێکیان بە خۆوە بینی، کە جەنگی پارتیزانی هەردوو لای دەگرتەوە، هەندێ جار لاواز و هەندێ جاریش چالاك دەبو و کاریگەر باری ناوخۆی هەردوو لا ڕۆلی دەبینی.

لەساڵی(١٣٣ك/٧٥٠ ز)دا مەلتیە بەرەو ڕووی هێرشێکی سەختی بیزەنتی بەسەرکردایەتی ئیمپراتۆر بویەوەو ئیمپراتۆر توانی بچێنە مەتیەو خەڵکەکەی ڕاوەدوونا و شورەکەی ڕووخاند[٢]. لەبەر ئەوەی ئەو شارە گرنگیەکی ستراتیژی هەبو، بۆیە خەلیفە گێرایەوە و بنیادی نایەوەو پڕ جەنگاوەری کرد[٣]. هەروەك ئەمەی بۆ قلوژیەیش بەکارهێناومسیسەی بنیادناو مەرعەشی نوێ و سەنگەرگیرکردەوە[٤].

بیزەنتیەکان لە چەند کاتێکی نزیك، یان دووردا چەند هێرشێکیان بردە سەر ناوچە سەرسنورییەکان و موسڵمانانیش بە ناردنی هێزی سەربازی هاوینە کە لە سەردەمی مەنسووردا بەردەوام درێژەی کێشا بەرپەرچیان دەدانەوە وکۆتاجەنگی هاوینەیش لە ساڵی (١٥٨ك/٧٧٥ز) بە سەرکردایەتی معیوف کوڕی یەحیا بەرامبەر سوپای بیزەنتی لەناوچەی نێوان (حەدەث) و ڕووباری (جەیحان)دا ڕوویدا[٥].

---

١ـ البلاذري: ص٢٦٢.

٢ـ هەمان سەرچاوە.

٣ـ هەمان سەرچاوە ص٢٦٣ـ٢٦٤، تأريخ خليفه إبن خياط: ج٢ ص٤٤٥.

٤ـ هەمان سەرچاوە: ص٢٢٧ـ٢٦٥، اليعقوبي: ج٢ ص٣٨٢.

٥ـ تأريخ خليفه إبن خياط: ج٢ ص٤٥٨، الطبري: ج٨ ص٥٧. The phone chonographio.pp

900 –897

# بنیادنانی شاری بەغداد

لە گرنگترین کارەکانی خەلیفە ئەبوجەعفەری مەنسوور کردی و کاریگەری دواتری لە سەر داهاتووی دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی هەبو، بنیاندنی شاری بەغداد بو، لەڕاستیدا مێژووی ئەم دەوڵەتە بەو پێیەی بنکەیەکی ئیسلامی بو ڕیکاوڕێك لەگەڵ دامەزران ودارمانی دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسیدادەچێت، پێش ئەوەی عەبباسیەکان ماوەی سیانزەساڵ لە گەیشتنە دەسەڵاتەوە پایتەختیان بۆ دەسەڵاتەکەیان نەبو تا بەغدادیان بونیاد نا.

مەنسوور هەستی بەومەترسیانە کردبو، کە دەوروبەری دەوڵەتە تازەکەیان دابوو ئامانجیان لابردنی دەسەڵاتی بنەماڵەی عەبباسی بو، بۆیە ویستی بە شوێنێکدا بگەرێت، کە بۆ پایتەختی نوێ لە بار بێت و ئاماژە بە دەسەڵاتداری بنەماڵەکەی بکات، بۆیە شوێنی گەیشتنی ڕووباری (فرات) بەڕووباری (دیجلە)ی هەڵبژارد، بەمە بەغداد ئەو دەرگا مێژووییەیە، کە بەرەو شارەکانی ڕۆژهەڵاتت دەبات.

پاڵنەری سیاسی و سەربازی و ئابوری وکەش و هەوایش پاڵیان بە ئەبوجەعفەری مەنسوور نا تا ئەو شارە بنایاد بنێت.

لەڕووی پاڵنەری ساسیەوە عەبباسیەکان نەیان توانی دیمەشق بکەنەپایتەختی خۆیان، چونکە دڵسۆزیەکی بۆ ئومەویەکان تێدابو، ئەو شارە لە مۆرکی سروشتیدا عەرەبی بو و لە وڵاتی فارسی سەرچاوەی هێزی عەبباسیەکان دوور بو، ئەوان لە گواستنەوەی پایتەختیان بۆ ڕۆژهەڵات بەرژەوەندی تایبەتیان هەبو، هەروەها عەبباسیەکان لەبەسرەیان کوفە، کە دووشاری گەورەن وهەر لە سەردەمی فەتحی ئیسلامی لە عێرقدا هەن، سەقامگیر نەبون، بەدڵنیاییەوە ئەمەش شتێکی خۆبەخۆو هەروا نەبو، کوفەییەکان زۆریان حەز لەشۆرش بو و شیعەگەرایی بۆ عەلی کوڕی ئەبوتالیب و وڕەکانی بەسەریدا زاڵ بو. بەسرەیش لە پێگەی وشك و سەختی لە باشوور بۆ پایتەخت شیاو نەبو.

بەڵام بەغداد دامەزراوەیەکی پوختی نوێی عەبباسیەکان بو و دەکەوتە نزیك وڵاتی فارس، بنیادنانی ئەم شارە لەگەڵ خواستی عەبباسیەکان بۆ پارێزگاری کردن بە دەسەڵات و ڕزگار بون لە تالیبیەکان و گواستنەوەی بۆ قۆناغی فەرمانڕەوای عەبباسیدا دەگونجا[١]. هەروەها لەگەڵ پشت بەستن بەسیاسەتێك دەگونجا، کە ئامانجی دروستکردنی چەند هاوپەیمانێکی نوێی ناو کۆمەڵگەبو لەگەڵ چەنددەستەیەکی دەمارگیری نەتەوایەتی فرەڕۆشنبیریدا، لەکاتێکدا کۆمەڵگەی ئیسلامی لە قۆناغی گۆران لەڕێکخستنی هۆزایەتی بۆ ڕێکخستنی سەقامگیریدا بو بەئاراستەی بنیادنانی کۆمەڵگەیەکی تێکەل و وابەستە بەیەك، کە مەرجی سەقامگیری سیاسی و کۆمەڵایەتی تێدابێت[٢].

لە ڕووی پاڵنەری سەربازیەوە، مەڵبەندی دیمەشق دوور و نزیك لە ڕۆژئاوا بو و شیاوی دەوڵەتێك نەبو، کە لەدەریای سپی ناوەڕاستەوە بۆ ڕووباری سند درێژبوبێتەوە، بۆ عەبباسیەکانیش ڕەوا نەبو لەپشت شاخەکانی فارسەوە پایتەخت بۆ دەوڵەتەکەیان دابنێن، چونکە بەوە لە هەموو ناوچەکانی تر دوور دەبێت، وێرای ئەمەش هەرێمی عێراق ئەڵقەی پەیوەندی نێوان ڕۆژهەڵات وڕۆژئاوا بو، بەمەیش دەبوەهۆی پێکبەستنی ئەودوو ڕەگەزە سەرەکیەی، کە کۆمەلی ئیسلامیان لێ پێکهاتبو[٣].

پێگەی بەغداد لە ڕووی سەربازییەوە تایبەتمەندی پتەو قایمی و لەباری هەیە و تەنها بە پرد و پلکانە دەتوانیت بگەیتە ئەوێ، ئەگەر پرد و پلکانەکان نەمان دوژمن ناتوانێت بگاتە ئەوێ، ڕووباری دیجلە و فوراتیش چەند شوورا وخەندەقێکی سووشتیان پێکدەهێنا، هەروەك ئەو پێگەیە لە ناوچە سنووریە بیزەنتیەکان دوور بو، ئەمەش وایدەکرد ئەو ناوچە لە شالاوی بیزەنتیەکان دوور و پارێزراو بێت[٤].

---

١ـ مؤلف مجهول: أخبار الدولة العباسية ص ١٦٥.

٢ـ فاروق عمر: طبيعة الدعوة العباسية، ص٢٧.

٣ـ دائرة المعارف الأسلامية: ج٤ ص٦.

٤ـ ئیمپراتۆری بیزەنتی زمسکیس لە ساڵی (٩٧٤ز)دا هەوڵیدا بۆ ڕووخاندنی خیلافەتی عەباسی بگاتە بەغداد، لاوازی دەسەڵاتی ئیسلامی لە ژێر سایەی دەسەڵاتی خەلیفە موتیعی

هەروەها پیشەی سەربازی شارە ئیسلامیەکان لەو ڕوانگەی ببنە سەربازگەیەك و لەوێوە هەڵمەتی فراوان خوازی سەربازی ئەنجام بدەن، گەشەی سەند، بە تایبەت کە موسڵمان لە سەرەتای فتوحاتەکاندا لە چەند سەربازگەیکی دەرەوەی شارەکاندا لە دوای بەشارکردنی چوونە سەربازگەی سەربازان، ئەمەش لە پارێزگاریکردن لە سەربازگەیەکی دیار و ئاشاکرا ئاسانتر بو.

دیاردەی سەربازی لە شێوەی بنیادنان و ڕێگەی قایم و قۆڵکردنی بەغداد بەڕوونی دەردەکەوێت، شارەکە بە دوو شوراو چەند خەندەقێك چواردەور درابو و خەندەقێکی دەرەکیش، کە پانیەکەی شەش مەتر بو ئاوی پێدا تێدەپەڕی بە ئامانجی ئەوەی لە هەموو لاوە ئاو چوار دەوری شارەکە بدرێت، تاوەك دوورگەی لێبێت گەمارۆ درابو.چوار دەرگاکەی شاریش بە چەند دالآنێکی گەورە قایم کرابون، کە لەدەرگا دەرکیەکان دوور بون. بەو سازدانە ئەندازیارییە شارەکە توانایەکی بەرگریکاری بەدەستهێنا، کاتێ دوژمن بیویستایە بچێتە ناو شارەکە، ناچار دەبو بەرەو چەپ بچێت تا لەدەروازەی دووەمەوە بچێتە ژوورەوە، ئەمە وایدەکرد لای ڕاستیان بەدیار بکەوێت و تیرباران بکرێن[١]. وێرای ئەمەش تواناکانی پیشەی سەربازی بەپێی قەبارەی شارەکەبو وبەمەیش هاوسەنگیەك لەنێوان ڕووبەری شارەکەداو ژمارەی بەرگریکارەکانیدا دەبو، ئەمەش ڕاڤەی ئەوە دەکات کە

---

عەبباسیدا ئیمپراتۆری هاندا تاهێرش بکاتە سەر ناوچەی جزیرە و دەستی بەسەر داگرت و گەیشتە دەوروبەری ئیمارەتی موسڵ و ئیتر لەگەڵ بەغداد ماوەیەکی دوور نەبو، کەجیایان بکاتەوە وسوپای بیزەنتی دەیتوانی لە ئامادەوە بە درێژایی ڕووباری دیجلە بەرەو بەغداد دابەزێت، لەگەڵ ئەمەشدا لەبەر چەند هۆکارێکی نەزانراو ئەو ئامانجە بەدی نەهات، پێدەچێ لەبەر ئەو برسێتی ووشکیە بێت، کە سوپای بیزەنتی لەکاتی کشانیدا تووشی بوە، یان ئەو ماوە فراوانەی ناوچە لمکارەی کە وایکرد پاشەکشە بکەن و لە بەدیهێنانی ئامانجەکەیان بوەستن. سەبارەت بەو شالاوە بگەڕێرەوە بۆ:

Schlumberger: L'Epopee Byzantine a la fin du Dixieme siecie, Tom Ipp ٢٥٨ — ٢٦٠.

١ـ طاهر العميد: المظاهر العسكرية في بناء بغداد المدۆورة. مجلة كلية الأداب، بغداد ١٩٦٩. العدد ١٢ ص٣٠٣ـ ٣١١.

شارەکە بە شێوەیەکی بازنەیی دروست کراوە، چونکە ڕووبەری بازنەییەکە لە ڕووبەری شێوەی چوار گۆشەیی لەیەك خاکدا کەمترە[1]، هەروەك دەبێتە هۆی بونی مەڵبەندێك لە چەند بەشێکی یەکسانی بەشەکانی بازنەکەدا، ئەمەش ئاماژە بە سووربونی مەنسوور لەسەریەکسانی نێوان کارمەندەکانی نیشان دەدات، هەروەك هەموو بەشەکانی هەواو خۆریان بەردەکەوت.

لە ڕووی پاڵنەری ئابورییەوە عەبباسیەکان لە مەککە، یان مەدینە سەقامگیر نەبون، چونکە حیجاز بەشێکی هەژاربو و لەگەڵ پایەی فرە ناوچەی دەوڵەتی ئیسلامی و فراوانخوازی و گەشەسەندندا نەدەگونجا.

ڕێگەی بەغداد دەکەوێتە دۆلی ڕافیدەین لەسەر بەرەی ڕۆژئاوای ڕووباری دیجلە لە بەرزترین شوێنی، کە ئەو ڕووبارە تیایدا بە ڕووباری (سورات) دەگات، ئەمە تایبەتمەندی ئەوەی هەیە کە پەیوەندی نێوان وڵاتی شام و وڵاتی فارسە، هەروەك گرنگی ئابوری خۆی وەك مەڵبەندێکی بازرگانی هەیە،چونکە کەوتووەتە سەرڕێگە و ڕێرەوە ئاوی ووشکانی و دەریاییە پەیوەستیەکان بە ناوچەکانی تری دەوڵەت، بەمەیش لە شام وجەزیرە ومیسر وهیند وسەند وبەسرەو واسیت و ئەرمیناو ئازەربایجانەوە لەڕێگەی ڕووباری دیجلە وفورات ولقەکانیانەوە شمەك وفریاگوزاری بۆدەهات، ڕێگەی ژیانی وپاکی هەواو بونی خۆراکی تێدایە، هەروەك ناوچەکە لە ڕووی کشتوکاڵەوە گەشەسەند و ڕازایەوە وپەیوەست بەچەند جۆگەیەکی تەواو ڕێکخراوی ڕەی بو.

لە ڕووی پاڵنەری سروشتیەوە مەنسوور چەند گەریدەیەکی نارد تاشوێنێکی لەباری بۆهەڵبژێرن تاپایتەختی خۆی تێدا بنیاد بنێت، ئەوانیش ناوچەیەکی نزیك لە (بارما) لەباشووری موسڵیان هەڵبژارد، ئەویش بەکۆمەڵێ لەپیاوەکانی خۆیەوە چوو بۆ ئەوەێ و شەو مایەوە کاتێ بەیانی هات پرسیاری لە پیاوەکانی کرد ئەرێ ئەم شوێنە چۆنە؟ ئەوانیش باسی خۆشی هەواکەی و بونی خۆراکیان تێدا کرد، بەڵام خەلیفە تێبینی ئەوەی کرد شوێنی هاوڵاتیانی تێدا نابێتەوەو شوێنێکی تری

---

١ـ سامح، كمال الدين: العمارة في صدر الأسلام، ص٥٦ـ ٥٧.

بۆ باس کردن، کە لە کاتی تێپەڕینی بۆ(بارما) پیادا تێپەر بوبو، بۆیە لەگەڵ پیاوەکانیدا گەڕایەوە و شەو ڕۆژێك لەویٚ بون، ئەو کات وەرزی هاوین بو، مەنسوور سەرسامی ئاو و هەواکەی بو وبەو شوێنەی زانی کە لەگەڵ و خواستەکانیدا بگونجێت[1]. مەنسوور حەزیکرد ڕای خەڵکی ئەوناوچەیە بزانێت، بۆیە بانگی کردن و لە بارەیەوە پرسیاری لێکردن ئایا گەرماو سەرماو باران....هتد چۆنە، هەریەکە لەوانیش بەپێی زانیاری خۆی وەلامیان دایەوە، هەروەك پرسیاری لە یەکیٚ لە دیهقانەکان کە خاوەنی باخ و بێستان بو کرد، ئەویش ئەو شوێنەی پیٚ باش بو تا خەلیفە لەویٚ سەقامگیر بێت لە بەر ئەوەی لە نێوان چوار ناوچە دایە و لە هەرێمە دراوسێکانەوە فریاگوزاری و شمەکی بۆ دێت، هەروەك مەنسوور لەقەشەکانی دێرەکانی ئەو ناوچەیەوە زانی کە بەشێوەیەکی گشتی ئەو شوێنە گەرمایەکی ناوەندی هەیە[2].

هەروەها پێگەی بەغداد چەند تایبەتمەندیەکی کەش وهەوایی هەبو، لەوانە کەمی شیٚ لەگەڵ ئەوەی گەرمی و وشکیەکی باڵای هەیە، ئەمەش وایکردووە ئاووهەوای لە ئاووهەوای ناوچە کەناراوەکانی ناوچەکە باشتربێت، چونکە ناوچەکە گەرمایەکی ناوەندی هەبو، بەڵام شێداریەکی زۆری هەیە.

لەپێش هاتنی ئیسلام لە شوێنی بەغداد کۆشکێکی ساسانی و پردێکی کەشتیوانی لەسەر دیجلە هەبو[3]، هەروەها چەند گوندێکی بچووکی پەرشوبلاوی مەسیحی لەبەرەی ڕۆژئاوای ڕووبارەکە، کە بەدەوری بەغداد دا هەبون و دێری مەسیحیە نستوریەکانی تێدا بون[4]، ڕای ڕاستتر ئەوەیە کە لەویٚ ناوچەیەك هەبو کۆمەڵیٚ بازاری وەرزی تێدابو و بازرگانان لەویٚ کۆدەبونەوە[5]، کۆمەڵیٚ وێنە و

---

١ـ العموي، ياقوت: معجم البلدان: ج١ ص٤٥٨.

٢ـ الطبري: ج٧ ص٦١٦ـ ٦١٧.

٣ـ الخازي، وليم: الحضارة العباسية، ص٤١

٤ـ الطبري: ج٧ ص٦١٦ـ ٦١٧.

٥ـ الخطيب البعدادي: ج١ ص٢٥ـ ٢٦.

نووسینی ئاشووریش هەیە،کە بەڵگەی ئەوەی[١] هەروەك چەند پارچە خشتێك هەن و ناوی (بختنصری دووەم)یان لەسەر نووسراوە[٢].

نووسەران وا دەگێرنەوە[٣] کە مەنسوور شارەکەی خۆی لەناوچەیەکی بێ دانشتواندا بنیادنەنا، بەڵکوبەغداد لە ناوچەیەکی وادا بنیادنرا کە گوندی تێدا بو، ناوی چەند گوندێکی مەسیحیشیان هێناوە کە لە بنەڕەتدا ساسانی بون و بەرەبەرە لەگەڵ ناوچەکانی سەر بە پایتەختی عەبباسی تێکەل بون، بەغدادیش گرنگترینی ئەو گوندانە بو، ڕای ڕاستتر ئەوەیە ئەو گوندە ئەو شارە بازنەیە دەگرێتەوە کە مەنسوور دروستی کردو دواتر بو بەبنەڕەتی پایتەختی نوێی عەبباسی، بەڵکو بەغداد ناوی خۆی لەو گوندەوە وەرگرتووە[٤].

بەڕای زیاتر ناوی بەغداد لە ووشەیەکی فارسی پێکهاتووە لە دوو ووشە پێکهاتووە، باغ وداد، واتە بەخششی خوا. مێژوونووس و جوگرافیناسە عەرەبەکان کۆمەڵێ پێکهاتەی ووشە بۆ ئەو ناوە باس دەکەن[٥]، مەنسوور وەك نیشاندانی بە بەهەشتی ناوبراوە ناوی ناوە شاری (السلام)یان لەبەر ئەوەی ڕووباری دیجلەی تێدایە پێی وتراوە دۆلی سەلام[٦]، ئەمەش ناوی ڕەسمی بەغدادە کە لە بەڵگەنامە و لەسەر دراو و پێوانەکان باسکراوە و تۆمارکراوە[٧].

مەنسوور لە ساڵی (١٤٥ك/٧٦٢ز) دا دەستی بەبنیادنانی پایتەختەکەی کرد هەزاران ئیشکەر وێڕای تایبەتمەندانی وەك پیشەگەر و دارتاش و ئاسنگەر و چاڵهەلکەن بەکارهێنا و لە ناوچەکانەوە هێنانی بۆ ئەوەیٚ ژمارەیەك لەو

---

١ـ العبادي: سەرچاوەی پێشوو، ص٥٥.

٢ـ Encycl Britanica II p٢٣٤.

٣ـ بەجیا لە ئیستەخری کە باس لەوە دەکات ئەم شارە لە سەردەمی ئیسلامیدا دروستکراوە و پیشتر هیچ بینای تێدا نەبوە بگەڕێوە بۆ مسالك الممالك: ص٥٨.

٤ـ دائرة المعارف الأسلامية: ج٤ ص٥.

٥ـ الحموي: ج١ ص٤٥٦ـ ٤٥٧.

٦ـ الخطيب البغدادي: ج١ ص٥٨ـ ٦٢.

٧ـ دائرة المعارف الأسلامية: ج٤ ص٣.

ئەندازیارانەی لە بنیادنانی شارەکەدا بەشدارییانکرد سەرپەرشتی بنیادنانەکەیان کرد،بنیادنانی شارەکە نزیکەی چوار ساڵی برد و لەساڵی(١٤٩ك/٧٦٦ز)دا تەواو بو.

ئەو نەخشەیەی مەنسوور بەکاریهێنا بەداهێنان و گرنگ دادەنرێت، ئەو شارەکەی بەبازنەی دروست کردو شووڕای دوانی کە دوو ئەڵقەی یەك لەدوای یەك پێکەوەی دەبەستن چواردەوریان دابو، ئەمەش لە هونەری بنیادنانی شارە ئیسلامیەکاندا ئاڕاستەیەکی نوێیە[1] ئەمەش بەبنیادنانی هەندێ شاری کۆنی فارسی وەك هەمەدان کاریگەربوە.

شاری بەغداد لەسەر شێوەی قەڵایەکی گەورە دامەزراولەسێ ڕەگەزی بیناسازی سەرەکی پێکهات، کە بریتین لە: سەنگەرگیری، شورادەرەکیەکان پاشان ناوچەی نیشتەجێ ناوخۆیی لە ناوەڕاستی شارەکەشیدا کۆشکی خەلیفە ومزگەوت و کۆشکی منداڵەکانی و دیوانەکانی حکومەت هەبون[2]، ڕێگە بەکەس نەدەدرا لە ناوخۆی شاری ناوخۆییدا جگە لەخەلیفە کەسی تر سواری ئەسپ یان هەر وڵاخێکی تر ببێت، هەرکەسیش بیویستایە پێی بوایە دەبو لە کاتی چوونە ناو شارە ناوخۆییەکەوە بەپێ بڕوات، جگە لە مەهدی و داودی کوڕی عەلی مامی مەنسوور کە لەبەر نەخۆشیەکەی ڕێگەی پێدرا بو تا لەسەردەستە بەرەیەك هەڵبگیرێت[3].

کاتێ مەنسوور لە بنیادنانی بەغداد بویەوە، پارچە زەوی لە نزیك دەرگاکانی شار لەدەرەوەی شارەکەدا بۆ کەسوکاری خۆی و بۆ ناودارانی دەوڵەتەکەی بڕیەوەو ڕێگەی بە سەربازەکانیشی داتا لەسەر پەچەو گەوڕەکان ماڵەکانی خۆیان بنیادبنێن[4] ئەمەش بەو خواستەی لەلایەکەوە فشار لەسەر شارەکە کەم بکات و لە لایەکی ترەوە وەك دەستگرۆی کردنیان بۆ ئەو خزمەتگوزارییە گەورە و چاکانەی پێشکەشیان کردون، بە پەلە ئەم پارچە زەویانە کران بە خانوو دانیشتوان چوونە ناوی و هەموو ناوچەیەك بەناوی پیاوێك یان ئەو خێڵەی تێدا نیشتەجێبو ناونرا.

---

١ـ العبادي: ص٥٦.

٢ـ سعد، فهمي: العانة في بغداد، ص٢٧.

٣ـ الخطيب البغدادي: ج١ ص٧٧.

٤ـ البلاذري: ص٤١٤ـ ٤١٥.

کاریگەری فارس لە نەخشەڕێژی شارەکەدا دەردەکەوێت، بەوەی خەلیفە لە هاولاتیان جیاکرایەوە وپایەیەکی بەرزی وای بۆ دانرا کە بەسەختی هاولاتیان دەگەیشتنە لای، هەروەك گەورەی کۆشکەکە شانوشکۆی پاشانیشان دەدات، پشان بیرۆکەی خڕی وبەرتەسك کردنی ماڵی هاولاتیان لە چەند ناوچەیەکی جیادا وایدەکرد بە شەو دابخرێت وبەوردی چاودێری و پاسەوانی بکرێت، ئەمە ئاماژە بەدەسەلاتی ڕەهای کاریگەر بەفارس دەکات، کە لەگەڵ نەرم ونیانی ئیسلام و ڕەفتارو ئاکاری ئومەویەکاندا نەدەگونجا [١].

لە ساڵی(١٥١ك/٧٦٨ز)دا مەنسوور شاری ڕەسافەیان بەغدادی ڕۆژهەلاتی بۆمەهدی کوڕی لەسەربەرەی ڕۆژهەلاتی دیجلە و لە بەرامبەر بەغدادی ڕۆژئاوادا بنیادنا و شارەکە بەناوی (سەربازگەی مەهدی) ناسرا.

هۆکاری ستراتیژی وایکرد تا سەرلەنوێ بنیاد بنرێت و مەهدی لەوێ سەربازەکانی دانا تائەوەی لە دەرەوەی شاردایە ببێتە پالپشتێك بۆ سەرکوتکردنی ئەو ئاژاوانەی، کە لە ناوخۆی شارەکەدا هەڵدەگیرسێن [٢].

خەلیفە زانیویەتی بە بنیادنانی بەغداد و لەوێ نیشتەجێبونی تەواو لەخۆی دلنیانیە و ڕەسافەی بە شوورە و مەیدان و باخ و بێستان ئامادەسازی کردووە و ئاوی بۆ ڕاکێشاوە و بەسێ پرد لەسەر ڕووباری دیجلە و شارەکەی پێکەوە بەستۆتەوە و پارچەی زەوی ڕەسافەی بە سەرکردەکان داوە، [٣]بە پەلە ڕەسافە بنیادنرا تا لە فراوانیدا گەیشتە نزیکی بەغداد، بنیادنانی ڕەسافە لە ساڵی(١٥٩ك/٧٧٦ز)و لەسەردەمی خەلیفە مەهدیدا کۆتایی پێهات.

---

١ـ الدوري، عبدالعزيز: العمر العباسي الأول، ص٧٧.

٢ـ سعد: سەرچاوەی پێشوو، ص٣١.

٣ـ الخطيب البغدادي: ج١ ص٨٢.

# جێگیرایەتی ـ مردنی مەنسوور

لەو ڕووداوە کاریگەرانەی لە سەردەمی مەنسووردا ڕوویاندا ئەوەبو عیسای کوڕی موسای برازای خۆی لەجێگیرایەتی لابرد و بەیعەتی بە مەهدی کوڕی خۆیدا، ئەمە لەکاتێکدا عیسای برازای چەندین جاردەسەلاتەکەی مەنسووری ڕزگار کردبو، خەلیفە هەر لەسەرەتای دەسەلاتیەوە بیری لەلابردنی برازاکەی کردبویەوە، تەبەری باس لەوەدەکات، مەنسوور عیسای کوڕی موسای نارد تا لەگەڵ عەلەویەکاندا بجەنگێ ونیازی وابو ویان لە دەستی عیسا ڕزگاری ببێت وخیلافەت بگوازێتەوە بۆ موهدی کوڕی یان لەموحەممەد نەفسوزەکیە و ئیبراهیمی برای ڕزگاری ببێت، وتی: (گوێم لێنیە کامیان ئەویتر بکوژێت)[1].

بەلام گەورە پیاوانی دەوڵەت لە سەردەمی ژیانی سەففاحدا، سوێندیان لە سەر بەیعەتدان بە عیسا کوڕی موسا خواردبو، ئەو سوێند هەڵوەشاندنەوەیشیان لە سەر ئاسان نەبو، هیچیش وای نەدەکرد ئەوان لەوە ڕزگاریان ببێت مەگەر ئەوەی عیسای کوڕی موسای بەخۆی پەشەکشە بکات و واز لە جێگیرایەتی بهێنێت، عیسایش حەزی بە وازهێنان نەدەکرد، ئەمەوای لە مەنسوورکرد تا پێناوی ترساندن وموژدەپێدان بەکاربهێنێ تاناچاریکرد وازبهێنێ ولەساڵی (١٤٧ك/٧٦٤ز) دا بەیعەتی بە مەهدی دا[2] و جێگیرایەتی بۆ مەهدی بو، ئینجا دوای ئەو بۆ عیسای کوڕی موسا دەبێت.

مەنسوور پەلەی کرد وخەڵکی ماندا تابەیعەت بەمەهدی بدەن، وەسیەتی بۆکرد، لەم وەسیەتەدا ئەم سیاستە پێگەیشتوە نیشان دەدات، کە دەبێ بەرامبەر هاوڵاتیان ئەنجامی بدات، ئەو هانیدا تا بەرامبەر هاوڵاتیان نەرم و نیان بێت و ئاگاداریان بێت و لەناویاندا دادپەروەری بڵاوبکاتەوە و بە ڕەفتار و ژیانی پاك و چاك خۆی لە خوای گەورە نزیك بکاتەوە و ڕێزی زانایان و ئایینداران بگرێت و زەوی

---

١ـ الطبري: ج٧ ص٥٧٧.

٢ـ إبن الطقطقا: ض١٧٢ـ ١٧٣.

ئـاوەدان بکاتــەوە، تاخــەراج ســووك ببێــت وئیــسلام بڵاوبکاتــەوە ولــەپێناو بەرزکردنەوەی پەیامی خودا جیهاد بکات [١].

مەنسوور لـە شـەوی شـەممە (یـەکی ذیلحەجـەی سـاڵی ١٥٨ك/ مـانگی تـشرینی یەکــەمی ســاڵی ٧٧٥ز)دا مــرد. ئــەو هــاواری گــەدەی دەکــرد، ئنجــا چــوو بــۆ بەجێگەیاندنی فەرزی حەج، لە رێگەدا بەدەست ئازاری سەختەوە دەینالآند، هەرکە گەیـشتە بیئــری مــەیمون لــە دووری شــەش رۆژ لــە مەککــە لــە بەرەبەیانــدا لــە چادرەکەیدا کۆچی دوایی کرد [٢].

---

١ـ بۆ دەقی وەسیەتەکە بگەڕێرەوە بۆ الطبري: ج ص١٠٢ــ ١٠٧.

٢ـ هەمان سەرچاوە: ص٦٠.

# بەشی سێیەم

## موحەممەدی مەهدی ــ موحەممەدی مووسای هادی

### ئەبوعەبدوڵلا موحەممەدی مەهدی (١٥٨ــ١٦٩ك/٧٧٥ــ٧٨٥ز)

* ناساندنی مەهدی: ناوی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەبباسە، ئەبوعەبدوڵلای مەهدییەلە حومەیمە لە خاکی شورات لە ساڵی(١٢٦ك/٧٤٤ز) لە دایك بوە و دایکی ئەڕوای کچی مەنسووری حەمیدییە [1] لە بەیتولخەلیفە گەورەبوە مەنسوور گرنگی بەڕۆشنبیرکردنی داوە و بردوویەتیە لای موفەززەلی زەببی، ئەویش حەزی لەزانست و ئەدەب بو، کاتێ گەیشتە تەمەنی پانزە ساڵی، مەنسوور کەوتە گرنگی پێدانی بۆ پایەی خیلافەت ولەسەر جەنگ وکارگێری ڕایهێنا بۆیە ناردی بۆ چەند ئەرکێکی سەربازی، هەروەك لە کۆمەڵێ پایەی کارگێریدا داینا و لە ساڵی (١٤٧ك/٧٦٤ ز)دا وەك (ولي العهد) جێگیری خۆی دەست نیشانیکرد.

مەهدیلەگەڵ ڕەیتەی کچی سەففاح هاوسەرگیری کرد،مەهدی سیفەتی بەڕێزی و نەرم ونیانی وژیری و وریایی هەبو، لە کاتی ترسدا بێ ئاگانەدەبو کاری بێ متمانەی ئەنجام نەدەدا، زۆر سەردانی خزم و کەسوکاری دەکرد، بەرامبەر کەسوکار وخێزانی خۆی باش بو، نەرم و نیان بو، بەرامبەر ملهوڕان وزندیقان توند بو، گوێی لە ستەملێکراوی خەڵك دەگرت [2]. لە دوای مردنی خەلیفە بەیعەتی خیلافی پێدرا، ئەو کات تەمەنی(٣٣) سی و سێ ساڵ بو [3].

---

١ـ إبن كثير: ج١٠ ص١٥١.

٢ـالمسعودي: التنبية والأشراف: ص٢٩٧، إبن الطقطقا: ص ١٧٩.

٣ـ الكبري: ج٨ ص١١٠ــ ١١٤.

# بارودۆخی ناوخۆیی لە سەردەمی مەهدیدا

چاکسازییەکانی مەهدی: خیلافەتی مەهدی کەنزیکەی (دە) ساڵی خایاند، بە ماوەی گواستنەوەی نێوان سەردەمی توندوتیژی و سەرکوت کردنی سەردەمی خەلیفە عەبباسیەکانی پێش خۆی وسەردەمی ناوەندی ونەرم ونیانی ڕۆژانی خۆی و دوای خۆشیی دادەنرێت، وەك مەنسوور لە وەسیەتەکەیدا بۆ مەهدی کوڕی دەیلێت خەڵکی سێ جۆرن: (هەژارانێك تەنها دەوڵەمەندی تۆیان دەوێت، ترسنۆکانێك تەنها پەنا و پاراستنی تۆیان دەوێت، دیلکراوێك تەنها ڕزگار بون لە دەستی تۆی دەوێت، دەی ئەگەر دەسەڵاتت وەرگرت، چێژی خۆشگوزەرانییان پێبدە و تەواویش دەستیان بۆ درێژ مەکە)[1]. بۆیە پێویست بو سیاسەتێکی نەرمی وا بگرێتەبەر کە چارەسەر و تیماری برین و دەروونەکان بکات و ڕێزی ئوممەت یەکبخات، سەردەمی مەهدی سەردەمی ئارامشی ناوخۆیی بو ئەمە دەرفەتی بۆ ئەنجامدانی چەند پرۆژەیەکی چاکسازی کردەوە.

مەهدی هەر لەسەرەتای خیلافەتەکەیەوە کەوتە ڕازیکردنی خەڵك و ئەوماڵ و سامانانەی گێرایەوە بۆخاوەنەکانیان، کە لە سەردەمی باوکیدادەستیان بەسەردا گیرابو، پاشان فرمانی ئازادکردنی دیلە سیاسیەکانی دەرکرد، بەتایبەت عەلەویەکان، ڕۆزی وپەیوەندی لەگەڵدا گێرانەوە، هەروەك وەزیرایەتی یەعقووبی کوڕی داود یارمەتیدا تازیاتر لەگەڵیاندا تێگەیشتنی هەبێت [2].

کاتێ لە ساڵی (١٦٠ك/٧٧٧ز)دا حەجی ماڵی خوای ئەنجامدا هەوڵیدا خەڵکی حیجاز ڕازی بکات، پێشتر مەنسوور لەبەر ئەوەی پاڵپشتی بزووتنەوەکەی موحەممەد نەفسوزەکیەیان کردبو بەتوندی هەڵسوکەوتی لەگەڵدا ئەنجامدان، مەهدی ماڵ و سامانێکی زۆری بەسەریاندا ڕژاند و دەرفەتی گێرانەوەی دانوو و

---

١ـ اليعقوبي: ج٢ ص٣٣٧.

٢ـ الطبري: ج٨ ص١١٨ـ ١١٩، ١٥٦.

دانەوێڵەی هاتووی شام و میسری پێدان، ئەمە لە دوای ئەوەی مەنسوور لە دوای بزووتنەوەکەی موحەممەدی نەفسوزەکیە لێی بڕیبون، کۆمەڵێ سەربازی حیجازیشی بۆ پاسەوانی تایبەتی خۆی هێنا و کەعبەی پیرۆز و مزگەوتی پێغەمبەری خوای لە مەدینە فراوان کرد [1].

هەوڵیدا هۆگری خەڵکی شام بەدەست بهێنێ وسەردانی دیمەشق و بەیتولمەقدەسی کرد وهەوڵیدا ناکۆکیە جیاوازە هۆزایەتیەکانی شام نەهێڵێ و ماڵ و سامانی بەسەردا ڕژاندن وڕێزی سەردانی منداڵەکانی مەسلەمەی کوڕی عەبدولمەلیکی گرت.

وێستگەی لەسەر ڕێگەی مەککە دامەزراند و ئەوەی سەففاح بونیادی نابو زیاتری کرد ئەو خانوانەی مەنسوور بنیادی نابون وەك خۆی بەجێهێشتن، حەوزیشی بنیادنا، کە لەبیر پڕدەکران، تا ئاوی کاروانەکان بدەن و پاسەوانی بۆ پاراستنی داناو سەرپەرشتی نەخۆشانی گولبون ودیلەکانی کرد تا تێکەڵ بە خەڵکی نەبن، خوێندنگە و نەخۆشخانەیشی دامەزراند [2]. پۆستەی نێوان مەککە ومەدینە ویەمەنی دانا وگرنگی بەکاروباری بازرگانی دا وتۆرێکی ڕێگە بازرگانیەکانی دامەزراند، بەغدادی کردە مەڵبەندێکی بازرگانی جیهانی، مۆسیقا وشیعر ودانایی وئەدەبیش لە دیمەنە دیارەکانی ئەم سەردەمە بون، خەلیفە سونەتێکی نوێی داهێنا بەو پێیەهەموو ساڵێك بەرگی نوێ دەدرا بەسەر کەعبەدا [3]، شارەکانی توند وتۆل ڕاگرت، بە تایبەت شاری ڕەسافە، کەسانی دەست پاك ودڵنیای لەهەرێمەکان دانا تاهەوڵی والیەکانی بۆ بهێنن، لە کۆڕی ستەملێکراواندا دادەنیشت وگوێی لەسکاڵای خەڵك دەگرت، ئەویەکەم خەلیفەی عەبباسی بو لە کۆڕی ستەملێکراواندا دانیشتبێ

---

١- إبن الأثير: ج٥ ص٥٧.

٢- هەمان سەرچاوە: ص٦٠.

٣- مەبەست بەسونەت داهێنان لە بارنە ئایینیەکەدا نیە کە بە(بدعة) ناودەبرێت، بەڵکو ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خواﷺ دگرێتەوە کە دەفەرموێت: (من سن في الأسلام سنة حسنة فله أجرها و أجر من عمله بها...) چونکە سەرچاوەی بڕیاری ئایین لە قورئان و فەرموودەی پێغەمبەرداﷺ براوەتەوە. وەرگێر

تا گوێیان لێبگرێت، سووربو لەسەر ئەوەی لە نێوانیاندا دادپەروەری بەرپا بکات، لە کاتی ڕوانین بۆ کێشە و سکاڵای خەڵك دادوەران هاوبەشییان لەگەڵدا دەکرد[١]. هێندە گرنگی بە بەرپاکردنی دادپەروەری دەدا تا مالێکی ئاسنینی بۆ دروست کرا[٢] وچی چیرۆك ـ نیشاندانی سکاڵاـ هەبون دەخرانە ئەویٚ ودواتر کۆدەکرانە تادەرفەتی پێشخستن و دواخستنی گوێگرتن لە سکاڵای خەڵکی هەبێت[٣].

لە ڕاستیدا مەهدی لە ڕوانگەی چاکسازییەکانیەوە واینیشاندا دەبیٚ ستەم وئەو مۆرکەی لەسەردەمی سەففاح و مەنسوور دژ بە ئومەوی عەلەویەکان کرا نەمێنیٚ، ئەمە لەگەڵ ئەوەی حەزی بەژیانی خۆشگوزەرانی دەکرد، بەڵام ئایینی ئیسلامی زۆر بە گەورە ڕادەگرت وحەزی بە شوێنکەوتنی سوننەت بو و لەسوننەت لاینەدەدا.

١ـ إبن الطقطقا: ص١٧٩.

٢ـ مەبەست پێی سندوقی پۆستەی ئەمڕۆیە. وەرگێر

٣ـ الخضري: الدولة العباسية، ص٨٨.

# بزووتنەوە دژ بە عەبباسیەکان لە سەردەمی مەهدیدا

## * بزووتنەوەکانی زندیقەکان:

هەر لەسەردەمی ئومەویەکان لەکۆمەڵگەی ئیسلامیدا دیاردەی زەندەقە بڵابویەوە و لەسەردەمی یەکەمی عەبباسیدا زیاتر گەشەی کرد، لەڕاستیدا لە بنەڕەتدا وشەی زەندەقە لە شوێنکەوتوانی ئایینە ئاگر پەرستەکانی وەك زەردەشتی و مانەوی دەنرا، دواتر پلە پلە گەشەیکرد وملهوڕان وگومانچیانی ناو ئایینی شوێنکەوتوانی یبن دیسان ومرقیەکان ومانی لە خۆگرت،[1] پاشان ئەو چەمکە فراوانتر بو و بزووتنەوەی شعوبیەتی گرتەوە، دوای ئەوە ئەو چەمکە چەند واتایەکی ئایینی - سیاسی گشتی هەبو ودەسەڵاتی عەبباسی بۆلێدانی نەیارە سیاسی یان ئاینیەکانی بەکاریدەهێنا و لە کۆتاییدا ئەو چەمکە لە هەندێ چەقاوە سوو و کەشخە و چالاك نرا.[2]

لە ڕاستیدا زەندەقە بزووتنەوەیەکی سیاسی بو، کە بەچوار چێوەیەکی ڕێکخراوی هزری ئایینی داپۆشرابو و شوێنکەوتووەکانی بۆ بڵاوکردنەوەی مەزهەبی مانەوی بەهەموو پێکهاتە بیروباوەریە ئایینی و کەلتووره هزریەکانیەوە،تاببێتە بەدیلێك بۆ کەلتووری ئیسلامی–عەرەبی پێدەچێ سیاسەت لە پشت بانگەوازی فەلسەفەگەراکاندا خۆی مۆڵدابێت، هەروەك پێدەچێ لە پشت دەست بەسەردا گرتن و فەرمانڕەوایی دەوڵەتدا خۆی مۆڵدابێت، چونکە زەندەقەکە بە پەردەی فەلسەفە خۆی دادەپۆشی، لەڕاستیدا لە لایەکەوە شۆرشێکی ئاگر پەرستی بو تا لە بنەڕەتەوە دەوڵەتی ئیسلامی لە ناوببات و لە شوێندا دەوڵەتی فارسی دابمەزرێنێت[3].

---

١ـ سەبارەت بەو بزووتنەوانە بگەڕێرەوە بۆ: النشار، علي سامي: نشأة الفكر الفلسفي في الأسلام: ج١ ص١٨٦ـ ١٩٧.

٢ـ عمر: التأريخ الأسلامي و فكر القرن العشرين، ص١١٣ـ ١١٤.

٣ـ العقاد، عباس محمود: التفكير فريضة إسلامية، ص٦٧.

شتێکی ڕوونە ئەوزەندەقەی ئێمە باسی دەکەین وجەختی لێدەکەینەوە بزووتنەوەی مانەوییەکە لەدوای فەتحی ئیسلامی لە عێراق وهەرێمە فاسیەکاندا سەرلەنوێ بوژایەوە، هۆکاری ئەودیاردەیش لەکۆمەڵگەی ئیسلامی لەسەردەمی عەبباسیدا بونی ئەو ئازادیە ئایینیە بو کە خاوەن ئایینەکان لە دوای فەتحیەوە لێیان قەدەغە بو ئەوئایینەیان نیشان بدەن، ئەمەش بوە هۆی جۆرێك لە ململانێ بیروهزر وڕا وبۆچوونەکانی ناو کۆمەڵگە و لە ئەنجامدا چەند کۆمەڵێکی هزری و بیریارانی فارسی دەرکەوتن و کەوتنە ڕەواج پێدانی ژیاری ساسانی و هاو وێنای ئەو ژیارە و بانگەوازیان بۆ جێبەجێ کردنی ڕێکخستن و بەهاکانی ئەو ژیارەیان لە کۆمەڵگە و کارگێری کۆشکدا دەکرد بەو پێیەی بیێتە بەدیلی ژیارو ڕێکخستنە ئیسلامیەکان [١]. بەتایبەت ئەوانە هەستیان بەوەکرد کە گواستنەوەی خیلافەت لەئومەویەکانەوە بۆ عەبباسیەکان ئامانجی بەدیهێنانی حوکمەتێکی فارسی لە دیاردە و ناوەرۆك و دەسەڵات و زمان و بیروباوەڕی ئایینیدا بۆ بەدینەهێنان، پێیان وابو تا ئیسلام لەدەسەڵاتدا بمێنێتەوە ئەمەیات بۆبەدی نایەت، بۆیە کەوتنە بڵاوکردنەوەی ئایینی مانەوی لە ناو کۆمەڵگەی ئیسلامیدا و زیندووکردنەوەی کلتوری کۆنی مانەوی ـ فارسی، ئەمەش لە ڕێگەی بڵاوکردنەوەی کتێبە کۆنەکان و بە عەرەبی کردنی نووسینە فارسیەکان، بەو ئامانجەی ڕۆشنبیری و هزری مانەوی شوێنی ڕۆشنبیری و هزری ئیسلامی بگرێتەوە، [٢] خەلیفە عەبباسیەکان هەستیان بەو مەترسیە کردبو، کە بەهۆی بڵاوبونەوەی بیرو ڕێبازی زەندەقەوە تووشی ئایین و دەوڵەتیان دەبێت، بۆیە بڕیاری لە ناوبردنی ئەو بانگەوازە لادەر و مونحەریفان دا و مەنسوور وەسیەتی بۆمەهدی کوڕی کرد تا لەگەڵیاندا بجەنگێت.

خەلیفە مەهدیش گرنگی بەکێشەی زەندەقەکان دا و لەهەموو ناوچە و ئاسۆکانەوە بەچەند هەڵمەتێکی ڕێکخراو کەوتە شوێنیان وخۆی گەیاندە لایان و بەخۆراگرانە کەوتە کوشتنیان [٣]، دیوانێکی تایبەت بەوانیشی داناوناوی نا(دیوانی

---

١ـ عمر: ص١١٩.

٢ـ عمر: ص١١٨ــ ١١٩.

٣ـ إبن کثیر: ج١٠ ص١٤٩.

زەندەقە) و کارمەندێکی تایبەتی لەسەردانا کە ئەویش (بەرپرسی زەندەقەکان) بو،[١] هەروەك فرمانی بەموتەکەلیمین (ئەهلی کەلام) کرد تا لە چوار چێوەی نەخشەیەکی هزریدا وەڵامیان بدنەوە وکتێب بنووسن و شێوە هزریەکانیان ئاشکرا بکەن[٢].

توندی و سووربونی مەهدی وکەوتنە شوێنیان بە ڕوونی لە وەسیەتیدا بۆهادی کوڕی دەردەکەوێت[٣].

بێگومان مەهدی بۆ شوێنکەوتنی زەندەقەکان دوو هۆکار پاڵی پێوەنا:

یەکەم: ئاینی، بەو پێیەی ڕێبازی فرەخوداییان داواکاریە شەرعیەکانی هەڵدەوەشاندەوە ولێکدانەوەی ئەوان بۆدەقەکانی قورئان و فەرموودە لەگەڵ واتای سروشتی خۆیدا پێچەوانە و دژ بە بنەڕەتەکانی بیروباوەڕ بو، ئەمەش مەترسیەکی سەختی بۆسەر بیروباوەڕی ئیسلامی پێکدەهێنا.

دووەم: سیاسی، چونکە پەیوەندی زیادەڕەویەکانی نێوان عەبباسیەکان ونێوان ڕەگەزە فارسیەکان گەشەیان کردبو وبە ئاڕاستەی تەنگەژەیی هەنگاویان دەنا.

---

١ـ الجهشياري: ص١٦٥.

٢ـ عمر: ص١١٩ـ ١٢٢.

٣ـ بۆ دەقی وەسیەتەکە بگەڕێرەوە بۆ الطبري: ج٨ ص٢٢٠.

# بزووتنەوەکەی موقەننەع[١] (١٥٩ــ١٦١ك/٧٧٦ــ٧٧٨ز)

شەپۆلی ملهوڕی لەسەردەمی مەهدیدا بەردەوام چالاك بو، جا لەدوای ئەو بزووتنەوانەی لەڕووی مەنسووردا دەرکەوتن، لەسەردەمی مەهدیدا چەندبزووتنەوەیەکی تربەهەمان ئامانج دەرکەوتن، لەنێوان ئەوانەدا بزووتنەوەیەکی موقەننەعی خوراسانی کەلە ناوچەی (مەرو) دەرچوو و بانگەوازی خوایەتی دەکرد و بزووتنەوەکەی جەختی لەسەر حلولیەت[٢] و تەناسوخ دەکردەوە[٣].

بزووتنەوەکەی موقەننەع چەند ئامانجێکی سیاسی و ئاینی هەبو.

لەڕووی سیاسیەوە، ئەو بزووتنەوەیە خۆی پەیوەست بەسەرکردەی فارسی ئەبوموسلیمی خوراسانی کرد،ئەمەش درێژەدان بوبە هەردوو بزووتنەوەی سەنباژ و ڕاوەندی،[٤] هەروەك مۆرکی ڕەگەز پەرستی لەخۆگرتبو ئامانجی بنیادنانی قەوارەیەکی فارسی لەسەر حیسابی دەوڵەتی عەبباسی بو، بۆیە شوێنکەوتوانی ئەبوموسلیم پاڵپشتی موقەننەعیان کرد و لە بوخارا و سەعد سپیدر وشمەکان چوونە ژێر ئاڵاکەی وهەموو نەیارێکی نیزامی عەبباسی لە بزووتنەوەکەیدا بەشداری کرد[٥].

---

١ـ سەرکردەی بزووتنەوەکە ڕووپۆشێکی زێڕینی لەسەر دەم وچاوی دانا تا دەم و چاوی ناشرین وبێزاراوی دەرنەکەوێت، لای خەڵکی وا بانگەشەی دەکرد بۆیە ئەو ڕووپۆشەی داناوە تا ئەو زاتە خواییەی کە تیایدایە لە چاوی پیسی ئەوان بە دوور بگرێت. إبن الأثير:ج٥ ص٩٢.

٢ـ حلولیەت هاوار ئاوێزان و تێکەڵ بونی خودا و بەندە دەکات، واتە جیاوازی لە نێوانیاندا نامێنێ و هەرکام تێکەل بەویتر دەبن، هەر ئەم بیروباوەڕە بۆ گەنەیە دواتر دەبێتە بنەڕەت بۆ کەسانی وەك: حەللاجی گومڕا. وەرگێر

٣ـ موقەنەع باوەڕی وابو خوای گەورە ئادەمی دروست کردووەو خۆی چووەتە شێوەی ئەوو گیانی ئادەم چوەتە ناوپێغەمبەران تا گەیشتۆتە لای ئەبوموسلیم، لە دوای ئەبومەسلیم چووەتە جەستەی موقەننەعەوە , بگەڕێرەوە بۆ الشهرستاني: الملل و النحل ج١ ص١٥٤، إبن الأثير: ج٥ ص٥٢، إبن خلكان: ج٣ ص٦٢٣.

٤ـ العمرو: ص٣٤٢.

٥ـ إبن الأثير: ج٥ ص٥٢ـ ٥٣، الدوري: ص٩٣.

لە ڕووی ئایینیەوە، ڕێنمایی وزانیاریەکانی موقەننەع بە ڕێبازی خورەمی کاریگەر بون، ئەو ڕێنماییەکانی مەزدەکی زیندوو دەکردەوەو ئەرکی شەرعیەکانی لەکاردەخست، هاوکات بیرۆکەی تەناسوخی هەبو کە بانگەوازی بۆدەکرد، هەروەها بانگەوازی بۆ ڕووخانی پایەکانی ئایینی ئیسلامی دەکرد.

خەڵکێکی زۆر کەوتنە شوێن موقەننەع، بەتایبەت لە بوخارا و سەعد، شوێنکەوتووەکانیشی لە ناوچەی(کش) و (نەسف) بڵابونەوە و کەوتنە شاڵاو بردنە سەر ناوچە ئارامەکان، هەندێ لە سەرکردەعەبباسیەکان لەوانە سەعدی حەرشی، کە توانی بیانشکێنێت و لەناویان ببات، ڕێگرییان لێکردن، بەڵام موقەننەع لە پێش ئەوەی بگیرێت خۆی سووتاند [١].

**چەند بزووتنەوەیەکی جیاواز**

سەردەمی مەهدی چەندبزووتنەوەیەکی تری دژبەدەسەڵاتی عەبباسی بەخۆیەوەبینی، بەڵام شوێنەوارێکیان بەجێنەهێشت و خەلیفە بەبێ سەختێکی وا لەناویبردن، لەوانە: بزووتنەوەکەی یوسف بەرم لە خوراسان [٢] وبزووتنەوەکەی عەبدوڵڵای کوڕی موحەممەدی نومەوی لە ولاتی شام [٣] و بزووتنەوەی خەواریج بە سەرکردایەتی عەبدوسەلامی کوڕی هیشامی یەشکری [٤].

---

١ـ الطبري: ج٨ ص١٣٥، إبن الأثير: هەمان سەرچاوە، ص٥٨.

٢ـ الطبري: ج٨ ص١٢٤.

٣ـ سەرچاوەی پێشوو: ص١٣٥ـ ١٣٦.

٤ـ هەمان سەرچاوە: ص١٤٢.

# پەیوەندیە دەرەکیەکان لە سەردەمی مەهدیدا

## پەیوەندی لەگەڵ ئومەویەکان لە ئەندەلوس:

پەیوەندی خراپی نێوان خیلافەتی ڕۆژهەڵات لە بەغداد و نێوان خیلافەتی ڕۆژئاوا لە ئەدەلوس بەردەوام بو. لە ڕاستیدا مەهدی هەمان ڕێبازی باوکی گرتەبەر وهەوڵیدا ئەندەلوس بۆ پایتەختی دەوڵەتی عەبباسی بگێڕێتەوە، بەڵام دووری نێوان دوو دەوڵەتەکە وایکرد نەکرێت سوپای عەبباسی بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجە بنێردرێت، بەڵام مەهدی هەر بزووتنەوەیەکی هان دەدا کە ئامانجی لاواز کردنی قەڵەمڕەوی ئومەوی بوایە لەو وڵاتەدا.

لەو کاتەدا لەئەندەلوس چەند بزووتنەوەیەکی دژ بەدەسەڵاتی ئومەوی هەبون، کە بەربەرەکانی هەندێ جارلەئەنجامی شێوانی هۆگرییان بۆعەرەب وهەندێ جاربۆیەمەنەکان بەوپێیەی ئومەویەکان پشتیان بەقیسیەکان بەستبوەو بزوتنەوانەیان بەرپادەکرد.

جا لەساڵی(١٥٧ك/٧٧٤ز)دا والی بەرشەلونە وجیرەندە سولەیمانی کوڕی یەقزانی کەلبی ناسراوبە ئەعرابی کە هەوداری یەمەنی هەبو، لەگەڵ حوسەینی کوڕی یەحیای ئەنساری والی سەرەقوستەدا پیلانی کوشتن ولابردنی عەبدوڕەحمانیان دانا، عەبدوڕەحمانی کوڕی حەبیبی فەهریش، کە نازناوی سقلی بەسەردا بڕابو و والی وڵاتی مەغریب بودایە پاڵ ئەو دوانە، هەموویان لە لایەن مەهدییەوە هاندران و پاڵپشتی کران.

سولەیمان زانی ناتوانێ بەرامبەر بەئەمیری ئومەوی بوەستێت، بۆیە داوای یارمەتی دەرەکی کرد و پیلانەکەی دیدێکی سیاسی ترسناکی لە خۆگرت، چونکە لە ساڵی(١٦٠ك/٧٧٧ز)دا چەپیوەندی بەشارلەمانی کارۆلینجی لەبادربون کردو لەگەڵیدا ڕێککەوت تا هێرش بکاتە سەر ویلایەتەکانی باکووری ئەندەلوس و بەڵێنی پێدانە ئەو شارانەی بداتە دەست، کە دەیان گرێتە دەست، بەبێ ئەوەی ئەنجامی

یارمەتیدانی بێباوەڕان دژ بە ئیسلام و موسڵمانان لەبەر چاوبگرێت، حوسەینی کوڕی یەحیای ئەنساریش لەو هەنگاوەدا وەك ئەوی کرد. ئەم پەیوەندیانە لە کاتێکدا بەڕێوە دەچوون کە ئەمیری ئومەوی تاوی دابویە ملکەچ کردنی شۆرشێکی تری بەربەرەکان بە سەرکردایەتی فاتیمی [١].

لە ڕاستیدا شار لەمان بە هۆی دوو پاڵنەرەوە پێشوازی ئەو پرۆژەی کرد کە بۆ خرایە ڕوو:

یەکەم: ئەورووپی ـ مەسحی: ئەگەر شاڵاوەکە تەواو بێت بە یەکەم شاڵاوی هێرشبەری دادەنرێت کە کارۆلینجیەکان دژ بە موسڵمانان لە دوای زنجیرە هەڵمەتێکی موسڵمانان لەناخی خاکی فرەنجەکاندا بەجێیان گەیاند، ئەنجامی دەدەن، وێرای ئەوەی بەوەقەڵەمڕەوێکی گەورەی ئەدەبی لەجیهانی مەسیحیدا بەدەست دەخات و ڕکەبەرایەتی خۆی لەگەڵ ئیمپراتۆری دەوڵەتی بیزەنتیدا بەهێز و عیززەتمەند دەکات و پاڵپشتی هەوڵی سیاسی خۆی بۆ زیندوو کردنەوەی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی ڕۆژئاوا ودواتر دەست گرتن بەسەر ئەورووپادا دەکات.

دووەم: ڕقبونی لە ئیسلام وموسڵمانان: کۆمەڵێ ئامانج وهیوای هەبو تالەئیسپانیا دەریان بکات، بەتایبەت کە دەسەلاتیان لەباشووری فەرەنسادا لاواز بوبو، یان بەلایەنی کەمەوە پارێزگاری سنووری باشووری ولاتەکەی لەهەڕەشەی ئیسلامی لەسەربنەمای سیاسەتی هێرشبەری لەپێناو بەرگریکردندا بەجێبگەینێت، ئەو نەخشەیەی لەسەری ڕێککەوتبون ئەوە بوکە پاشای کارۆلینجی شاخەکانی برینیە تێپەڕێنێت وبەرەو شاری سەرقوستە بڕوات وئەعرابیش بیداتە دەستی، لە هەمان کاتدا عەبدوڕەحمانی فەهری لە مەغریبەوە بکشێت و هێرش بکاتە سەر کەناراوی ڕۆژهەلاتی ئەندەلوس وبە سوپایەکانیەوە لەمەرسیە دابەزێت، بەمەیش تەنگ بە عەبدوڕەحمانی داخل هەڵدەچنن ولەناوی دەبەن ودواتر ملکەچی ولات بۆ

---

١ـ لەبارەی بزووتنەوەکەی فاتیمی بگەڕێرەوە بۆ: عنان، محمد عنداللە: دولة الإسلام في الأندلس القسم الأول ص ١٦٤ـ١٦٧.

دەسەلاتی عەبباسی ڕادەگەیەنن[1].

تەقینەوەی شۆڕش لەباکووری ئیسپانیا دژ بەدەسەلاتی ئومەوی ئامـاژەی دەست پێکردنی جێبەجێ کردنی پیلانەکە بو، فەهری لە مەغریبەوە کەوتە ڕێ بە سوپایەکانیەوە لەسەر کەناراوی مەرسیە دابەزی، بەلام عەبدوڕەحمان لێی هەستاوله ناوی برد[2]، کاتێ سوپا کارۆلینجیەکان لەبەردەم شاری سەرەقوستەدا بەپێی پیلانە دانراوەکە کۆبونەوە، پیلان گێران هۆشیان بەخۆ هاتەوە وهەستیان بەومەترسیەکرد، کە تێیکەوتون، بۆیە ئەنساری ئامادەنەبو لەوەزیارترئەوپیلانە جێبەجێ بکات، بۆیە دەرگای شارەکەی لە ڕووی هێزە کارۆلینجیەکاندا داخست[3].

وێرای ئەم گەشەسەندنی هەلوێستە سیاسیانە هەوالی شۆڕش هەلگرساندنی سکسون لە ئەلمانیا گەیشتە شارلەمان و کە ئەو بۆشاییە سەربازیەی بەهۆی ئامادەنەبونی شارلەمانەوە ڕوویدابو بەهەندی وەرگرتبو، بۆیە ناچاربو واز لە پرۆژەکەی لە ئەندەلوس بهێنێت و لە سالی(١٦٣ك/٧٧٩ز)دا گەڕایەوە بۆ ولاتەکەی[4].

بەو جۆرە سەرلەنوێ بارودخەکان یارمەتی ئەمیر عەبدوڕەحمانی داخیلیان داو ئەو شالاوە گەوەی بەرەو ڕووی ولاتەکەی ببویەوە شکستی خوارد، هەروەك عەبباسیەکان لەگێرانەوی ئەندەلوس یان لاوازکردنی قەلەمڕەوی ئومەوی لە ئەندەلوسدا سەرکەوتوو نەبون.

---

١ـ العبادي: ص٣١٢.

٢ـ أخبار مجموعة: ص١١٠ــ ١١١.

٣ـ بيخون: ص٢١١.

٤ـ عنان: ص١٧٥ــ ١٧٦، دايڤز، كارل: شارلمان ص١٠١.

# پەیوەندی لەگەڵ بیزەنتیەکاندا

لەو ساڵەی مەهدی خیلافەتی گرتە دەست، لیۆی چوارەم کورسی دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی گرتە دەست، هەرلە سەرەتای دەسەڵاتیەوە بەڵگەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە پەیوەندی باشی دواتر سەرکەوتنی بۆبەدەست دەهێنێ، ئیمپراتۆر هەموو دیلە موسڵمانەکانی ئازاد کرد و خەلیفە مەهدیش هەمان هەڵوێستی لە ڕوودا نواند.[1]

بەڵام هەوڵی ئاشتەوایی نێوانیان بەسروشتی پەیوەندی مۆرکداری پێکدادانەوەلەنێوان هەردوو دەوڵەتە ململانێکەرەکەدا پێکیداداو سەقامگیری بارو دۆخەکان بەشێوەیەکی ڕێژەیی لە ناوخۆی ئیمپراتۆری بیزەنتی و سەر سنوورە دەرەکیەکانیدا دەرفەتی بە ئیمپراتۆر دا تا هەوڵی زیادکردنی ژمارەی هێزەکانی بدات، تا بەرەوڕووی هەڵمەتی موسڵمان بوەستێتەوە، هەروەك ئەو سەرکردە بە ئەزموون ولێهاتوانەی هێشتەوە، کەلەژێر دەسەڵاتی باوکیدا ئیشیان دەکرد.

ئیمپراتۆر ئەم بارودۆخانەی قۆستەوەولە ساڵی(١٥٩ك/٧٧٦ز)دا هێرشی کردە سەرسمیسات و هەندێ لە موسڵمانەکانی بەدیلگرت، بەڵام مەهدی یەکێ لە هەوادارەکانی خۆی نارد و شارەکەی ڕزگار کرد،[2] لە ڕاستیدا ئەو شاڵاوە ڕەنگدانەوەی واتای ڕوونی نیازی لیۆی چوارەمیە کە ئەویش بەردەوامی گرتنەبەری سیاسەتێکی دوژمنکاریە بەرامبەر موسڵمانان.

شاڵاو بردنە سەر سومەیسات خەلیفە مەهدی تووڕە کرد و بڕیاری بەر پەرچدانەوەی خێرای دا و سوپایەکی گەورەی بەسەرکردایەتی عەبباسی کوڕی موحەممەدی مامی نارد و سوپاکە ڕۆچوویە ناوخاکی بیزەنتی تا گەیشتە ئەنقەرە و قەڵای (کاس)ی لە کەبادۆکیە فەتح کرد[3].

---

1-Michel le Syrrienne: chroniaue.III p1.

٢ـ اليعقوبي: ج٣ ص٣٤٧.

٣ـ ئەو قەڵایە بەبنکەی تەموین (ئامادەسازی) دادەنرێت و چەند کۆگایەکی دانەوێڵەی دەگرتە خۆ کە موسڵمانان لە کاتی ڕۆچوونە ناو ئاسیای بچووك پێویستیان پێی بو. بگەڕێرەوە

گرنگی ئەو هەڵمەتە لەوەدایەکە ئامادە بونی بەهێزی ئیسلامی لەسەر زەویدا بەرامبەری ئامادەنەبونی بیزەنتی سەلماند، ئەم هێرشە بەڵگەی بەهێزی خیلافەتە، لەگەڵ ئەوەی خیلافەت بۆکوژاندنەوەی بزووتنەوەی نەیارەکان سەختی ناوخۆیی هاتەڕێی، دوای ئەوەچالاکی ئیسلامی وبیزەنتی بەردەوام سنووردار بوتا ئەوی لە نیوەی سالّی(١٦١ك/٧٧٨ز)دا چالاك بو و خەلیفە ئومامەی کوڕی وەلیدی سەرکردەی لێهاتوو ولێزانی خۆی بەسوپایەکی گەورەی ئیسلامیەوەناردو هێرشی بردە سەر(مەرحەب)و ناوچەکانی دەوروبەری(دابق) ل باکووری حەلەب [١].

ئیمپراتۆر بەرپەرچی ئەوشالاوەی دایەوەوسوپایەکی ناردوگەمارۆی مەرعەشی دایەوەوهێزێکی سەربازیشی یەکلاکردەوە تا لە ڕووی پێشڕەوی ئومامەدا بەئاڕاستەی حەدەپ بوەستێ ودەستی بەسەر هەندێ گوندی ناوچەکەداگرت، بەڵام سوپای بیزەنتی نەیتوانی بچێتە مەرعەش وسەرکردەکانی ئەوەیان پێ باش بو گەمارۆی لەسەر لاببەن و بگەڕێنەوە بۆ پایتەخت [٢].

هێرش بردنە سەرمەرعەش ڕەنگدانەوەی ئەو مەترسیانەی خەلیفە بو، کە لە بەرزیاد بونیمەترسی بیزەنتی ڕاڕایی دایگرتبو،دەبو ئەویش بونیخۆی بسەلمێنێ و سوپایەکی گەورەیش پێکهێنا وحەسەنی کوڕی قوحتەبەی کردە سەرکردەی سوپاکەو فرمانی پێکرد تا هێرش بباتەسەر وڵاتی بیزەنتیەکان، ئەو سەرکردە ڕۆچوویە ناوئەنادۆل ودوریلیدمی گەمارۆدا و شالاوی بردە سەر ناوچە سەر سنوور ودراوسێکان ولەعەمووریە نزیك بویەوە، پاشان بەهۆی کەمی فریاگوزاری وکەمی شمەك و پێویستیەوە لە ناوچەکە کشایەوە و هەڵمەتەکەی ئامانجێکی دیار و بە بەهای بەدەست نەهێنا، بەڵکوو جەختی لە بونی بەهێزی ئیسلامی لە ناوچەکەدا دەکردەوە [٣].

---

بۆ: الطبري ج٨ ص١١٦ کە تەنها ئاماژەی بەوەداوە عەبباسی شاری ڕۆم و مەنوورەی پێکەوە فەتح کردووە. Ramsay, w.m: The Historical Geography of Asia Minor: p35.

١ـ البلاذري: ص٢٦٧، إبن الأثير ج٥ ص٦٠.

٢ـ هەمان سەرچاوە: ص٢٦٧.

٣ـ تأريخ خليفة إبن خياط: ج٢ ص٤٦٧ـ ٤٦٨، الطبري: ج٨ ص١٤٢.

بیزەنتیەکان لە ساڵی (١٦٢ك/٧٧٨ز) دا چالاکی سەربازی خۆیان دەست پێ کرد و شاڵاویان بردە سەر(حەدەث) لە ساڵی داهاتوو بەرپەرچدانەوەی ئیسلامی هات وهاروونی کوڕی مەهدی هێرشی بردەسەر خاکە بیزەنتیەکان وکۆمەڵێ قەڵای فەتح کرد، کە گرنگترینیان شمال و بو[1]، پاشان واڕوویدا بیزەنتە لە ساڵی (١٦٤ك/٧٨١ز) دا بەرەو دوو سەختی بویەوە، کە کاریان کردە سەر تواناکانی:

یەکەم: مردنی ئیمپراتۆر لیۆی چوارەم و ئیرینی هاوسەری، وەك وەسی قوستەنتینی کوڕی کورسی دەسەڵاتی گرتە دەست، لە ئەنجامی ئەمەدا هەندێ لە سەرکردەکان بێ هیوا بون[2].

دووەم: لەو کاتەدا بیزەنتە بەرەو ڕووی شۆرشێکی گەورە لەسلقیە بویەوە و ناچار بو هێزەکانی لە نێوان ئەو جەزیرە و بەرەی ڕۆژهەڵاتی لەگەڵ موسڵماناندا دابەش بکات.

خەلیفە مەهدی ئەو بارودۆخە ڕاڕا ونالەبارەی قۆستەوەو هەڵمەتێکی گەورەی بەسەرکردایەتی هارونی کوڕی ناردە سەر وڵاتی بیزەنتیەکان وفرمانی پێ کرد تاهێرش بکاتە سەرقوستەنتینیە، هەڵمەتەکە لەکاتی ڕۆچوونەناو ناوچە ستراتیژیەکان هێرشی کردە سەر کیلیکیا وئەنادۆل بەو ئامانجەی دەستی بەسەردا بگرێت تائەوەی هارون ئامانجەکانی هەڵمەتەکەی لا ڕوون بویەوەو هێزێکی سەربازی ناردو هێرشی کردە سەر سنووری تراقیسیون،[3] سوپای سەرەکیش بەرەو پایتەخت درێژەی بەکشانەکەی داو ئەو بەرگریکاریەی پێپەڕاند کە لە ڕێگەیدابو و بەسەریدا سەرکەوت[4].

---

١ـ هەمان سەرچاوە ص١٤٨، اليعقوبي: ج٢ ص٣٤٧، إبن الأثير: ج٥ ص٦٣.

٢ـ العرين: السيد الباز: الدولة البيزنطية، ص٢٢٢، Diehl:Lemande oriental:p279, The ophanes:cit. p90 op.

٣ـ عبدالله، و ديع فتحي، العلاقات السياسية بين بيزنطة و الشرق الأدني الأسلامي، ص٢١٦ـ ٢١٧.

٤ـ هەمان سەرچاوە.

ئیرین لەدوای ئەو گەشەسەندنە سەربازیانە زانی کە ئامانجی هێرشەکە چیە، بۆیە خۆی یۆبرگریکردن لە شارەکە ئامادە کردوهێزەکانی توانیان سوپای ئیسلامی چوار دەوربدەن وئەندامانی سوپای ئیسلامی بکەونەبارێکی ناخۆش و سەختەوە[۱]. بەڵام هاروون بوزیرەکی وبەهۆی توانای سەرکردایەتیەوەتوانی لەوتەنگەژەیەڕزگاری ببێت ودەربچێت ودرێژەی بە پێشڕەویەکی دا تاگەیشتە کەنداوی قوستەنتینیە و هەڕەشەی لەپایتەختی بیزەنتی کرد، ئیرین خۆی لەبارێکی سەختدا بینیەوە وپێی وابو هیچی پێناکرێت، بۆیە بەناچاری ملی بۆمەرجەکانی هاروون کەچکرد کە لەگرنگترین ئەومەرجانە بریتین لە:

- ئیرین سالآنە بەبڕی نزیکەی حەفتا هەزار تانەوەد هەزاردینار بە دووجار سەرانەی سالآنە بدات بە خیلافەتی عەبباسی.
- ئالۆگۆری دیلەکانی نێوان هەردوو لا بکەن.
- بیزەنتی لە گەشتی گەڕانەوەدا دەبێت بازاڕ بۆ بازرگانە موسڵمانەکان بکاتەوە.
- ئەندامانی سوپای ئیسلامی ڕێگەیان پێبدرێت هەموو دەستکەوتەکان لەگەڵ خۆیاندا ببەن.
- ماوەی سێ ساڵ ڕێککەوتنەکە بەردەوام بێت[۲].

لە ئەنجامی ئەم دەستکەوتەدا هاروون بەدەستی هێنا، وایکرد باوکی نازناوی (ڕەشید)ی لێنێت[۳].

ئەم هەڵمەتە بەگرنگترین هەڵمەتێك دادەنرێت، کەخەلیفە مەهدی بردیە سەر بەرەی بیزەنتی، هەروەك ئەوە کۆتاهەڵمەتی ئیسلامی بو بۆ سەربسفۆڕ.

---

۱ـ هەمان سەرچاوە: ص۲۱۷.

۲ـ تأريخ خليفة إبن خياط: ج۲ ص٤٧٠، ئةم بة تةنها باسي ضالاكي طواستةوةي ديلةكان دةكات، الطبري: ج۸ ص۱۵۲ــ ۱۵۳، رستم، أسد: الروم في سياستهم و ثقافهم و دينهم: ج۱ ص۲۹۷. The phanes: p٩٢٠.Ramsay: p.١٥٩

۳ـ الطبري: ج۸ ص۱٥٤.

ئاگربەستی نێوان هەردولا تاساڵی(١٦٨ك/٧٨٤ز) بەردەوام بوتا ئەوکاتەی بیزەنتیەکان دوای تێپەربونی سی ودوو (٣٢) مانگ هەڵیان وەشاندەوە، بەهەڵمەتی ئیسلامی بۆ سەر خاکی بیزەنتیەکان دەستی پێکرد، بەڵام دەست کەوتێکی بەر چاوی بەخۆیەوە نەدی تاله ساڵی دواتردا مەهدی مرد، لە ڕاستیدا خەلیفە مەهدی لەسیاسەتی جیهاتدادەست کەوتێکی گەورەی بەدیهێنا کە تەرازووی ململانێ لە سەردەمی ئەودا بە لای موسڵماندا شکایەوە و سەنگی تەرازووی موسڵمانان قورستربو.

# وەزارەت لە سەردەمی مەهدیدا

لە ئەنجامی ئەوەی خەلیفە دەسەڵاتێکی فراوانی بەوەزیرەکان داو بەشێوەیەکی توند پشتی پێ بەستن، شێوەی وەزارەت لە سەردەمی مەهدیدا بەڕوونی زیادی کرد[١]، بۆیە دانانی وەزیرەکان لەسەردەمی ئەودا بەپێی توانای کارگێڕی ونووسینیان دەبو، پێ دەچێ دەسکیسەی دەرباز کاریگەری لەدانان ولابردنی هەندێ وەزیردا هەبو بێت،[٢] هەروەك لەباری سیاسی کاریگەری ڕاستەخۆی خۆی لەوەدا هەبو، لە وەزیرەکانی مەهدیدا ئەمانە باس دەکەین:

- ئەبوعەبدوڵڵا موعاویەی کوڕی یەساری مەولای ئەشعەریەکان کەلەپێش بون بەخەلیفەی نووسەروجێگیری خەلیفە مەهدی بو، لە ئەنجامی دەسکیسەی ڕەبیعی کوڕی یوونسی پەردەداردا لە ساڵی(١٦٣ك/٧٨٠ز)دا لە وەزیری لای برد[٣].
- ئەبوعەبدوڵڵای کوڕی داوود مەولای بەنی سەلیم، خەلیفە لەسەر ڕێنموونی ڕەبیعی کوڕ یوونس کردی بە وەزیری خۆی.

ئەم شیعەگەرایە بو و دەستی بەسەر کاروباری خەلیفە داگرت، لە ساڵی ١٦٦ك/٧٨٣ز)دا لێیدا ولەناوی برد [٤].

- فەیزی کوڕی ئەبوسالحی نەیسابوری، بەڕێز وفەزڵ وگەورەیی وبەدەسەڵات بو، بەڵام خۆسەپێن وخۆهەڵنەر بو، تا مردنی مەهدی لە وەزیرایەتی مەهدیدا مایەوە [٥].

---

١ـ إبن الطقطقا: ص١٨١.

٢ـ الصالح: سەرچاوەی پێشوو، ص ٩٢٨.

٣ـ إبن الطقطقا: ص١٨٢، الجمشياري، ص١٤١.

٤ـ الجمشياري: هەمان سەرچاوە، ص١٥٥، ١٦٣.

٥ـ هەمان سەرچاوە: ص١٦٤، إبن الطقطقا: ص١٧٨.

# جێگیرایەتی ــ مردنی مەهدی

مەهدی عیسای کوڕی مووسـای لـە جێگیرایـەتی لابردوجێگیرایـەتی دابەمووسـای هادی کوڕی ودواتردوای ئە هاروونە ڕەشیدی کوڕی [1].

مەهدی (بیست و دوو مانگی موحەڕەمی ساڵی ١٦٩ك/ مانگی ئابی ساڵی ٧٨٥ن) لە گوندی (روژ) ولە ئـەنجامی بەریەککـەوتنی لەگـەڵ دەرگایـەکی شـکاودا لـە کـاتی یاری ڕاوی ئاسکدا مرد، لـە گێرانەوەیـەکی تـردا هـاتووە کـە یـەکێ لـە کـەنیزەکانی ژەهری کردۆتە ناوخواردنەوەبۆ کەنیزەکێکی تری مەهدی، کەچـی خەلیفـە مەهـدی بەبێئاگایی لەوخواردنەی خواردووەومردووە [2].

## ئەبوموحەممەدی مووسای هادی (١٦٩ــ١٧٠ك/٧٨٥ــ٧٨٦ز)

**ناساندنی هادی:**

مووسای هادی کـوڕی موحـەممـەدی مەهـدی کـوڕی عەبـدوڵلای مەنـسوور کـوڕی موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی عەبدوڵلای کـوڕی عەبباسـیە، لـەمانگی موحـەڕەمی ساڵی ١٦٩ك/ مانگی ئابی ساڵی ٧٨٥ز، و لە تەمەنی بیست پێنج سـاڵیدا خیلافـەتی گرتە دەست، کەسی لەو بچووکتر پێشتر خیلافەتی نـەگرتبوە دەسـت، [3]دایکـی ئـوم وەلەد عەرب نەبو و بە خەیزەران بانگ دەکرا [4].

لـە تەمـەنی شـەش سـاڵیدا بـو کـە بـاوکی کـردی بـە جـێگیری خـۆی، هـەروەك سـەرکردایەتی سـوپای لـە ڕۆژهـەڵات دایـە دەسـت، مەهـدی بـیری لـەوە کـردەوە هـاروونی کـوڕی بخاتـە پێـشی چـونکە ئـەوی زیـاتر دەویـست خـەیزەرانیش لـە

١ـ بۆ درێژەی ڕووداوی جێگیرایەتی بگەڕێرەوە بۆ الطبري: ج٨ ص١٢٤ــ ١٢٨، ١٥٤.

٢ـ هەمان سەرچاوە: ص١٦٨ــ ١٧٠.

٣ـ إبن كثير: ج١٠ ص١٥٩.

٤ـ هەمان سەرچاوە: ج١٠ ص١٥٩.

خۆشەویستی هاڕووندا وەك مەهدی وا بو، بەلاّم مەرگ ڕێگەی پێنەدا. هەندێ لە پایەکانی دەوڵەت لەدوای مردنی مەهدی هەمان ئاڕاستەیان هەبو.

هادی لەبارێکی خۆشگوزەرانی گەورە بو و کاریگەری ئەمەش لە ڕەوشت و هەڵسوکەوتیدا بەدیار کەوت، پێکهاتەی بەهێز بو، دوو قەڵغانی پێوەبو و لە سەر ئاژەڵ سوارچاکی باشی دەزانی، باوکی بە (ڕەیحانەکەم)[١] بانگی دەکرد، دلێرو نەبەرد بو و ئەزموونی لەکاروباری دەسەلاّتدا هەبو وبەرز وبەڕێز بو،بەلاّم تووڕەیی و توندی وغیرەی دایك وبرای خۆی تێدا بو، زۆر حەزی لە ئەدەب ومێژوو دەکردو ڕۆشنبیریەکی فراوانی لەدوو بواردابەدەست هێنا، حەزیشی بەگۆرانی دەکرد و ئیبراهیمی موسڵی گۆرانیبێژی ناوداری عێراقی وئیسحاقی کوڕیشی لە خۆی نزیك کردەوە.[٢]

## بارودۆخی ناوخۆیی لە سەردەمی هادیدا

پەیوەندی لەگەڵ تالیبیەکاندا: ئەوسیاسەتە ئاشتیەی مەهدی لەگەڵ تالیبیەکاندا گرتبویە بەر زۆردرێژەی نەکێشاوبە مردنی کۆتایی پێهات، هادی بەرامبەر تالیبیەکان توند بو، فشاری لەسەردروست کردن و پەیوەندی وڕۆزی و مووچەی لێبرین و جاسوس و هەواڵگری لەسەردانان وفرمانی بە والیەکان کردتا چاودێری جووڵە و بزاوتیان بکەن و باریان لەسەر توند بکەنەوە[٣].

خەلیفە لەوە ترساوە کە لەدەسەلاّتی دەربچن، هەروەك مۆرك و دەروونیشی و کاری کردە سەرئەوەی سیاسەتی دوژمنکارانەی بەرامبەریان نیشان بدات، ئیتر تالیبیەکان لەحیجاز لە بارێکی خراپدا بون و چوون بۆ لای گەورەو شێخانی حوسەینی کوڕی عەلی کوڕی حەسەنی کوڕی حەسەنی کوڕی حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبوتالیب[٤]وهانیاندانا دەربچێت و لەو سەختی و نارەحەتیە ڕزگاریان بێت.

---

١ـ هەمان سەرچاوە.

٢ـ الجمشياري: ص١٧٢، الأصفهاني: كتاب الأغاني: ج٥ ص٦، إبن كثير: هەمان سەرچاوە.

٣ـ اليعقوبي: ج٢ ص٣٤٨ـ ٣٤٩.

٤ـ حوسەین دەیویست خیلافەت بگرێتە دەست و پێی وابو عەبباسیەکان لە تالیبیەکانیان داگیر کردووە.

ویستی خوا وابو وا ڕێککەوت ژمارەیەکی زۆری عێراق بۆ ئامادەبونی مەراسیمی حەج هاتنە مەدینە، حوسەینیش پەیوەندی پێوە کردن و باری نالەباری عەلەویەکانی بۆخستنە ڕوو، ئەوانیش بەیعەتیان پێدا و بەڵێنیان پێداکە لەکاتی حەجی داهاتوودا لەدەسەڵات دەربچن و لەسەر ئەوە ڕێککەوتن دروشمیان ئەمە بێت (کێ وشتری سووری بینیوە) [1].

ڕووداوەکان دوای ئەوە بەخێرایی دەچوون، ئەمە پاڵی بە سەرکردە تالیبیەکانەوە نا تا زووتر دەربچن و وسەین بەوە ڕازی بو کە پێویستە پێش مۆڵەتی خۆی دەربچن، ئەمە لە دوای ئەوەی هەستی بە زیاد بونی مەترسی بۆسەرکۆمەڵی تالیبی کرد و لە بەرە بەیانی ڕۆژی (سیانزەی مانگی ژیلحەججەی ساڵی ١٦٩ك/پانزەی مانگی ئایاری ٧٨٦ز)دا دەرچوونی ڕاگەیاند و تالیبیەکان دەستیان بە سەر مەدینە داگرت و حوسەین مزگەوتی پێغەمبەری خوای کردە بنکەی دەرچوونی و هەندێ لەخەڵکی مەدینە بەیعەتیان پێدا، لە کاتێکدا زۆرینەی خەڵکی مەدینە نەچوون بەدەم داوایەکەیەوە [2]، خەڵکەکەی لە بەر توندی و ڕەقی خەلیفە لە توندوتیژی دەسەڵات دەترسان، هەروەك پلاندانانەکانی حوسەین وەك دانانی حەرەمی ئارامی پێغەمبەرایەتی وەك بنکەی دەرچوون و مەڵبەندێك، کە خۆی پێ بپارێزێت خەڵکی مەدینەی بێزارکرد، چونکە ئەمە لەگەڵ سۆز و بە گەورە دانان و بە پیرۆز سەیرکردنیان بۆ مزگەوتی پێغەمبەرﷺ نەدەگونجا [3].

حوسەین لە دوای دەرچوونی بۆماوەی یانزە ڕۆژ لە مەدینەدا مایەوە دواتر چوو بەرەو مەککە تادەستی بەسەردا بگرێت و لە (وادی فخ) کە لەدەورو بەری مەککەیە سەنگەرگیری کرد [4]، بەڵام خەڵکی بەدەم بانگەوازەکەیەوە نەچوون.

لەو کاتەدا سوپایەکی عەبباسی گەیشتەناوچەکەو هێرشی بردەسەر سەربازگەی

---

١ـ اليعقوبي:ج٢ ص٣٤٩.

٢ـ هەمان سەرچاوە، الطبري: ج٨ ص١٥٩، إبن الأثير: ح٥ ص٧٥، المسند: ص٢٠٢.

٣ـ الطبري: هەمان سەرچاوە، المسند: هەمان سەرچاوە.

٤ـالأصفهاني: مقاتل الطالبين، ص٣٦٦.

حوسەین لەفەخ، ئەمەلەمەشتی ذیلحەجەدا بو و تیایدا حوسەین و شوێنکەوتەکانی کوژران وحوسەین بە (کوژراوی فەخ) یان (صاحب فەخ) ناونرا.

شیعە کەهەمو نیاز و ئامانجێکیان لەو بزووتنەوەیەدا خستبویەگەڕ هیواکانیان هەڵوەشاندنەوە و ئەوانەیان ڕزگاریان بو بە شارو ولآتەکاندا بلآوبونەوە وخۆیان شاردەوە، لە ناو ئەوانەیشدا ئیدریس و یەحیای کوڕانی عەبدوللآی کوڕی حەسەن هەبون، ئیدریس چوو بۆ مەغریب و دەوڵەتی ئەداریسەی دامەزراند، لە کاتێکدا یەحیا چووە بۆ ولآتی دەیلەم لە ڕۆژهەلآت.

## بەزم پێ گێرانی زندەقەکان

هادی لە باوکیەوە ڕقبون لە زەندەقەکان بەمیرات بۆمایەوە و هەمان سیاسەتی باوکی گرتەبەر و کەوتە شوێن کەوتن و بەزم پێگێرانیان وژمارەیەکی زۆری لێ کوشتن، لەنێوانیاندا یەزیدی کوڕی باژان و عەلی کوڕی یەقتین هەبون، دەڵێن عەلی لەکاتی حەج کردنیدا سەیری کردووە خەڵکی بەدەوری کەعبەدا دەسوورێنەوە و دەنگی نزاو زکریان بەرز دەبێتەوە، توویەتی: دەڵێی مانگان و خەرمان دەکوتنەوە[1].

## جێگیرایەتی ـ مردنی هادی

هادی لە سەر ئەوە سوور بو هارون ڕەشیدی برای لە جێگیرایەتی لاببات و بەیعەت بەجەعفەری کوڕی بدات، کەهێشتا منداڵ بو، بۆیە هەوڵیدا تا هاروون ڕازی بکات تا خۆی وازبهێنێت، هاروونیش خەریك بو بە گوێی بکات، بەلآم یەحیای کوڕی خالیدی کوڕی بەرمەکی ڕێی لەهاروون گرت،[2] ئەو کات هادی پەنای بۆ بەکارهێنانی شێوەی توند وتیژی و سەختی خستنە ڕێ برد، ئەمەش هاڕوونی هاندا تا لە

١ـ الطبري: ج٨ ص١٩٠.

٢ـ الجهشياري: ص١٦٩ـ ١٧٠

پایتەخت دوور بکەوێتەوە و ڕابکات و بەردەوام لە بەغداد دووربو تا ئەوەی هادی مرد و بەیعەت بەهاروون درا[1].

خیلافەتی هادی درێژەی نکێشاو لە هەژدەی مانگی ڕبیعولئەول لە ساڵی١٧٠ك/ مانگی ئەیلولی ساڵی٧٨٦ز و لە دوای ساڵێك و دوو مانگ و بیست و دوو ڕۆژ فەرمانڕەوای لە بەغداد کۆچی دوایی کرد.

ڕای ڕاست ئەوەیە کە هادی بەدەست گەدەیەوە هاواری بو، بەڵام ئەو ناکۆکیەی لە ناو بنەماڵەکەیاندا هەبو وای لە هەندێ مێژونوس کردووە تا پێیان وا بێت، هادی کاتێ خەوتووە لە لایەن کە نیزەیەکی دایکیەوە بە بڕیاری دایکی خنکێنراوە.[2]

---

١ـ هەمان سەرچاوە.

٢ـ الیعقوبي: ج٢ ص٣٥١، الجهشیاري: ص١٧٤، الطبري: ج٨ ص٢٠٥ـ ٢٠٦.

# بەشی چوارەم

## ئەبوجەعفەر هاروونە ڕەشید(١٧٠ــ١٩٣ك/٧٨٦ــ٨٠٩ز)

* ناساندنی حەعفەر[١]: هاروون ڕەشید ئەمیری باوەڕدارانی کوڕی مەهدی قورەیش هاشمی ئەبوجەعفەرە و دایکی ناوی خەیزەرانە و ئوم وەلەدە. لە دوای مردنی هادی برای لە مانگی ڕەبیعولئەوەلی ساڵی١٧٠ك/مانگی ئەیلولی ساڵی٧٨٦زو بەیعەتی مەهدی باوکی بەیعەتی خیلافەتی پێدرا، ئەوکات تەمەنی بیست و پێنج ساڵ بو.

دیمەنی هەڵکەوتەیی و زیرەکی هەر لە بچووکیەوە لێوی دیار بو، کاتێ گەیشتە تەمەنی گەنجی باوکی ویستی ڕاستەوخۆ بۆخیلافەت لە دوای خۆی کاندیدی بکات و خەیزەرانیش لەسەرئەوەهانیدا چونکە هارونی لەهادی برای زیاتر خۆشدەویست.

هاروون بە ناودارترین خەلیفەی عەبباسی دادەنرێت و ناوبانگی ڕۆژهەلاتی تێپەڕاندووە و گەیشتۆتە ڕۆژئاواو کۆمەڵگەی ڕۆژئاوایی کەوتوونەتە شیکارو لێکۆلینەوە لە سەری و هەندێ پاشای ئەوروپا هەوڵیانداوە خۆیان لە هاروون نزیك بکەنەوە ودۆستایەتی هاروون بەدەستی بهێنن.

هەواڵ و باسی ڕاستیەکانی مێژووی تێکەل بەچیرۆکی خەیاڵی بون، هاروون کۆمەڵێ سیفەتی توندی لێك جیای هەبون و کەم جار دەکرا ئەو سیفەتانە لە یەك کەسدا کۆببنەوە، ئەو سیاسەتمەدارێکی لێهاتوو بو ویەکلایی بڕیار و توندوتیژی و ئسلوبی مەنسووری هەبو، لەگەڵ ئەوەیشدا نەرم ونیانیەکی ڕوون ودەست بڵاویەکی بۆهەڵبژاردنی خەڵك بەکاردەهێنا، زۆر گرنگی بە کاروباری هاوڵاتیان دەدا، بە بازاڕدا دەگەڕا و لە کۆرەکاندا دەبو وحەزی نەدەکرد لەسەر بارودۆخی خەڵك ڕابوەستێ و زۆر هەستیار و لە باربو، زووکاری تێدەکرا، لە تووڕەییدا ڕادەپەڕی و

---

١ـ سەبارەت بە کەسایەتی هاروون بگەڕێرەوە بۆ الطبري: ج٨ ص٣٤٧ــ ٣٥٩، إبن كثير: ج١٠ ص٢١٣ـ ٢٢٢.

لە تۆڵەسەندنەوەدا زیادەڕەوی دەکرد، هەندێ جاریش سۆزدایدەگرت و دەگریا و سۆز و مهرێکی زۆر و بێ شوماری نیشان دەدا.

ڕەشید کەسێکی ئاییندار ونەوازشی و پارێزەری ئەرکە شەرعیەکان بو، پەیوەستی دەقەکانی قورئان وسوننەت بو، ئەگەر نەچوایە بۆغەزا حەجی دەکرد، ئەو بەدرێژایی تەمەنی یان حەجی دەکرد یان غەزای دەکرد لە، ڕۆژێکدا سەد ڕکات نوێژی دەکرد، بە پیادە حەجی دەکرد، لەدوای ئەوجگە لەوکەسی تر لە خەلیفەکان بە پیادە حەجی نەکردووە، ڕەشید ژیانی ژیانی خێزانیشی پشت گوێ نەدەخست.

حەزی لە شیعر و ئەدەب و فیقە بو، شاعیر و گۆرانیبێژ و ئەدەیب و شەرعناسانی لە خۆ نزیکردەوە وڕێزی دەگرتن، هانی بزووتنەوەی وەرگێڕان بۆ زمانی عەرەبی دا، هاروون خاوەن هەڵکەوتەییەکی شیعری وئەدەبی بو، حەزی لە دەمەقاڵە لە بواری ئاینیدانەبو، کۆرەکانی شەوی مشتومڕی بالآی هزرییان لە خۆدەگرت، لەڕاستیدا ئەو وێنەی لێك جیایانەی ڕەشید ڕەنگدانەوەی سەردەمی خۆی وئەو پەروەردەی لەسەری پەروەردە بو و سروشتی دەروونی خۆیەتی.

سەردەمی ئەو بەهۆی بونی ماڵ وسامان وپێشکەوتنی زانستی و فەلسەفیەوەسەردەمی تاودانەناو ژیاربو، هاروون لەکەش وهەوایەکی خۆشگوزەرانیدا پەروەردە بو وبەشێوەیەکی جیهادی وسەرکردایەتی پێگەیشت.

سەردەمی هاروون ڕەشید بەسەردەمی زێڕینی دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی دادەنرێت، لەسەردەمی ئەودادەوڵەتی خیلافەت گەیشتە ئاستێکی وا کەپێشتر بەخۆیەوە نەدی بو، بەغدادبویە مەڵبەندی بازرگانی جیهانی وڕووگەی پیاوانی زانست و ئەدەب، کەسایەتی خودی هارونیش زیاتر لەوەی مێژووی مرۆڤێك نیشان بدات، مێژووی سەردەمێك دەنوێنێت.

# بارودۆخی ناوخۆیی لە سەردەمی ڕەشیدا

## پەیوەندی لەگەڵ تالیبیەکاندا:

ڕەشید لەسەرەتای دەسەلاتەکەیەوە ویستی لە ڕێگەی نەرمی نواندن لەڕووی باتینیەکاندا لە دوای سیاسەتی توندی هادی بەرامبەریان عەلەویەکان بەلای خۆیدا ڕابکێشێ، بۆیە کەوتە نەرم و نیانی و سۆز نواندن لەگەڵیاندا و ئارامی و پەنای پێدان و سەختی باری عەلەویەکانی لە بەغدادلابرد و گێرانیەوە بۆمەدینە، بەڵام جگە لە عەبباسی کوڕی حەسەنی کوڕی عەبدوڵلا، ئەو والیەی بەغدادیشی لابرد کە عەلەویەکانی دەچەوساندەوە [1].

بەڵام تالیبیەکان بیروباوەڕی چەسپاوی خۆیان سەبارەت بەشیاوتربونی خۆیان بۆ خیلافەت نەگۆری وبۆگەیشتن بە خیلافەت دەست بەرداری هەوڵی خەبات نەبون، لە پێناو ئەمەشدا خۆشی و ئارامی نێوان عەبباسی و عەلەویەکان درێژەی نەکێشا و ململانێی توندی نێوانیان گەڕایەوە.

ڕووداوی فەخ کاریگەری قووڵ و درێژخایەنی هەبو، لەو جەنگەدا دوو سەرکردەی تالیبیەکان کە ئیدریسی کوڕی عەبدوڵلا کوڕی حەسەن بو کە چوو بۆ ئەفریقیا و یەحیا، کە ڕوویکردە وڵاتی دەیلەم لە ڕۆژهەلات ڕزگاریان بو.

ئیدریس لە هەرێمی تەنجە لەمەغریبی دوور سەقامگیربو وبەربەرەکان لەدەوری کۆبونەوەودەوڵەتێکی سەربەخۆی بۆ خۆی دامەزراند کە دەوڵەتی ئەداریسەیە، ئەمەش یەکەم دەوڵەتی تالیبی بو، کە لەخیلافەتی عەبباسی جیابێتەوە.

ئەو دەوڵەتە هەڕەشەی لە قەڵەمڕەوی عەبباسی لە باکووری ئەفریقیا دەکرد، بۆیە ڕەشید بڕیاریدا ئەودەوڵەتە لەناو ببات، لە بەر دووری ماوەکە لە ناردنی سوپادا دوو دڵ بو و ترسیشی لە کشانی قەڵەمڕەوی ئیدریس بۆمیسرو وڵاتی شام هەبو، ئەگەر بەسەر سوپای عەبباسیدا سەربکەوێت ئەوکات خیلافەتی عەبباسی لەناو دەبات [2].

---

۱ـ الطبري: ج۸ ص۲۳۵.

۲ــ المسند: ص۲۰۷.

ئەوکات پەنای بۆ فێڵبازی برد تا لە ئیدریس ڕزگاری بێت و کەسێکی زۆر زان و لێزانی هەڵبژارد، کە ناوی سولەیمانی کوڕی جەریربو و بە شەمماخ ناسرابو، هاروون شەمماخی بۆ تیرۆرکردنی ئیردیس بە کارهێنا، ئەویش ئیدریسی لەساڵی (١٧٧ك/٧٩٣ز) دا ژەهر خوارد کرد و بەوەیش ئیدریس مرد [١].

مردنی ئیدریس دەڵەتی ئەداریس لەناو نەبرد، چونکە ئیدریس کەنیزەکێکی بەربەری بە هاوسەر گرتبو و کەنیزەکەکەیش (لە کاتی کوژرانی ئیدریسدا) سکی پڕبو، شوێنکەوتەکانی ئیدریس چاوەڕێیان کرد تامندالّەی بو، منداڵەکە کوڕ بو، ئەوانیش ناوی (ئیدریس)یان لێنا. کاتێ ئیدریس گەیشتە تەمەنی یانزە ساڵی، بەربەرەکان کاروباری خۆیان دایە دەست و بەیعەتی خیلافەتیان پێدا و ئیدریس بو بە دامەزرێنەری ڕاستی دەوڵەتی ئەداریسە لە مەغریب.

کاتێ مەترسی ئەو دەوڵەتە زیادی کرد، ڕەشید ویلایەتی ئەفریقیای دایە دەست ئیبراهیمی کوڕی ئەغلەب تالە ڕووی دەولّتی ئەداریسەدا بوەستێت [٢].

یەحیایش لە ولاّتی دەیلەم شان و شکۆی زیادی کرد و کەسانێکی زۆرشوێنی کەوتن و بەهێزبو، پاشان لەساڵی١٧٦ك/٧٩٢ز دا دەرچوون لە دەسەلاّتی ڕاگەیاند و بو بەهەڕەشە بۆئاشتی دەوڵەت و کاروباری ڕەشیدی شێواند [٣]، ئەوەی بەهێزی بە بزووتنەوەکەی دا، دووری ناوچەی دەیلەم لە بەغدادو سەختی سروشتەکەی بو.

خەلیفە بڕیاڕیدا بزووتنەوەکەی یەحیالەناو ببات، بۆیە فەزڵی کوڕی یەحیای بەرمەکی بۆ ئەو کارەڕاسپارد، فەزڵ توانی لە دوای داتەکاندنی شوێنکەوتەکانی یەحیا لەخودی یەحیا نزیك بێتەوە و بڕیاری ڕێککەوتنیاندا، ڕەشیدیش نامەی پەنادانی بۆ نووسی و لە بەغداد پێشوازی لێکرد [٤].

خەلیفە لەنیازی یەحیا دڵنیا نەبو ودەرباریش نێوانی خەلیفە ویەحیایان تێکدا، بۆیە خەلیفە یەحیای خستەژێر چاودێری فەزڵی کوڕی یەحیا، یەحیا کاری کردە

---

١ـ مقاتل الطالبيين: ص٤٠٧ـ ٤٠٨.

٢ـ هەمان سەرچاوە ص٤٠٩.

٣ـ الطبري: ج٨ ص٢٤٢.

٤ـ الأصفهاني: ص٣٩٣ـ ٣٩٤

سەر فەزلّ و فەزلّیش بەبێ زانینی خەلیفە ئازادی کرد و چوو بۆ حیجاز، پاشان بە ڕەشید وترا کە یەحیا لە حیجاز بانگەواز بۆ خۆی دەکات، ئەمەش وابو، بۆیە هاروون ڕەشید گرتی و بەندی کردو دواتریش کوشتی[1].

ئەو کەسایەتییەی تر کە لەسەردەمی ڕەشددا دەرکەوت، پێشەوا موسای کازمی کوڕی جەعفەر بو، لەڕاستیدا ڕەشید چاودێری بزاوت و جووڵەی تالیبییەکانی لە حیجاز دەکردو دەیزانی خەڵکی لە دەوری موسای کازم کۆبونەتەوەو یەك لە پێنجی موسڵمانیان بۆ ئەودێن، ئەمە واتای ئەوەیە بڕوایان بەپێشەوایەتی موساهەیە، بۆیە هاروون موسلی گرت ودیلی کردو تا لە ساڵی (١٨٣ك/٧٩٩ز)دا مووسا کۆچی دوایی کرد، ڕای زیاتر دەڵێت هاروون موسای کوشتووە،[2]

١ـ هەمان سەرچاوە ص٤٠١،٣٩٥ـ ٤٠٤.

٢ـ هەمان سەرچاوە: ص٤١٣ـ ٤١٧.

# بزووتنەوەی خەواریج

ئـەو پـشێوی و پێکدادانـەی هەنـدێ بەشـی دەوڵـەتی خیلافـەتی عەبباسـی گرتبویەوە بەتەنها لەسەردەستی بزووتنـەوە تالیبیـەکان نـەبو، بـەڵکو کۆمـەڵێ لـە موسڵمانان هـەبون لۆمـەی خۆسـەپێنی و دەرچـوونی خـەلیفە عەبباسـیەکانیان لـە حوکمە شەرعیەکان دەکرد، ئەوانـە ئەوخەواریجانـە بـون، کـە لەسـەردەمی ڕەشیدا لەناوچەی جەزیر لە سـاڵی (١٧٨ك/٧٩٤ز) بـە سـەرکردایەتی تـەریفی شـاری چـالاك بـون ودەرکـەوتن وهـەژمونی کـرداری خۆیـات بەسـەرئەرمینیا وئازەربایینجانـدا بڵاوکردەوە و هەڕەشەیان لە سوادی عێراق لەسەر ڕووباری دیالە دەکـرد و گەیشتە حەلوان.

ڕەشید گرنگی بەم کۆمەڵەدا و لە سـاڵی (١٧٩ك/٧٩٥ز)دا هێزێکـی سـەربازی بـە سەرکردایەتی یەزیدی کوڕی مەزیدی شەیبانی نارد و لـە ناوچـەی (حدیثـةالفرات) لـە دووری چـەند فەرسـەخێك لـە ئـەنبار پێکیانـدادا بزووتنەوەکـەی تـەریف و خـودی تەریفیش لە ناو چوو[1].

## بارگرژی لە وڵاتی شامدا

کینە بەرەی هۆزایەتی لە نێوان مەڵبەندەکانی هێزی وڵاتی شامدا لـە نـاو نەچـوو بو، لەساڵی (١٧٦ك/٧٩٢ز)دا بـارودۆخ لـە دیمەشـق تەقیـەوە و نزیکـەی دوو سـاڵی خایانـد، ئەمـە پـاڵی بـە ڕەشـیدەوە نـا تـا گـۆڕانێکی کـارگێری بکـات و والیـەکان بگۆڕێت، بەڵام ئەم کارە تەنها لە سەردەستی موسای کـوڕی یـەحیای کـوڕی خالیـد لـە سـاڵی (١٧٨ك/٧٩٤ز)و پـاش نـوێ بونـەوەی پێکدادانـەکان لەسـەر دەسـتی جەعفەری کوڕی خالید لە ساڵی(١٨٠ك/٧٩٦ز)دا دامرکایەوە[2].

---

١ـ الطبري: جص٢٥٦، سەبارەت بە ڕووداوی (حدیثة الفرات) بگەڕێرەوە بۆ: الحموی، یـاقوت: معجم البلدان: ج٢ ص٢٣٠ـ ٢٣١.

٢ـ الطبري: ج٨ ص٢٥١ـ ٢٦٢، إبن الأثير: ج٥ ص٩١ـ ٩٢.

# بارگرژی لە ئەفریقیا

بارگرژی لە ئەفریقیا لە ساڵی(١٧١ك/٧٨٧ن) بەهۆی دەرچوونی خەواریج و سەرکردە سەربازیەکان و بەربەرەکانەوە بەردەوام بو، بۆ ئەمە ڕەشید هەرپەمەی کوڕی ئەعیونی کرد بەوالی ئەفریقیاو فرمانی پێکرد،تاڕاپەڕینەکان سەرکوت بکات و ئارامیش بچەسپێنێ، ئەویش لە ئەرکەکەیدا سەرکەوتو بوو چوویە قەیرەوان و دڵنیایی بەخەڵك بەخشی.

ناکۆکی نێوان تاقمە جیاوازە ئیسلامیەکاندا زۆر فراوان بو و نائارامی سەرلەنوێ هاتەکایەو هەرثمە نەیتوانی ڕێی پێبگرێت، بۆیە خەلیفە لەسەرداوای خودی هەرثمە لە ساڵی(١٨٠ك/٨٩٦ن)دا لایبرد، هەروەك والیەکانی دوای ئەویش نەیانتوانی بەسەر ئەو بارەدا زاڵبن، بۆیە ئیبراهیمی کوڕی ئەغلەب کەهەرێمی زابی لەجەزائیری ئەمڕۆدا لەدەست بو، ئەو بارە نالەبارەی بەهەند وەرگرت وداوای لە خەلیفە کرد تا بیکات بەوالی ئەفریقیا وبەڵێنی هێورکردنەوەی بارەکەی پێدا، خەلیفەیش بەداواکەی ئیبراهیم ڕازیبو و والیەتی ئەفریقیای لە(مانگی جەمادیلئاخیری ساڵی١٨٤ك/مانگی تەمموزی ساڵی ٨٠٠ن)دا پێسپارد[1]. ئیبراهیم توانی بە گرتنەبەری سیاسەتێکی لەسەرخۆ و ناوند سەقامگیری بگێڕێتەوە و لەسەردەمی ئەودائەفریقیا گەشەی کردو بزووتنەوەیەکی بەرفراوانی بیناسازی و چالاکیەکی گەورەی ئابوری بەخۆیەوە بینی، ئیبراهیم ڕێگەی بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی ئەغالیبە خۆشکرد، کە دواتر سەربەخۆیی لە کارگێری مەرکەزیی بەغدادوەرگرت و قەیرەوانی کرد بە پایتەختی خۆی[2].

---

١ـ اليعوبي: ج٢ ص٣٥٨، إبن الأثير: هەمان سەرچاوە، ص١٠٩.

٢ـ الطبري: ج٨ ص٣١٤، الدوري: ص١٠٨.

# بارگرژی لە ڕۆژهەڵات

ڕەشید ئازادی تەواوی بەکاربەدەستەکانی لەسەر هەرێمەکان بەخشی و گوێی بە هەڵسوکەوتیان نەدا، بۆیە هەندێکیان لاسارییان نواند و بون بەهۆکاری سەرهەڵدانی ڕاپەرینی جەماوەری، لە ئەنجامی ئەمەدا لەخوراسان بەشێوەیەکی تایبەت ئەم ڕاپەڕینە ڕوویدا والیەکانی ئەو هەرێمە گرنگییان بەبەرژەوەندیە تایبەتیەکانی خۆیان دەداو بەدوای دەوڵەمەندیدا وێلبون و کاروباری هاولاتیان پشت گوێ خست بو، تائەوەی هەندێکیان بە توندوتیژی باجەکانیان زیادکرد بون.

زیاترین والیە چاوبرسیەکان عەلی کوڕی عیسای کوڕی ماهان بوکە ماوەی دەساڵ فەرمانڕەوایی خوراسانی کرد، ئەم ستەمی زۆری لە خەڵك کرد تا ئەوەی لەوە زیاتر نەیاندەتوانی خۆیان ڕابگرن [١].

لەو بارودۆخەدا ڕافیعی کوڕی لەیپی کوڕی نەسری کوڕی یەساز بەهۆی چەند پاڵنەرێکی شەخسیەوە لە دەسەلاتی مەرکەزی دەرچوو و زۆرێك لە دانیشتوانی خوراسان وولاتی ئەودیوڕووبار بەهۆی حەزنەکردنیان بەسیاسەتی عەبباسیەکان دەکەوتنە شوێنی، خەڵکی ناوچەی (نەسف) نامەیان بۆ نووسی تا بێت بۆ لایان و دژ بەوالی عەبباسی لەگەڵیدا دەبن [٢].

لەئەنجامی بەرپابونی ئەو بزووتنەوەدوژمن کاریەدا، والی عەلی کوڕی عیسا ناچاربو بەرگری لەدەسەلاتەکەی بکات، بەلام نەیتوانی ڕاپەرینەکە سەرکوت بکات و لە بەردەم ڕەشیددا ئەو دەستەوسانیەی دەرکەوت وڕەشید لەوالیەتی لابردو دەستی بەسەر ماڵ وسامانەکەیدا گرت و لەشوێنیدا هەرثمەی کوڕی عەعیونی داناو فرمانی پێکرد تا لەگەڵ هاولاتیاندا دادپەروەر بێت و بەچاکی ڕەفتاریان لەگەڵدا بکات [٣].

---

١ـ الطبري: ج٨ ص٣١٤، الدوري: ١٠٨.

٢ـ اليعقوبي:ح٢ ص٣٨٦، الطبري: هەمان سەرچاوە ص٣١٥ـ ٣١٩ـ ٣٢٠، ٣٢٣.

٣ـ الطبري: ص٣٢٤ـ ٣٤٤.

ڕافیع ئەو بارە پشێوەی قۆستەوە و بزووتنەوە دژ بە دەسەڵاتە عەبباسیەکەی نویٚ کردەوە، بۆیە ڕەشید ناچاربو بۆ سنووردانان بۆ ئەو بارگرژیانە خۆی بچێت بۆ خوراسان، بەڵام کاتیٚ لە ڕێگەدا بو کۆچی دوایی کرد [١].

## چەرمەسەری بەرمەکیەکان

بیرۆکـــەی تۆلەســـەندنەوەی کـــوژرانی ئەبوموســـلیم و بـــەدیهێنانی خواستەسیاسیەکانی لە دەروونی شوێنکەوتە خوراسانیەکانیدا پەنگی خواردبویەوە و لەگەلٚ تێپەڕ بونی سەردەمدا و بیرۆکەیە ڕێبازێکی نوێی وەرگرت بو وئامانجی دەست گرتن بوبەسەر دەولەتی خیلافەتی عەبباسی لەناوخۆی دەولەتەکەدا، ئەمە لە دوای ئـەوەی نـەیانتوانی لـەدەرەوەی دەوڵەتەکـەدا ئـەو ئامانجـە بـەدیبهێنن، ژمارەیەك لە وەزیرە عەبباسیەکان کە لە خێزانە فارسیەکان بون هەولی بـەدیهێنانی ئـەو ئامانجەیانـدا، لـە نـاودارترین بنەماڵـەی بەرمـەکی و بنەماڵـەی ئـال سـەهل و بنەماڵەی تاهیری بون [٢].

بنەماڵەی بەرمەکی فارسی دەدرێتە پالٚ بەرمەکی باپیریان، بەرمەك نازناوێك بوە کە لەسادنی پەرستگای نەوبەهارلە شاری بەڵخ نراوە [٣].

لەسەرەتاکانی سەردەمی دەولەتی خیلافەتی عەبباسی لەو بنەماڵەیـەدا خالیـدی کوڕی بەرمەك لەڕوانگەی توانای کارگێری و دارایی وژیـری و هۆشـیاری و دووربـینی خۆیـەوە بەدیارکـەوت و بەپرسـە عەبباسبەکانی سـەرنجڕاکێش کـرد، بۆیـە سـەفاح دیـوانی خـەراج ودیـوانی سـەربازی دایـە دەسـت [٤]. هـەروەك لـە دوای لەناوچـوونی ئەبوسـەلەمەی خـەلال وەزارەتـی جێبـەجیٚ کردنـی گرتـە دەسـت و وەك ڕاوێـژکاری مەنـسوور وسەرپەرشـتیاری کاروبـاری دارایـی ڕۆلـی بـینی، لەدروسـتکردنی شـاری

---

١ـ هەمان سەرچاوە: ص٣٤٣ـ ٣٤٤.

٢ـ العمرو: ص٢٠٣ـ ٢٠٤.

٣ـ المقدس: المبدء و التأريخ: ج٦ ص١٠٤، كارل بروكلمان: تأريخ الشعوب الأسلامية: ص١٨٦.

٤ـ الجمشياري: ص٧٨ـ ٨٩.

بەغدادیشداناوی دیارە،[١] خالیدبەپێی پایەکەی بەشداری لە دانانی بڕیارە سیاسیەکاندا دەکرد و لەسەردەمی مەهدیدا هەرپایەی خۆی هەبو و لە ساڵی (١٦٣ك/٧٨٠ن)دا مەهدی هەرێمی فارسی دایە دەست خالید[٢].

خالید پیاوێکی لێکەوتەوە کە بەئەڵقەی بەستنەوەی بنەماڵەی بەرمەکی دادەنرێت، ئەویش یەحیایە، مێژووی یەحیابە مێژووی هاروونە ڕەشیدەوە بەستراوەتە، یەحیابوە بەنووسەری هاروون ونوێنەر وجێگیری بوەو بوە بەوەزیریشی،[٣] لەدڵنیا کردن ودڵنیابەخشی جێگیرایەتی بۆهاروونەدا لەبەرامبەر ئەو فشارە گەورانەی مەهدی بە ئامانجی لابردنی هاروون ودانانی جەعفەری کوڕی لە جیاتیدا، یەحیا ڕۆڵێکی دیاری بینی.

ڕای ڕاستر ئەوەیە کە یەحیا خواستە سیاسیەکانی خۆی لە باوکیەوە بۆ ماوەتەوە، ئەو خواستە سیاسیانەی ئەگەر هاروون لە جێگیرایەتی دووربخرایەتەوە هەڵدەوەشانەوە، کاتێ ڕەشید بەیعەتی خیلافەتی پێدرا[٤]، ئیتر یەحیا هەموو دیوانەکانی لە دەست بو و هەردوو وەزارەتەکەی لە دەستدا بون،[٥] هەروەك هاروون چەند تایبەتمەندێکی نوێ بە یەحیا بەخشی، ئەو یەکەم کەس بو کاروباری وەزارەتی گرتە دەست، ئەو نووسینانەی لەدیوانی خەراجەوە دەردەچوون بەناوی ئەوەوە مێژوویەکەیان دەنووسرا، پێشتر ئەمە تەنها بەناوی خەلیفەوە دەنوسرا[٦].

یەحیا بە هاوکاری فەزڵ و جەعفەری دوو کوڕی خۆیەوە توانی ماوەی حەڤدە ساڵ(١٧٠ــ١٨٧ك/٧٨٦ــ٨٠٣ن) کارگێری دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی ببات بەڕێوەو بەمەیش بیردۆزی بەشداری تەواو لە دەسەڵاتدا بەدیبهێنێت، لە ڕاستیدا

---

١ـ بروكلمان: ص١٨٦.

٢ـ الجهاشياري: ص١٥١.

٣ـ بۆ پێگەی و شوێنی یەحیای لای ڕەشید بگەڕێرەوە بۆ: الجهشیاری ص١٧٧.

٤ـ بۆ دەقی پێسپاردنەکە ببگەڕێوە بۆ: الجهشیاری ص١٧٧.

٥ـ هەمان سەرچاوە، الطبري: ج٨ ص٢٥٣.

٦ـ الجهشياري: ص١٧٨.

ئەو ماوەیە بەماوەی دیارکەوتن و پڕشنگداری و سەردەمی زێرینی بەرمەکیەکان دادەنرێت.

فەزڵ برای شیری خەلیفەبو، ڕەشید سەرپەرشتی پەروەردەکردنی ئەمینی کوڕی دابویە دەست و چەند پایەیەکی کارگێری و سەرکردایەتی دابویەدەست، بەتایبەتی لە ڕۆژهەڵاتدا کە فەزڵ توانی لەوێ ڕاپەڕینێکی ئابوری و بیناسازی بە دیبهێنێت و ئاسایش و ئارامی بچەسپێنێ[1].

جەعفەریش لە دەوروبەر و خزمەتی ڕەشیددا بو لەبەر ئەوەی مۆرك و سروشتێکی سادەی هەبو[2]. ئیتر بە شەو و ڕۆژ لەگەڵ هاروونددا بو، ئەو لە هەموو بەرمەکیەکان زیاتر لەگەڵ هاروونددا بو و بەبرا ناوی دەبرد ولەیەك بەرگدادادەنیشتن[3].

لە ئەنجامی ئەو وابەستەبونەدا جەعفەر تەواوکاری کردە سەر ڕەشد تا ئەوەی تایەتمەندیەکانی بەسەر هاروونددا چەسپان و جەعفەر لە بەشی ستەملێکراوان لەگەڵ هاروونددا بەشداری دەکرد. هاروون چاودێری لێدان و نەخشە پۆستەی دایە دەست جەعفەر[4]، هەروەك فرمانی کرد تا لەسەر درهەم و دیناری شاری سەلام و موحەممەدیە ناوی جەعفەر بنەخشێنرێت و ویلایەتی مەغریبی لە ئەنبارەوە تا ئەفریقیا دایەدەست، وێرای خوراسان و سجستان و تەبەرستان و ئەرمینیا و ئازەربایجان[5]، دەی ئاسایی بو لەپایەیەکی وادا ڕەشید ڕێنموونی بمات تا چەند سیاسەتێکی دیاریکراو بگرێتەبەر[6].

---

١ـ هەمان سەرچاوە، ص١٨٩ـ ١٩١، ١٩٣.

٢ـ إبن الطقطقا: ص ٢٠٥.

٣ـ الجهشیاري: ص٢٠٤.

٤ـ ئەمە داهێنانێکی نوێ ودەستکەوتێکی سەرسوورهێنەر بو، چونکە خەلیفەکانی پێشترخۆیان چاودێری لێدانی درهەم و دیناریان دەکرد.

٥ـ المقریزي: شذور العقود في ذکر النقود: ص١١ـ ١٢، الطبري: ج٨ ص٢٤٢، ٢٥٢.

٦ـ العمرو: ص٢١٨.

لە ڕێزی بەرمەکیەکاندا موحەممەدی کوڕی خالیدی کوڕی بەرمەك دەرکەوت، کە پەردەداریی ڕەشیدی وەرگرت و موسای کوڕی یەحیای کوڕی خالیدیش بوبە والی شام[١].

ئەو دابەشکردنەی پایە گەورەکانی دەوڵەت هەروا خۆبەخۆ نەبون، بەڵکو بەرمەکیەکان دەیانویست چوار دەوری ڕەشید بدەن تا جووڵە و بزاوتی ڕەشیدیان لەدەستدابێت و ڕەشید بەپێی خواستی ئەوان بجولێتەوە، هەروەك تێبینی ئەوە دەکەین زۆربەی پیاوە دیاریکراوەکانی ناو دەوڵەت لەدەست کردو شوێنکەوتوانی ئەوانن تا ئاستێك ڕەشید بەسەختی دەیتوان کەسێکی ناو دەوڵەت بدۆزێتەوە پەیوەندی بە بەرمەکیەکانەوە نەبێت تا هەندێ کاروباری دەوڵەتی بداتە دەست[٢].

بونی سیاسەتی بەرمەکیەکان سێ تایبەتمەندی هەبو،[٣]کە بریتین لە:

یەکەم: ئەم بنەماڵەیە لەچاو بونی سیاسی پێشینەکانی خۆیان یان هاوسەردەمیەکانیان وەك ئەبو موسلیمی خوراسانی تەمەنیان درێژەی کێشا.

دووەم: ئەو گەشەسەندنە سیاسیەی ئەو خێزانە کە بەپێی نەخشە و پلان بو، ئەو لەسەرەتاوە بەرۆلێکی ئاسایی ناو بزووتنەوەی عەبباسی دەست پێدەکات و گەشەدەکات تا ئەوەی هەندێ پایەی دەوڵەت دەگرێتە دەست، پاشان تەواو ڕۆدەچنە ناو بنەماڵەی عەبباسی و ڕەگدا دەکوتن بەو واتایەی ئەو گەشەسەندنە بەرەبەرەوەك پێناوێکی جێ بەجێکار گەشە دەکات تادەگاتە دەستوەردانەی سیاسەتی دەوڵەت.

سێیەم: بەردەوامی پەیوەندی باشیان لەگەڵ خەلیفەکاندا، ئەمە بێجگە لە چەند ماوەیەکی کەم کە بنەماڵەکە تیایدا بەرەو ڕووی هەندێ ناڕەحەتی بونەتەوە[٤].

---

١ـ الجهشياري: ص١٨٧، الطبري: ج٢ ص٢٥١.

٢ـ الجهشياري: ص٢٥٤.

٣ـ العمرو: ص٢٣١.

٤ـ سەبارەت بە تێکچوونی پەیوەندی نێوان بەرمەکی و عەبباسیەکان بگەڕێرەوە بۆ: الطبري: ج٨ ص٥٤ـ ٥٦.

کۆتا پلەی ئەو بنەماڵەیە لە ژیانی خەیزەرانی دایکی ڕەشیددا هاتە دی، جا کاتێ خەیزەران لە ساڵی(١٧٣ك/٧٨٩ز)دا مرد، ممتمانەی خەلیفە بە ئەندامنی بەرمەکیەکان بەرەبەرە کەمی کرد تا ئەوەی لێیدان.

مێژوونووسان لە هۆکاری لێدانی مەرمەکیەکاندا ڕاجیاوازی و ناکۆکییان هەیە، پێدەچێ ئەو ناکۆکیە بەهۆی دەستنیشان کردنی ڕۆڵی بەجێگەیەنراوی بەرمەکیەکانەوە بێت، چونکە گێڕەرەوان یان لەبەرژەوەندی یان لەدژی بەرمەکیەکان قسەیان کردووە، جگە لەوەی ڕەشید ئەو هۆکارانەی نیشانن نەداوە.

زیارتر دەتوانین بڵێین ئەو هۆکارانە بۆ دوو پاڵنەری سەرەکی دەگەڕێنەوە، سیاسی و دارایی، لە ڕووی پاڵنەری سیاسیەوە، ڕەشید لە دوای تێپەربونی چەند ساڵێك بەسەر دەرکەوتنی بەرمەکیەکاندا بۆی ڕوون بویەوە کە بەرمەکیەکان مەترسیەکی کرداری و دیاریان بۆ سەر دەوڵەتەکەی پێکهێناوە، ئەو دید و مۆرکەیش بەهۆی چەند هۆکارێکەوە پەیدابو، گرنگترینیان خواستی بەرمەکیەکان بۆ تالیبیەکان و دەمارگیری و ڕەگەز پەرستی بو[١].

بەرمەکیەکان لەڕووی تالیبیەکانەوە چەند خواست و حەزێکی سیاسییان نیشانداو مێژوویان وا دەڵێت کە سۆزیان بۆ یەحیای کوڕی عەبدوڵڵای عەلەوی و ئەحمەدی کوڕی عیسای کوڕی زەید[٢] هەبوە، ئەمەش لەگەڵ پەیوەندی دوژمنکارانەی نێوان عەبباسی و تالیبیەکاندا یەکناگرێت.

سەبارەت بەڕەگەزپەرستی فارسییان[٣]، لەبەر کەمی ماددەی مێژووی شتەکە تەواو ڕوون نیە، بەڵام زۆری نائاسایی و حەساسیەتی ڕەشید بەرامبەر هەڵسوکەوتی بەرمەکیەکان و بەبێ گوێدانە هاروون هەڵوێست نواندنیان ئەو شتەی لەلا گەورە و سەخت کرد، کەش و باری گشتی تا ئەوساتانەش لە تۆمەتباربون نزیکتربو، بەڵام

---

١ـ العمرو: ص٢٣٦ و دواتر.

٢ـ بۆ ئەو پەیوەندیە بگەڕێرەوە بۆ: الجهیشاری: ص٢٤٣، الطبري: ج٨ ص٢٨٩.

٣ـ العمرو: ص٢٣٨ـ ٢٤٠.

ئەوە ناشاردرێتەوە کەهەمیشە ڕەگەزی فارسی لە کۆمەڵگەی عەبباسیدا بەهۆگری بۆ فارسەکان تۆمەتبار کراوە.

لە ڕووی پاڵنەری داراییەوە: بەرمەکیەکان دارایی دەوڵەتیان گرتبویەدەست خۆیان و هەموو کاروبارەکانیان بەدەست بو، تائەوەی دەڵێن: (ڕەشید پێویستی بەماڵێکی کەم بوکەچی دەستی نەدەکەوت)[1] لەکاتێکدا بەرمەکیەکان پارەیەکی زۆریان خەرج دەکردو دەبەخشی، ئەوان لەو هەڵووڕاندنە داراییەدا خەلیفەیان کۆتکردبو، هەروەك لەهەڵوێستی سیاسیشداهەمان کاریان ببە خەلیفە کرد بو.

وێرای ئەمەش: پاشملە باسکردن هۆکارێکی تربو تا کاربکاتە سەر ڕەشید تا لە بەرمەکیەکان بدات، چونکە ناحەزانی بەرمەکیەکان هەموو دەرفەتێکیان دەقۆستەوە تا دڵی هاروون لە بەرمەکیەکان کرمۆ بکەن و گومان لە هەڵوێستیان لای ڕەشید دروست بکەن.[2]

هەرچۆنێك بێت ڕەشید لەشەوی یەکەمی سەفەریساڵی(١٨٧ك/٨٠٣) داجەعفەری کوشت و یەحیا و منداڵەکانی تری بەدیلگرت ودەستی بەسەر شمەك و ماڵ و سامانیاندا گرت، یەحیا لە ساڵی(١٩٠ك/٨٠٥ن)و فەزڵیش لە ساڵ (١٩٣ك/٨٠٨)دا مردن[3].

بەمجۆرە بەرمەکیەکان کۆتاییان پێهات، ئەمەش هێمای پێکدادانی نێوان دەسەڵاتی وەزیرەکان و دەسەڵاتی خەلیفەکان بو، هەروەك ئەمە بەڵگەی جیاوازی بەرژەوەندی ئەمان و خواستی ئەوانە،[4] پەیوەندی نێوان ئەوان ڕەشید بەشێك لە پەیوەندیەکانی نێوان عەباسیەکان و ئەوڕەگەزە فارسیانە پێکدێنێت کە ئامانجیان بەدیهێنانی خواستە سیاسیەکانی ڕەگەزی فارسی بو[5].

---

١ـ الجهشياري: ص٢٤٦، الطبري: ج٨ ص٢٨٧ـ ٢٨٨، محمود و الشريف: ص١٠٩.

٢ـ هەمان ئەو دوو سەرچاوە: ص٢٤٥ـ ٢٦١، ص٢٩٤.

٣ـ الطبري: سەرچاوەی پێشوو: ص٣٤١، إبن كثير: ج١٠ ص٢٠٤ـ ٢٠٥.

٤ـ الدوري: ص١٣٦.

٥ـ العمرو: ص٢٥٨.

# پەیوەندییە دەرەکیەکان لە سەردەمی ڕەشیددا

## پەیوەندی لەگەڵ بیزەنتیەکاندا:

لەسەردەمی ڕەشیددا ململانێی نێوان موسڵمانان و بیزەنتیەکان بەردەوام بو، بەڵام جەنگی نێوانیان بەپێی پلانێکی دیاریکراو و بەئامانجی فەتح کردنێکی ڕێکخراو، یان سەقامگیری بەردەوام نەبو، بەڵکو چەند جەنگێکی وابون،کە باودۆخی هیچ کام لەو دوولایەنەیان نەدەگۆری و خەلیفە بە وەرگرتنی سەرانە دەستبەردار دەبو، بەڵام پێکدادانەکان زاڵبونی سەربازی موسڵمانەکان و کورتبینییان بەهۆی بەهەند وەرنەگرتنی بارودۆخی نا لەباری ناوخۆیی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی نیشان دەدات، دەبو ئەو بارەیان بەهەند وەربگرتایە تا جێ پێی خۆیان لەناوچە فەتح کراوەکان بچەسپێنن و لەوێ سەقامگیربن، ئەگەر چی بەهایەکی تایبەتی بەسەر دەمەکەی دەدا[1].

هەر لەگەڵ ئەوەی ڕەشید هاتە سەر خیلافەت یەکسەر گرنگی بەقایم و قۆڵ کردنی ناوچە سەرسنووریەکانی وڵاتی بیزەنتیەکان وبەهێز کردنی سوپای سەنگەرنشینی عەبباسی لەو ناوچەدادا، ئەو سووربو لەسەر ئەوەی دووسیاسەتی جیا کۆبکاتەوە، هێرش بردن وبەرگری کردن، جالەپاڵ چالاکی هێرش بەریدا دژ بەخاکی بیزەنتی، ڕەشید سووربولەسەر پاڵپشتی کردنی بەرگریکاریەکانی ئەوناوچەیە ئیسلامیانەی بەرەوڕووی شالاوی بیزەنتیەکان دەبنەوە، بۆئەمەچەند ناوچەیەکی سەرسنووری لەناو چەند یەکەیەکی کارگێریدا دانا کە لەبەڕێکردنی کاروبارەکانیدا خاوەن هێزێکی دەریایی خودی بێت و لە ناوچە سەرسنوورە جەزیری و شامیەکان جیای بکاتەوە[2]، بۆ ناوچەی سەرسنووریش دوو نیزامی دانا.

یەکەم: نیزامی پێشەوا، کە سەرسنوورەکانی جەزیرە وشامی لە خۆدەگرت و تایبەت کرابو بەڕووبەروو بونەوەی ڕێڕەوە شاخیەکان، ڕەشید بەقەڵا پاڵپشتی کردو

---

١ـ الدوري: ص١١٣.

٢ـ عبدالله: ص٢٤٠ـ ٢٤١.

پارێزەری بۆ زیادکرد.

دووەم: نیزامــی دواوە، هــەرێم و قــەڵاکانی پێــشەوەی لــە خــۆدەگرت و نــاوی (العواصم)ی لێنا[1] کە لە ئەنتاکیەوە بۆ فـورات درێـژ دەبویـەوە،[2](منـبج) پایتـەختی عەواسم بو، دواتر لەدوای ئەو ئەنتاکیە بوبەپایتەخت، ڕەشید قـاسمی کـوڕی خـۆی بۆ ئەمیری ئەوێ هەڵبژارد[3]، ئەرکی ئەم نیزامە پاڵپشتی کـردن ویارمەتیـدانی ناوچـە سەر سنووریەکان و گەیاندنی فریاگوزاری چـەك و شمـەك وسـەربازە، بۆیـە ڕەشـید ئەم ناوچەی بە فریاگوزاری و شمەکی بەردەوام و تایبەت بەپێویستی بەرگریکردن و یارمەتیدان ئامادەکرد.

بیزەنتیەکان لەلای خۆیانـەوە بـۆ بـەرنگار بونـەوەی سەرسـنوورە ئیـسلامیەکان هێڵێکی بەرگریکرییان دانا و خستیانە ژێر چاودێری گەورە سەرکردە سـەربازییەکان کە هەر دوو زنجیرە چیای تـوروس لـە خۆدەگرێـت و لـە فواتـەوە تـا کیلیکیـا درێـژ دەبێتەوە و تایبەتە بە ڕووبەروو بونەوەی چـالاکی موسـڵمانان لـە بـەرەی بـاکووری عێراقەوە.

دووەم: تایبەتە بە ڕووبونەوەی چالاکی موسڵمانان لە بەرەی وڵاتی شامەوە[4].

ئەمە و ناوچـەی سـنوور کـە هەریـەك لـەو دوو هێـزە لـەکاتی جـەنگی نێوانیانـدا دەیانبڕی، چەند قەڵایـەکی لـەخۆ دەگـرت: ئەدنـە، مسیـسە، مەرعـەش، هاروونیـە، حەدەث، مەلتیە، تەرسووس.

پـاش کۆتـای هـاتن بـە ئامادەسـازی و پاڵپـشتیکردن، پێکـدادانی ئـال و گـۆڕی سـەربازی دەسـتی پێکـرد و بزووتنـەوەی هاوینـە چـالاك بـو و عەبباسـیەکان هـەر دەرفەتێکیان بۆ بلوایە دەیان قۆستەوە تافشاری سیاسیان زیادبکەن، لەقۆناغێکی

---

١ـ بۆیە نانرا عەواسم چونکە نـاهێڵێ سـەر سـنوورەکان بکەونـە دەسـت دوژمـن، هـەروەها ڕەشید لەم ناونانە ئامانجی ئەوە بو نێـوانی ئـەو ناوچـە و نێـوان قـەڵا سـەر سـنوورە بیزەنتیـە دەرەکیەکانی باکووری بە بەناوی سەر سنوور (ثغور) ناسرا بون جیابکاتەوە.

٢ـ عبدالله: ص٢٤٢ـ ٢٤٣.

٣ـ الطبري: ج٨ ص٣٠٢.

4 -Bury, J.B:A Hist of the Later Raman Empire, IIpp 244— 245.

بەرنگاربونەوەکاندا ڕەشید پێگەی دانیشتنی خۆی گواستەوە بۆ (ڕەقە) تا لەمەیدانی چالاکیەکانەوە نزیك بێت، هەروەك خۆی لە هەندێ هێرشی هاوینە دابەشداری کردو لە ساڵی (١٨١ك/٧٩٧ز)دا قەڵای(سفساف)ی فەتح کرد[١]. یەکێ لە دەستە و هێزەکانی توانی بگاتە ئەنقەرەی قوڵایی خاکی بیزەنتی و سنووری ئوبسیکون ببڕێت و بگاتە ئەفسوس لەسەر کەناراوی دەریای ئیجە [٢].

ژنە ئیمپراتۆر(ئیرین) لەبەردەم سەرکەوتنەکانی موسڵماناندا دەستەوستان وەستاو حەزی لە ڕێکەوتن بو تا ئەوەی لە ساڵی (١٨٣ك/ ٧٩٩ز)دا ڕێککەوتنیان بەست وبەوپێیە:

- دیلەکان ئاڵ وگۆر پێبکەن.
- ئیرین سەرانەیەکی ساڵانەبدات [٣].
- ئاگربەستەکە ماوەی چوار ساڵ بەردەوام بێت.

ئاگربەستەکە تاساڵی (١٨٧ك/٨٠٣ز) بەردەوام بو تائەوەی دژ بەئیرین پیلانێك دانراو لەسەردەسەلات لابرا و نقفوری یەکەم کورسی دەسەلاتی بیزەنتی گرتە دەست،[٤] ئەو پێی وابو دەتوانێت بەرەورووی موسڵمانان بوەستێتەوە، بۆیە ئامادە نەبو ئەوسەرانە بدات، کە پێشتر ئیرین بەڵێنی دابو بیدات، بەوەیشەوە نەوەستا، بەڵکو داوای ئەوەی دەکرد ئیرین پێشتر چی بەخشیوە دەبێت ڕەشید هەمووی بداتەوە بەو بەڵگەی ئەو کارەی ئیرین تەنها لاوازی ئافرەت بوە، ئەمەش ڕەشیدی تووڕە کرد[٥].

---

١ـ الطبري: ج٨ ص٢٦٨.

٢ـ الطبري: ج٨ ص٢٦٨ـ ٢٦٩، Camb. Med. Hist: Iv p٧٠٧

٣ـ سەرچاوەکان بڕی ئەو سەرانەیان دیاری نەکردووە کە دەبێ ئیرین دابێتی، ڕای ڕاستر وایە کە هێندەی ئەو بڕە بوە کە پێشتر بە خەلیفە مەهدی دراوە و بڕەکەی لە نێوان حەفتا و نەوەد هەزار دیناردایە بگەڕێرەوە بۆ: عبدالله ص٢٧٥.

٤ـ Ostrogorsky: A Hist of Byzantine states p١٥٦.

٥ـ الطبري: ج٨ ص٣٠٧ـ ٣١٠.

بە پەلەوەلامی ئەم کارەدرایەوەوخەلیفە لە ساڵی(١٨٧ك/٨٠٣ز)دا سەرکردایەتی هەڵمەتێکی سەربازی کرد[١] و چوویە ناوچەی کە بادوکیا. نقفوز بینی ناتوانێ بەرەو ڕووی ڕەشید بوەستێ، بۆیە داوای ڕێککەوتن وپێدانی خەراجێکی ساڵانەی لە بەرامبەر کشانەوەی موسڵمانان لە ناوچەکە کرد، ڕەشیدیش بەڕێککەوتنەکە ڕازی بو و بەو دەستکەوتەڕازی بو و گەڕایەوە بۆ وڵاتی خۆی[٢].

بەڵام نقفوز دووبارە بە خراپ هەڵوێستی سەربازی ئەوی تەماشاکردو پەیمانەکەی هەڵوەشاندەوەو لە ساڵی (١٩٠ك/٨٠٦ز) دا هێرشی کردەسەر عەین زربەو (الكنيسه السوداو) و ئەدنە ودەستی بەسەر تەرسودا گرت و فشاری خستە سەر مەرعەش و موسڵمانان نەیانتوانی ڕێگەی لێبگرن و لەڕوویدا بوەستن، چونکە خەلیفە تەواو سەرقاڵی سەرکوت کردنی بزووتنەوە بەرهەڵستکارە ناوخۆییەکان بو، وێرای باری خراپی ساردی سروشتی، کە ڕێگەی بە گەڕانەوەی هێزە ئیسلامیەکانی بۆ جەنگان لەگەڵ نقفوز نەدەدا، بەڵام ئەم بارودۆخە زۆر درێژەی نەکێشا[٣]، تا ئەوەی ڕەشید باری ناوخۆیی چاککرد و بڕیاریدا بۆ تۆڵەسەندنەوە لە ئیمپراتۆر بگەڕێتەوە بۆ ناوچە سنووریەکان و ڕێبەرایەتی هەڵمەتێکی گەورەی کردوسنووری تێپەڕاند و ماوەیەکی زۆر ڕوو چوویە ناو خاکی بیزەنتی و هەر قلە و توانەی گرتەدەست و هێزێکی سەربازیشی بۆ هەرێمی ئەنقەرەنارد[٤].

نقفوز زانی ناتوانێ نەڕێگری موسڵمانان بکات و نە فشاریان بۆ سەر خاکەکەی کەم بکاتەوە و ترس و بیم دایگرت و کەوتە دۆزینەوەی پێناوێك تالەو تەنگەژەیە

---

١ـ لەکتێبی(دروس في التأريخ الأسلامي) شێخ محمد خضری بەگ داهاتووە، کە نقفوز خۆی بەپاشای ڕۆم و هارونی بەپاشای عەرەب داناوە وداوای بڕە پارەی بەخشراوی ئیرینی کردووە، ئەگەرنا شمشێر لەنیوانیاندا دەبێت، هارونیش بەوجۆرە وەڵامی داوەتەوە: (بسم الله الرحمن الرحيم لەهارووني ئەمیری باوەڕدارانەوە بۆ نقفوزی سەگ، ئەوەی دەتەوێت ببیبستی دواتر دەیبینی) ئەوکات هاروون یەکسەرسوپای موسڵمانانی بە سەرکردایەتی خۆی بەڕێخست. وەرگێر

٢ـ الطبري: ج٨ ص٣٠٨.

٣ـ البلاذري: ص٢٣٥.

٤ـ The ophanes: p٩٦٩.

ڕزگاری ببێت، تەنها پێناویش ڕێککەوتن بو، بۆیە پەیوەندی بە ڕەشیدەوە کرد و پێشنیاری ئاشتی بۆ کرد [١].

لە بەر ئەوەی نزیکی زستان بو، ڕەشید ڕازی بو ڕێککەوتنی لەگەڵدا ببەستێت و ئەم خاڵانە لەخۆ بگرێت:

- نقفوز دەبێ ساڵانە بەبڕی سێ سەد هەزار دینار خەراج و سەرانە بدات.
- نابێ نقفوز ئەو قەڵایانە دروست بکاتەوە کە موسڵمانان وێرانیان کردون وەك: هەرقلە وئەنقەرەو دبسە وسەفساق.
- ڕەشید لەلایەن خۆیەوە بەڵێن بدات قەڵاکانی (ذیلیکیلاع و سەملە وسنان) وێران نەکات.
- ئەو سەربازگانەی لە حەوزە و بازنەی ڕەشیددان بگێردرێتەوە بۆ بیزەنتیەکان.
- ئاگر بەستنەکە ماوەی سێ (٣)ساڵ بەردەوام بێت [٢].

پاش ماوەیەکی کەم نقفوز زانی چالاکی چڕوپڕی ئیسلامی لە ناوچەی باشووری ئاسیای بچووکی ناوچەی قەڵەمڕەوی موسڵمانانەوەیە، هەروەك موسڵمانان دەستیان بەسەر ڕێگەکانی چوون بەرەوناوچە گرنگەبیزەنتیەکاندا گرتووە، لەلایەکی ترەوە هەستی بەسوکایەتی کرد کە بۆچی ڕازی بوە سرانە بدات، بۆیە بڕیاری دائاگر بەستەکە هەڵبوەشێنێتەوەوئەو قەڵایانەی لە ڕێککەوتنەکەدا بڕیاری قەدەغەکردنی نۆژەن کردنەوەیان درابو، نوێی کردنەوە، ڕەشید کەبەمەی زانی دەستی بە چالاکی سەربازی خۆی کردو توانی بۆ جاری دووەم قەڵای (دبسە) فەتح بکات [٣].

پاشان ڕەشید خۆی بۆگرنگیدان بە چارەسەری کێشەکانی خوراسان یەك لای کردەوە و دوای ئەوە دەرفەتی لەباری بۆ درێژەدان بەچالاکی جیهادی خۆی دژ بە

---

١ـIbid.

٢ـ الطبري: ج٨ ص٣٢١ـ ٣٢٢.

٣ـ The ophanes: p٩٦٩.

خاچ پەرستان بۆنەلوا، کۆتا چالاکی ڕەشید (لەو بوارەدا) بەستنی ئاگربەستێکی تریو کەبەو پێیەئاڵوگۆری دیلەکان کرا.[١]

جەنگەکانی ڕەشید لەگەڵ بیزەنتیەکاندا تەنها لەئاسیای بچووکدا نەبو، بەڵکو گەیشتەدەریایی سپی ناوەڕاست ولە چەند هەوڵێکدا هەولێدا لە لایەکەوە مەڵبەندی موسڵمانان لە دورگە نزیکەکاندابگێڕێتەوە و لەلایەکی ترەوەیارمەتی هەڵمەتە و شکانیەکان بدات، بۆیە دەریایی ئیسلامی هێرشی کردە سەردەریایی بیزەنتی.

هەروەك لە ساڵی (١٩٠ك/٨٠٦ز) لە دوای ئەوەی خەڵکی جەزیرەی قوبروس ئەو پەیمانی بێلایەنیەیان هەڵوەشاندەوە کە لە ساڵی (١٧٩ك) دا بۆ ڕێکخستنی پەیوەندی لەگەڵ موسڵمانەکان و بیزەنتیەکاندا بەستبویان ڕەشید هێرشی بردەسەر قوبرس[٢]، هەروەك موسڵمانان هەێرشیان بردەسەر دوورگەی کریت[٣].

سەردەمی هاروون ڕەشید بە نیشاندانی سەردەمی هێزی خیلافەتی عەبباسی دادەنرێت تا ئەوەی بو بەشتێکی خەیاڵی و نائاسایی، خەلیفە ڕەشیددەیزانی نتوانێ ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی لەبون بسرێتەوە، بۆیە تەنها بەوەوەوەستا کە بیزەنتیەکان سەرقاڵی خۆیان بکات لاوازیان بکات و لە کاری بەرهەمداری سەربازی دژ بە موسڵمانان بێبەشیان بکات[٤]، ئەمە وای لە نقفوز کرد، کە لەڕۆژی کۆچی دوایی هاروون ڕەشید لە(سێ مانگی جەمادی پانی ساڵی١٩٣ك، بیست و چواری مانگی ئازاری ساڵی ٨٠٩ز) وەك جەژنی بیزەنتیەکان ڕابگەیەنێت.

**پەیوەندی لەگەڵ فرەنجەکاندا**

جیهانی ئیسلامی لە سەردەمی ڕەشیددا بونی دوودەوڵەتی ئیسلامی بەخۆیەوە بینی، کە بریتین لە دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی لە ڕۆژهەلات، دەوڵەتی ئومەوی لە ئەندەلوس، ئەو کات جیهانی مەسیحیش بۆ دوودەوڵەتی گەورە دابەش ببو:

---

١ـ الطبري: ج٨ ص٣٤٠.

٢ـ عبدالله: ص٢٩٨ پەراوێزی ٣.

٣ـ هەمان سەرچاوە: ص٣٠٤.

٤ـ هەمان سەرچاوە: ص ٣١٠، العسلي، بسام هارون الرشيد: ص٣٩ـ ٤٠.

دەوڵەتی بیزەنتی لە ڕۆژهەڵات، دەوڵەتی فرەنجی کارۆلینجی لە ڕۆژئاوا، هەندێ لە مێژوونووسە ڕۆژئاواییەکان نەیاری هەرێمایەتی دەکەنە بیانوی ئەوەی هەندێ لەو لایانانە لەسەر چەند ئامانجێکی هاوبەش پێککەیشبن و خیلافەتی عەبباسی لەگەڵ فرنجەکاندا نزیکبوەتەوە، بیزەنتیش لەگەڵ ئومەویەکان لەئەندەلوس نزیکبوەتەوە، ئەو نزیکبونەوانە هۆکار و پاڵنەر و ڕەنگدانەوەی خۆیان لەسەر پەیوەندییەکانی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواهەبوە.

سروشتی پەیوەندی نێوان دەوڵەتی فرنجە و دەوڵەتی ئومەوی لە ئەندەلوس لە سروشتی پەیوەندی نێوان دەوڵەتی فرەنجی و دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی جیاوازبو، پەیوەندی نێوان دەوڵەتی فرەنجی و دەوڵەتی ئومەوی بەهۆی هاوسنوورییان و ئاڕاستەی موسڵمانان بۆ فراوانخوازی بەرەو باکوور لە لایەك و هەوڵی کارۆلینجیەکان بۆ دەست گرتن بەسەر ئەوروپاو بەمیراتگرتنی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی لەلایەکی ترەوە کە دەبویە هۆی پێکدادانی نێوانیان، جۆرە نالەباری دوژمنایەتیەکی بەخۆیەوە دەبینی.

بەڵام سەبارەت بە پەیوەندی نێوان فرنجە و عەبباسیەکان، لەچاوچنۆکی کارۆلینجیەکان دوور بو، ئەمە دەرفەتی لە باری بۆ بەر پابونی چەند پەیوەندیەکی سیاسی نێوان هەردوو لای ڕەخساند [١].

سەرچاوە ڕۆژهەڵاتیەکان ئیسلامیەکان بن، یان مەسیحیەکان، ئامازە بەو پەیوەندییانە ناکەن، تەنها سەرچاوە

لاتینیەکان باس لە پەیوەندی ڕەشید و شارلەمانی پاشای فرەنجەکان دەکەن، بەڵام ئەمەش ئالۆز و ناڕوونە، بۆیە مێژونوسان زۆر متمانەیان پێ نیە،[٢] دیارترین مێژوویەك کە پێشتر ئەو پەیوەندیەیان نیشاندابێت (ئینهارد)ی مێژوونووسی شارلەمان و نووسەری ژیانی و قەشە (سانت جول)و هەواڵە پاشاییەکان بوە.

---

١ـ الرحيلي: سليمان ضفيدع: العلاقات السياسية بين الدولتين العباسية و دولة الفرنجة: ص٢٢ـ ٢٣.

٢ـ الدوري: ص١١٧.

بەپێی ئەوسەرچاوانە پەیوەندی نێوان ئەو دوانە لەساڵی (١٨١ك/٧٩٧ن) دادەستی پێکرد کاتێ شارلەمان دوو وەفدی بۆ ڕۆژهەڵات نارد، یەکەمیان بۆ لای خەلیفە ڕەشیدو دووەمیش بۆلای بەتریکی قودس، دەستەی یەکەم لەسێ کەس پێکهاتبو کە دوانیان فرەنجی و یەکێکیان جولەکەیەك بو، کە بەئیسحاق بانگدەکراو کاری وەرگێرانی دەکرد[1]، بەڵام ئەو سەرچاوانە باسی شوێن بینینی نوێنەرانی شارلەمان و ڕەشید ناکەن.

ئەندامانی دەستە کە لەگەڵ خەلیفە قسەیان لەسەر ڕێگەکانی بەهێزکردنی پەیوەندی نێوان دوو دەوڵەتەکە کردووە و داوایان لە خەلیفە کر دتا ئاسانکاری بۆ حاجیە کاثولیەکان بۆ شوێنە پیرۆزەکان بکات و لە دەست ئەرثەدۆکسەکان بیانپارێزێت، ئینهارد باس لەوە دەکات کە ئامانجی ئەو باڵوێز و نێردراوە بەدەستخستنی فیلێك بو کە لای خەلیفە بو[2].

گەشتی دەستەکە ماوەی سێ ساڵی خەیاند ولەماوەدا دوو فرەنجیەکە مردن و ئیسحاق خۆی بەتەنهالەگەڵ فیلێکدا کە هارون بەدیاری بۆشارلەمانی ناردبو گەڕایەوە،[3] لە ساڵی (١٨٣ك/٧٩٩ن) دا ڕەشید دەستەیەکی بۆ کۆشکی فرەنجی نارد کە لە دوو کەس پێکهاتبون، یەکێکیان فارس بو و نوێنەری خەلیفەبو، ئەویتریش مەغریبی بو و نوێنەری ئیبراهیمی کوڕی ئەغلەب بو، دەستەکە گەیشتە (ئاخن)ی پایتەختی کارۆلینجیەکان، ئەمە لەهەمان کاتدا کەئیسحاق گەیشت، ئەمەش وەڵامدانەوەی یەکەم نێردراوی شارلەمان بوە،[4]پاشان شارلەمان لە شاڵی (١٨٦ك/٨٠٢ن) شارلەمان باڵوێزی دووەمی خۆی بۆ لای ڕەشید نارد، ئینجا ڕەشید لەساڵی (١٩٢ك/٨٠٧ن) دا باڵوێزی دووەمی خۆی نارد [5].

---

١ـ Runciman, S: charrlemagne and Palestine: Ip٦٠٧.

٢ـ Einhard. The Life of charelemagne, p٤٢.

٣ـ Joranson, E: The Alleged Frankish protectorata in Palestine,٢٤٤.

٤ـ الرحيلي: ص٣٤.

٥ـ هەمان سەرچاوە: ص٧٣.

لەو کاتەی باڵوێزی ڕۆژئاوایی لە ڕۆژهەڵات بو نزیکبونەوەیەکی دۆستانە لە نێوان بەتریکی قودس و شارلەماندا ڕوویدا و باڵوێز و دیاری لە نێوانیاندا ئاڵوگۆر پێکرا، بەتریك کلیلی کلێسای (قیامە) و کلیلی شاری قودس و ئاڵایەکی بۆ پاشای فرەنجی نارد [1]. سەرچاوەکان باس لەوە ناکەن کە بەتریك هیچ داوایەکی لە شارلەمان بو بێت.

سەبارەت بەو پاڵنەرانەی بونە مایەی دروست بونی پەیوەندی نێوان هەردوولا بریتیە لە:

*** پاڵنەرەکانی ڕەشید:**

ـــ نەیاری تەقلیدی نێوان موسڵمانان و بیزەنتیەکان پاڵی بەخەلیفەی عەبباسیەوە نا تا قەڵەمڕەوی مەعنەوییان لە نێوان مەسیحیەکانی ڕۆژهەڵاتدا لە ڕێگەی پەیوەندی کردنی بە ڕۆژئاواوە لەناوببات.

ـ دوژمنایەتی خەلیفەی عەبباسی بۆئومەویەکان لەئەندەلوسیش لەخۆدەگرێت، بەوئامانجەی تاجی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی بەمیرات بگرێت، پێویستی بە پاڵپشتی مەعنەوی خەلیفە هەبو تالە لایەن عەرەبە ئەندەلوسیەکانەوە بەرەو ڕووی بەرهەڵستکاری نەبێتەوە، وەك ئەو بەرنگاربونەوەی لەکاتی شاڵاوی بۆ سەر ئەو وڵاتە لەساڵی(١٦٢ك/٧٧٨ز)دابەرەو ڕووی بویەوە و تووشی شکستی کرد.

ـ ناکۆکی نێوان ئەو و ئیمپراتۆری بیزەنتی لەسەر بە میراتگرتنی تاجی دەوڵەتی ڕومانی.

ـــ دەیوست ئاسانکاری بۆ ئەو هاوڵاتیانەی بکات، کە دەیانەوێت سەردانی ناوچەپیرۆزەکان بکەن ولەناوچانەیشدا قەڵەمڕەوی مەعنەوی بۆ خۆی دروست بکات.

ـــ دوژمنایەتی نێوان پاپای هاوپەیمانی شارلەمان و نێوان بەتریکی قوستەنتینیە و ناکۆکیان لەسەردەسەڵاتی ڕۆحی لەسەر جیهان مەسیحی [2].

---

١ـ doranson:pp ٢٤٠ :Ibid: p٦١٠ـ ٢٤٦.

٢ـ الدوري: ص١١٨، ٢٤١ Joranson: op. Cit, pppـ Runciman, op. Cit, p٦٠٦ , ٢٤٦

بەڵام ڕێرەوی ئەوپەیوەندییە وبونی ئەوپاڵنەرانە لەپیشتیەوە، مشتومڕێکی بێکۆتای لای مێژوو نووسان ناوەتەوە، هەیانەدەڵێ: پەیوەندی وانەبوەباوەڕی بەبونی هیچ پەیوەندیەکی سیاسی نێوان دەوڵەتی عەباسی ودەوڵەتی کارۆلینجیەکان نیەو پەیوەندی بازرگانیش بە دوور لە خەلیفە وپاشاکان تەنها ئەندامانی ناو کۆمەڵگەی هەردوو لای گرتۆتەوە.

لێرەدا هەندێ لە مێژوونووسان ئامانجی ئەو نێردراوانە لە ڕوانگەی پاڵنەری ئاینییەوە، کە دیارترین هۆکارن لێکدەدەنەوە، ئەمەش لە دیوی پاراستنی ئازادی مەسیحیەکان بۆسەردانی ناوچە پیرۆزەکانی فەلەستین وپاراستنیان، شارلەمان بۆ بەدیهێنانی ئەوە بەڵێنی هاروون ڕەشیدی وەرگرت.

دەستەی سێیەمی مێژوونووسان بە ئاراستەیەکی سیاسی و بەئامانجی یەکخستنی دیدی سیاسی نێوان دوودەوڵەت سەیری دەکەن بەو پێیەی هەردووکیان لەو کاتەدا لەزۆربەی دیمەنە سیاسیەکانی دەوڵەتدا بەشداری دەکەن.

دەستەی چوارەمی مێژوونووسان پێیان وایە پاڵنەرەکانی ئەم نوێنەرناردنە هەوڵی بەستنی هاوپەیمانیەکی نێوان دوو دەوڵەتەکەیە بەو ئامانجەی ڕەشید دژ بە دەوڵەتی بیزەنتی بوەستێ و شارلەمانیش دژ بە دەوڵەتی ئومەوی لە ئەندەلوس بوەستێ، ئەمەش بەو پێیەی هەریەك لە عەبباسیەکان دژ ببە ئومەوی و فرەنجەکان دژ بە بیزەنتیەکان دوژمنایەتیان هەبو[1].

بەڵام ڕاستی مێژووی بەرپەرچی هەر گومانێکی بونی هاوپەیمانێتیەکی سیاسی لەو جۆرەی نێوان ئەودوو لایەنە دەداتەوە، ئەمەش بەپێی ئەم بەڵگانە (دەیسەلمێنێ کە هاوپەیمانێتی سیاسی لە نێوانیاندا نەبوە):

١ـ مێژووی ئەو ناردنانەوەك لەسەرچاوەکاندا هاتووە هاوسەردەمی پەیوەندییە سیاسیەکانی نێوان ئیمپراتۆرئیرین لەلایەك و شارلەمان لەلایەکی ترەتا ناکۆکیەکانی

---

دیڤز: شارلەمان، ئەم مێژوونووسە باس لەوە دەکات کە شارل بۆ دانانی پەیوەندی لەگەڵ ڕەشیدا ئامانجێکی نادیاری نەبوە و ئامانجی خواستی شەخسی لەو پەیوەندیەوە نەبوە، بەڵکو ڕێزی سوارچاکی و نەبەردی ئیمپراتۆریەتی نەرم ونیانی ئیسلامی گرتووە کە لە زۆر ڕووەوە لەگەڵ ئیمپراتۆریەتیەکەی ئەمدا دەگونجا.

١ـ سەبارەت بەئامانجی ئەونێردراوانە بڕوانە: الرحیلی: ص٣٧ـ ٤٠.

نێوان دەوڵەتەکانیان لەسەر هەرێمی ئەستریا و دلماسیا بەڕێگەی ئاشتی چارەسەر بکەنن ئەوپەیوەندییە پاکانە بەشێوەیەکی گشتی لەنێوان شارلەمان و جێگیرەکانی ئێریندا وەك نقفوز و میخائیلی یەکەم بەردەوام بون [١].

٢ـ ڕەشید لە ململانێ لەگەڵ بیزەنتیەکان پێویستی بەیارمەتی ڕۆژئاوا نەبو، چونکە ڕەشید بەسەر بیزەنتیەکاندا زاڵ بو و بۆتەواو دڵنیاکردنەوەی سەرکەوتنەکانی گەیشتەئەوێ سەرانەی بە سەریاندا سەپاند، بۆ پەیوەندی عەبباسی بیزەنتی پێویستی بەوەنەبو عەبباسیەکان لەبەر دوژمنایەتی هاوبەشیان بۆ بیزەنتە پەیوەندی بەفرنجەکانەوە بکەن [٢].

٣ـ هیچ بەڵگەیەك بۆ ئەوەنیە، کەمەسیحیەکانی ڕۆژهەڵات مەترسیان بۆ سەر سەلامەتی دەوڵەتی ئیسلامی لە سەردەمی ڕەشیددا دروست کردبێت، یان باریان لەژێر دەسەڵاتی عەبباسیداخراپ بوبێت، خەلیفەعەبباسیەکان لە سەردەمی یەکەمی عەبباسیدابەپێی حوکمەکانی شەریعەتی ئیسلامی سەبارەت بەهەڵسوکەوت کردن لەگەڵ ئەهلی ذیممەدا هەڵسوکەوتیان لەگەڵ مەسیحە هاوڵاتیەکانی وڵاتیاندا دەکرد، هەندێکیان (لەمەسیحیەکان) گەیشتنە پایەکی بەرزی ناوکۆشکی خیلافەت و هەنێکیان چەند پایەیەکی ناو کارگێری عەبباسیان گرتە دەست وەك جرجیسی کوڕی جبرائیل و بختیشوعی پزیشکی کوڕی [٣].

٤ـ ناگونجێ ڕەشید واز لەمافە سیاسیەکانی خۆی لەشوێنە پیرۆزەکانی فەلەستیندا بهێنێ تا پاشای فرەنجیەکان بیانگرێتە دەست. سەرچاوەفرەنجەکان هەژارانە ناتوانن ئامانجی ئەو نێردراوانەی نێوان پاشای فرەنجەکان و بەتریکی بەیتولمەقدیس ڕونبکەنەوە، لێرەدا ئاماژەیەکی ناڕوون بە موڵکیەتی پێگەی پیرۆز دراوە [٤].

---

١ـ دیڤز: ص١٨٦، عاقل، نبیە: الأمبراطوریة البیزنطیة، ص١٨٤، حاطوم، نورالدین: تأریخ العصر الوسیط، ج١ ص١٧٨.

٢ـ الرحیلی: ص٤٠.

٣ـ إبن أبي أصیبعة: طبقات الأطباء، ص١٨٣ـ ١٨٦، الرحیلي: ص٦٩.

٤ـ سەبارەت بە ئامانجی نێردراوی نێوان شارلەمان و بەتریکی بەیتولمەقدیس و ڕای لێکۆڵەران لەو بارەیەوە بڕوانە: الرحیلی: ص٧٦ـ ٨٦.

٥ـ بیردۆزە و تێڕوانینی پاراستنی شوێنە پیرۆزەکان لەلایەن شارلەمانەوە خەیاڵ و ئەفسانەیە ومێژوونووسی قەشە (سانت جول) کە لە دەوروبەری پەنجا ساڵ لە دوای مردنی شارلەمان نووسیویەتی دایهێناوە، ئەو قەشەیە زانیاری لە سەرنوێنەرە نێردراوەکان و دیاریە ئاڵووگۆڕپێکراوەکان کۆکردەوە تا چیرۆکێك پێکبهێنێ و تیایدا بڵێت ڕەشید لە دەسەڵاتی خۆی لە فەلەستین سەری بۆشارلەمان دانەوەندووەو داهاتی فەلەستینی بۆ ناردووە[1]، ئەمەش وەك هەوڵی گێرانەوەی دەسەڵاتی مەسیحیەکان بەسەر شوێنە پیرۆزەکاندا.

٦ـ پێشکەش کردنی کلیلی کڵێسای(قیامە)و قودس، وێرای ئاڵایەکیش لەلایەن بەتریکی بەیتولمەقدیسەوە بۆ شارلەمان، واتایەکی سیاسی نابەخشێت، چونکە گێڕەرەوان گرنگیەکی وایان لەوبوارەدا پێنەداوەولەسەر ئەوە یەك دەنگن کە ئەوکارە لە بواری نزا و پیرۆزبای کردنە، شیاوی باسە بەتریکی بەیتولمەقدیس بەبێ ڕەزامەندی خەلیفە کە بەیتولمەقدیس لە ناو دەوڵەتەکەی ئەودایە، ناتوانێت هیچ هانگاوێکی گرنگی سیاسی بنێت[2].

٧ـ شتێ نیە وابکات تا ئەو دوانە هۆکاری دروست کردنی متمانە لەنێوانیاندا بەرپابکەن، هەگیز شتی وانابێت کە هاروون ڕەشید ئامادە بێت بۆ لێدانی موسڵمانانی ئەندەلوس لەگەڵ شارلەمان ڕێکبکەوێت، بەتایبەت ڕەشید زۆر بەتوندی بیری لەگێرانەوەی ئەو وڵاتە نەدەکرد لەکاتێکدا ناچار بوئەفریقیا چۆل بکات[3].

٨ـ سەرچاوە ڕۆژهەڵاتیەکان ئیسلامی بن یان مەسیحی، ئامارژە بەوباڵوێز و نێردراوانە ناکەن، کەچی هەرسەرچاوە ڕۆژهەڵاتیەکان ئاماژەیان بەبونی نێردراوی نێوان ڕەشید وپاشای هیند کردووە[4].

---

١ـ Runciman: Cit., p٦٢٩.

٢ـ الدوري: ص١١٩، الرحيلي: ص٨٢، Jorranson: p ٢٤٨.

٣ـ مؤنس: ج١ ص١٨٣، عبدالله: ص٣١٢، Buckler:pp ٢٢ ـ ٢٥

٤ـ إبن عبدربه: العقد الفريد، ج٢ ص٢٠٣ـ ٢٠٤.

ڕای ڕاستتر ئەوەیە پێدەچێ جۆری پەیوەندی بازرگانی و سیاسی هەبێ کە شێوەی هاوپەیمانێتی سیاسی بەهیچ جۆرێك لەخۆ نەگرتبێت، ئەوەیش لەم پەیوندیانە بەرپرس بو، ئەو بازرگانە جوولەکانە بون کە ئەڵقەی پەیوەندی نێوان ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا بون و لەنێوان فەرەنسا وبەشە ئیسلامیەکان وچیندا بازرگانیان دەکرد، بە تایبەت کە ئەوکات واباوبوە بازرگانیەکان بانگەشەی ئەوە بکەن کە نێردراون تا بەرژەوەندی و کارەکانیان بۆ ئاسان بکرێت [1].

**جێگیرایەتی ـ مردنی ڕەشید**

ڕەشید لەساڵی(١٧٥ ك/٧٩١ز) دا مەحەممەدی ئەمینی کوڕی خۆی وەك جێگیر هەڵبژارد لە کاتێکدا ئەمین تەمەنی لە پێنج ساڵ زیاتر نەبو، ڕەشید لەژێر کاریگەری زوبەیدەی ژنی وخالۆکانی لە بەنوهاشم و فەزڵی کوڕی یەحیا ئەمینی بەسەر عەبدولا مەئموونی برا گەورەیدادا، بەلام هەندێك لەهاشمیەکان لەبەرکەمی تەمەنی ئەمین ئامادە نەبون بەیعەتی پێبدەن[2].

لە ساڵی (١٨٣ك/٧٩٩ز) دا ڕەشید بەیعەتی جێگیرایەتی خۆی بەعەبدولا مەئموونی کوڕی لەدوای ئەمینی برای داو خوراسان و ناوچەکانی سەربە خوراسانی لەهەمەدانەوە تا کۆتایی ڕۆژهەلات دایە دەست مەئموون، ئەمەش لە ژێر کاریگەری جەعفەری کوڕی یەحیادا[3].

لەساڵی(١٨٦/٨٠٢ز)داهاروون بەیعەتی بەقاسمی کوڕی دا تا لەدوای مەئموون ئەو ببێت بەخەلیفە و نازناوی موئتەمەنی لێنا و جەزیرە لەسەر سنوور و عەواسمەکانی دایەدەست، ئەمەش بە کاریگەری عەبدولمەلیکی کوڕی صالحی پەروەردەکەر و مامۆستای قاسمی بو.[4]

---

١ـ الدوري: ص١٢١.

٢ـ الطبري: ج٨ ص٢٤٠ـ ٢٤١.

٣ـ إبن أعثم: ج٤ ص٤٢٢، الطبري: هەمان سەرچاوە، ص٢٦٩ـ ٢٧٥

٤ـ الطبري: هەمان سەرچاوە، ص٤٧٦.

بەمجۆرە ڕەشید کەوتە هەڵەی پێشبینیەکانی، چونکە ترسی لەدەسەڵاتی دوای خۆی هەبو، ئەودەست نیشانکردنی جێگیرانەی و دابەش کردنی دەوڵەت لە نێوانیاندا هەڕەشەیەکە و هەڕەشەی جەنگی ناوخۆیی لە دەوڵەت دەکات، هەروایش بو ڕکابەری نێوان دووبرای گەورەکەی (مەئموون و ئەمین) لە ژیانی ڕەشیدا بویە هۆی ئەوەی خەلیفە لە داهاتووی دەوڵەت لە دوای مردنی خۆی بترسێت، بۆیە چەندکۆرێکی یەك لەدوای یەکی بەست تا لەگەڵ وەزیرو یاریدەرەکانیدا لەسەر ئەو بابەتە قسە بکەن، ڕای کۆتایی ئەوە بو کە لە کەعبە بەڵێن لە هەردووکیان وەربگرێت تا وەفایان بۆ بەڵێنی جێگیرایەتی تایبەت بە هەر یەکەیان هەبێت.

لە ساڵی (١٨٦ك/ ٨٠٣ن) دا ڕەشید حەجی کردو هەر دوو کوڕەکەیشی لەگەڵدا بوتائە و کارەجێبەجێ بکات، لەوێ بەڵێنی لێوەرگرتن تا دەست لە کاروباری یەکترەوە وەرنەدەن و هیچ کامیشیان دەست وەرنەدەنە کاروباری موئتەمەنی برایان، نوسخەیەکی ئەو بەڵێنەیش لە کەعبەدا هەڵواسی تا پیرۆزی ئەو بەڵێنە زیاد بکات و لە جێبەجێ کردنی دڵنیا بێت[1].

ڕەشید لە ساڵی (١٩٣ك/٨٠٨ن) داچووە بەرەو خوراسان تا سنوورێك بۆ شۆڕشەکەی ڕافیعی کوڕی لەیث دابنێت، موحەممەد ئەمینی کوڕیشی لەشوێنی خۆیدا داناو لەگەڵ عەبدوڵلا مەئموونی کوڕیدا چوو، ڕەشید بەدەست ئازاری سکیەوە هاواری بو و قایشێکی ئاوریشمی بەستبو لەسکی تا ئازارەکەی دابمرکێنێ، کاتێ لەمانگی سەفەردا گەیشتە (تووس) ئازارەکەی زیادی کردوو و نەیتوانی لە جێگە هەستێت و لەشەوی شەممە سێ (مانگی جەمادیائلخیری ١٩٣/مانگی ئازاری ساڵی ٨٠٩ن) داکۆژی دوایی کرد[2].

---

١ـ الطبري: ج٨ ص٢٧٧ـ ٢٨٦ تەبەری دەقی نوسنی بەڵێنەکەی هێناوە، إبن أعشم:ج٤ ص٤٢٢ـ ٤٢٣.

٢ـ الطبري: هەمان سەرچاوە ص٣٤٢ـ ٣٤٦.

# بەشی پێنجەم

# موحەممەد ئەمین – عبدوڵڵا مەئموون

## ئەبوموسا موحەممەد ئەمین (١٩٣ـ١٩٨ك/٨٠٩ـ٨١٣ز)

ناساندنی ئەمین: موحەممەدی ئەمینی کوڕی هارونە ڕەشیدی کوڕی موحەممەدی مەهدی کوڕی مەنسوور، ئەبوموسای هاشمی عەبباسیە و دایکی ناوی ئوم جەعفەری زوبەیدەی کچی جەعفەری کوری ئەبوجەعفەری مەنسوورە، لە ڕەسافە لە ساڵی (١٧٠ك/ ٧٨٦ز) لەدایك بوە بەبەیعەتی باوکی لەدوای مردنی ڕەشیدی باوکی بەیعەتی خیلافەتی پێدراوە، وا ناسراوە کە ئەدەب و ڕەفتاری باشبوە، شارەزای شیعر بوە، زمان پاراو بوە، بەڵام زیاتر حەزی لە ڕابواردن بوە و کەسایەتی لاواز بوە، لە سەردەستی کەسائی پەروەدە بوە و قورئانی فێر بوە،[١] واناسراوە کە هاوەڵانی خۆی خۆشویستووە و سۆزی بۆیان هەبوە، بەڵام وەك سەرکردە و فەرمانڕەوایەك سەرکەوتوو نەبوە.

## هۆکارەکانی ناکۆکی نێوان ئەمین و مەئموون

ڕیشەی ناکۆکی ئەو دووبرایە بۆ سێ هۆکار دەگەڕێتەوە کە بریتین لە: کیشەی جێگیرایەتی ماملانێ ڕەگەزی عەربی و فارسی - چاچنۆکی دەربارەکان.

کیشەی جێگیرایەتی: ئەو کێشەیە بەپێی خواستی دەسەڵاتداری بە بەهێزترین هۆکار دادەنرێت، هۆکاری دەرونیش هەبو کە وایکرد ئەمین بەرامبەر براکانی ئاگایی وەربگرێت و خاڵەکانی بەڵێنەکە هەڵبوەشێنێتەوە و کۆمەڵێ هانگاوی نا کە بونە هۆی تەقینەوەی بارەکە، لەوانە:

ـ هەر لە سەرەتاوە هەوڵیدا قەڵەمەڕەوی خۆی بەسەر هەرێمەکانی دوو براکەی

---

١ـ إبن كثير: ج١٠ ص٢٢٢ـ ٢٤١.

تریدا بڵاوبکاتەوە و دواتر موسای کوڕی لە جێگیرایەتیدا پێش ئەوان بخات.

ـ لەوکاتەی ڕەشیدی باوکی بەڵێنی بەئەو و مەئموونی برای نووسی و لە پاڵ کەعبەدا هەڵیواسی، ئەمین ناپاکی نیشاندا چونکە کاتێ جەعفەری بەرمەکی داوای لێکرد تاسوێند بخوات، کە ئەو بەیعەت هەڵناوەشێنێتەوە، ئەو بەوجۆرە وەڵامی دایەوە (خواسەرم شۆربکات ئەگەر سەر شۆری بکەم) سێ جار ئەمەی دووبارە کردەوە، کاتێ چوویە دەرێ بە فەزلی کوڕی ڕەبیعی ووت: (ئەی ئەبوعەبباس من کەسوێندم دەخوارد نیازی ناپاکیم هەبو)[1].

ـ ئەو لێدوانانەی ئەمین کە بڕیاری لابردنی مەئموون و دانانی موسای کوڕی لەجیاتیدا دەرکردو لەڕاوێژدا لەگەڵ یەحیای کوڕی سەلیم لەو بارەوە هەولێداپاڵپشتی ئەو بڕیارەی بکات و پێی وت: (ئەو ڕایەی ڕەشید هەڵە بو جەعفەریکوڕی یەحیای بەجادووو نوشتەگەرایی وایلێکردو ئەو بارەی بۆ سازداین و دڕەختێکی بۆ ڕواندین کە هیچ سوودێکی بۆمان نیە تەنها ئەوە نەبێت بیبڕین، بارەکەیشمان ڕێکنابێتەوە مەگەر لەناوی ببەین)[2].

ڕۆژێکیش بە فەزلی کوڕی ڕەیعی وت: (ئەی فەزڵ قوڕت بەسەر، لەگەڵ مانەوە و نەیاری عەبدوڵلادا ژیان بەڕێوە ناچێت هەر دەبێ لاببرێت........)[3].

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەمین نیازی ناپاکی هەبوە وهەر لەیەکەم ساتەوە لە دەرونیدا مۆلی خواردووە لەوکاتەی مەئموونی برای وەك جێگیرایەتی لەدوای ئەودەست نیشانکرد، ئەم گرفتە بو کەناکۆکی ئەودوو برایەی تەقاندەوە، بەڵام لە کاتی ژیانی باوکیاندا ئەمەیان نیشان نەدا، کاتێ باوکیان مرد هیچ کامیان ئەویتری نەدەویست، مەئموون لە خوراسان نەدەچووە دەرێ، ئەمینیش لەئەنجامی ئەو کەنارگیرییە دەترسا، ئیتر ئاسایی بو هەر کامیان گومانی خراپی بە ئەوی تریان هەبێت[4].

---

١ـ الجهشياري: ص٢٢٢.

٢ـ الطبري: ج٨ ص٢٨٤ـ ٣٨٥، جەهشیاری دەڵێت ئەمین ڕاوێژی بە یەحیای کوڕی سولەیمان کردووە، ص٢٩٢.

٣ـ الطبري: ج٨ ص٣٩٩.

٤ـ محمود و الشريف: ص١١٢.

## ـ ململانێ دوبەرەی عەرەبی و فارسی:

دیمەنەکانی ئەو ڕۆڵە سیاسیەی کە هەریەکە لە فەزڵی کوڕی سەهلی نووسەری مەئمون و نەخشە بۆ دانەری کە نوێنەرایەتی ڕەگەزی فارسی لەکارگێری عەبباسیدا دەکرد و فەزڵی کوڕی ڕەبیع کە دیدی عەرەبی نیشاندەدا، بەشێوەیەکی سنووردار لە ماوەی پێش مردنی ڕەشیددا بەڕاستەوخۆیی دەرکەوت ویەکەمیان بەپاڵنەری دیدی ڕەگەز پەرستانە وترسی لەمردنی ڕەشید لەدوای سەخت بونی نەخۆشیەکەی، هەوڵیدەدا تا مافی خیلافەت بۆ مەئمون دابین بکات و لەخۆسەپێنی ئەمینی برای و دەربارەکەی بیپارێزێت، یەکەم هەنگاویش بۆ بەدیهێنانی هیواکانی ئەوبو کەمەئموونی ڕازیکرد تا لەگەڵ باوکیدا بچێت بۆ خوراسان تاپشتیوانی لەخوراسان دەست بکەوێت و لەتوندی و خۆسەپێنی ئەمین و دارودەستەکەی بەدوور بێت.

لەدوای مردنی ڕەشید هەریەکە و نیازی دڵی خۆی نیشاندا و تاهاوتای و ناکۆکی بە ڕوونی لە دیدی سیاسیاندا بەدیار کەوت. ڕەشید لەکاتی سەختی نەخۆشیەکەیدا بەیعەتی بۆمەئموون لەدوای ئەمین نوێ کردەوە، کاتێ ئەمین زانی نەخۆشیەکەی باوکی سەخت بو، بەکری کوڕی موعتەمەری بەکۆمەڵێ نووسینەوە بۆ خوراسان نارد کەوای نیشاندا بۆ سەردانی باوکی هاتووە، بەڵام لە ناوەڕۆکدا فرمانی بەخەڵکە کە دەکرد تا بەشمەکەکانیانەوە بەرەو بەغداد بگەڕێنەوە[1].

فەزڵی کوڕی ڕەبیع کەخەرجی وکار ڕێکخستنی کاروباری ڕەشیدی لەدەستدا بو، بەبێ دوو دڵی لەدوای مردنی بە سەرباز و شمەکەوە بەرەو بەغداد گەڕایەوەو لەگەڵ ئەوەی مەئموون هەوڵیدا وا لەفەزڵ بکات کە نەچێت، کەچی فەزڵ لای بەلای مەئموونیدا نەکردەوە، مەئموون باسی ئەو بەڵێنانەی بۆ کردن کە ڕەشید پێیدابون. ئەمە بە ڕاستی باری سەرشانی مەئموونی قورس کردوهەستی بەناپاکی ونیازی ئەمین کرد[2].

---

١ـ الطبري: ج٨ ص٣٦٨ـ ٣٦٩.

٢ـ هەمان سەرچاوە: ص٣٧٠ـ ٣٧١، الجهشياري: ص٢٧٧.

لەڕاستیدا ئەو سەرکەوتنەی ڕەگەزی عەرەبی بە سەر بەرمەکیەکاندا بەدەستی هێناو هەوڵی بەردەوامی بۆ بەدەست خستنی پاڵپشتی زیاتری قەڵەمڕەو و دەسەڵاتەکەی، پێدەچوو تەنها لە ژێر سایەی خەلیفەیەکی وەك ئەمیندا بێتەدی ئەمەش پاڵی بە فەزڵی کوڕی ڕەبیعیەوە نا تا قورسایی خۆی لەوێوە بخاتە کار و پێی وا بو ئەمە دەرفەتێکە تا گەشتێکی تر ململانێکان بگرێتە دەست وب ەسەر فارسدا سەربکەوێت.

ئیبن سەهل بە دواوکەی ئەمین ڕازی نەبو وحەزی بەلای مەئموندا دەشکایەوەو وتی: (لەلای خەڵەکانت دابەزە و بەیعەت لە گەردنیانە، کەمێك خۆراگر بە من خیلافەتت بۆ دەکەم).[١]

بێگومان ئیبن سەهل بەم هاندانەی مەئموون تا لە خوراسان بمێنێتەوە و پاڵپشتی کردنی و ئامادەنەبون بە جێبەجێ کردنی داوای ئەمین بۆ گەڕانەوە بۆ بەغداد، پاڵنەری خواستی ڕەگەزپەرستی وشەخسی هەبو[٢]، ئەبومحەممەدی یەزیدی بۆی ڕوون بویەوە کەئیبن سەهل بۆیە خزمەتی کردووە (تا ئەو مۆرکە وەربگرێت ئەمە ئاماژەیە بە خاتەم لە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوادا دەکات بۆیە خزمەتی دەکەم و هاودەمی دەبم)[٣].

لە ڕاستیدا ئیبن سەهل هەوڵیدا هاوەڵەکەی بە پایەی خیلافەت بگەیەنێت، هیوای وابو لەجیاتی بەغداد (مەڕو) بکات بە پایتەختی خیلافەت و خوراسان گەورەیی خۆی بۆبگەڕێتەوە، ئەو بۆ کوتلەگەرایی خوراسانی لەپشت ئەو کێشەیەوە ڕۆڵێکی دیاری بینیو ئامادەنەبو لەدوای چەرمەسەری بەرمەکیەکان بچێتەوە ژێر ئەو سێبەرە وبە توندی لەپشت مەئموونەوە وەستا و دەستی پێوەگرت، ئیتر ئەو بو بەوپێشەوایەی کە خوراسانیە نوێیەکان لە دەوری کۆبونەوە[٤].

---

١ـ الطبري: ج٨ ص٣٧٢.

٢ـ الدوري: ص١٤٨.

٣ـ الدهشياري: ص٢٨٠

٤ـ محمودوالشريف: ص ١١٠.

بەوجۆرە کێشەی ناکۆکی وململانێکە دیدێکی نەتەوەیی نێوان عـەرەب و فارسـی لەخۆگرت وکەسانێ ئاڕاستەی ڕووداوەکانیان دەکرد، کە دەمارگیرییان بۆ یەکێ لەو دوو نەتەوەیە هەبو،ئەمین بۆ عەرەب و مەئموون خوشکزای فارسیش بۆ فارس بو و فارسەکان پشتیان گرت بو.

ـ چاچـنۆکیەکانی دەربـار: دەربـاری ئـەمین بـە تایبـەت فـەزڵی کـوڕی ڕەبیـع وعەلی کوڕی عیسای کوڕی ماهان بەبەهێزی لە پشت ئەمینەوە وەسـتان و هانیانـدا تا بەڵێنەکـەی بشکێنێ، لـە کاتێکدا بەڵگـەکان ئامـاژە بەوەدەکـەن ئـەمین لەگـەڵ لێدوانەکانی پێشوویدا دەیویست وەفـای بـۆ براکـەی هـەبێت، فـەزڵب کـوڕی ڕەبیـع ئامۆژگـاری کـرد تـا مـەئموونی بـرای بـۆ بەغـداد بـانگ بکـات و وەك بارمتەیـەك لـە دەستی دابێت و لەسەربازەکانی دوور بخاتەوە، تا ئامادە سازی بۆ لابردنی بکات و جێگیرایەتی خۆی بدات بە مووسای کوڕی[1].

فەزڵی کوڕی سەهلیش لە لایەن خۆیەوە پشتی مەئموونی گرت و ئامۆژگاری کـرد تـا بیـانو بێنێتـەوەو بـەبیانوی ئـەوەی کـە بـارودۆخی خوراسـان وادەخـوازێ لـە خوراساندا بمێنێتەوە بڵێت ناتوانم بێم بۆ بەغداد[2].

بـەو جـۆرە دەسـت تێـوەردانی پیـاوان دەرباربویـە هـۆی قـووڵ کردنـەوەی ناکۆکیەکان تا گەیشت ئاستی هەر دەبو پێکدابدەن.

---

١ـ الطبري: ج٨ ص٣٧٤.

٢ـ الجهشياري: ص٢٨٩ـ ٢٩٠.

# قۆناغەکانی ململانێی نێوان ئەمین و مەئموون

ململانێ نێوان ئەمین و مەئموون بە دوو قۆناغدا تێپەڕبو: قۆناغی دانووستانی ئاشتی کە لە ساڵی (١٩٥ك/٨١١ز) دا کۆتایی پێهات، قۆناغی یەکلایکردنەوەی سەربازی کە بە کوژرانی ئەمین لەساڵی (١٩٨ك/٨١٣ز)دا کۆتای پێهات [١].

قۆناغی دانووستان: لە سەرەتاوە ململانێکە جۆرە نێردراو و ئاڵوگۆڕێکی نوێنەری نێوان هەردوو لای لە سەر کێشەی جێگیرایەتی سەلاحیاتی تایبەت بە خەلیفەی لە خۆگرت،[٢] ئەمین ڕێبازی هەڵخەڵەتێنەری سیاسی بۆ ڕاکێشانی مەئموونی برای و هێنانەوەی بۆ دەرباری خۆی گرتەبەر، ئەو نیازی هەبومەئموون لە جێگیرایەتی لاببات، بۆیە خۆشەویستی خۆی بۆ نیشاندا، مەئموونیش لە لای خۆیەوەڕەفتاری دەکرد کە دڵی ئەمینی برای بێ خەم بکات، بۆیە چەند نێردراوێکی نارد بۆ لای و ئەمینی بە گەورە ڕاگرت و لە خوراسانەوە دیاری گەورەو گران بەهای بۆ نارد،[٣] دواترئەمین چی بەش و ناوچە لە دەستی موئتەمەنی برایدا هەبو لێی سەندەوەو داوای کرد بێت بۆ بەغداد، لە هەمان کاتدا نامەی بۆ هەموو ناوچەکان نارد تا نزای دەسەڵات لە دوای خۆی ومەئموون و قاسم بۆ موسای کوڕی بکەن، کاتێ مەئموون ئەمەی بیست، زانی کە ئەمین دەیەوێت جێگیرایەتیەکە بگۆڕێت و بەڵێنەکە بشکێنێ، بۆ پۆستە و نامە بۆ ناردنی بڕی و ناوی بەیەکجارەکی سڕیەوە.[٤] ئەمینیش بەبێ؛ ئەوەی نیازی خۆی بخاتە ڕوو خۆشەویستی و هۆگری خۆی بۆ مەئموون نشاندەدا و نامەی بۆ مەئموون نووسی و داوای لێکرد لە بەر پێویستی بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت بێت بۆ بەغداد، کەچی (لەناخدا) دەیویست ناپاکی لە ڕوودا بنوێنێ [٥].

---

١ـ الدوري: ص١٤٨.

٢ـ طبري بەدوور و درێژی باسیکردووە: ج٨ ص٣٧٤ و دواتر.

٣ـ الطبري: ج٨ ص٣٧٣.

٤ـ هەمان سەرچاوە: ص٣٧٥.

٥ـ الجهشياري: ص٢٩١ــ ٢٩٢.

مەئموون ویستی داواکەی براکەی بداتەوە و خەریك بو هەڵخەڵەتێت، بەڵام فەزڵی کوڕی سەهلی وەزیری هۆشیاری پێدا و ئامۆژگاری کرد تابیانوو بۆ بەدەمەوەچوونی داواکەی بهێنێتـەوەو هـەوڵی بـەهێزکردنی سوپاکەی و جێگیرکردنـی و چەسپاندنی مەڵبەندی خۆی لەخوراسان بدات [١].

ئەمین لە هەوڵی لابردنی براکەی بێ هیوانەبو و هەوڵیدا پلە بە پلە چی لە دەست دایە لێی بسێنێتەوە بۆوە نامەی بۆ نووسی و داوای هەندێ ناوچەی خوراسانی کە کردویەتی بە ناوی خۆیەوە چۆلی بکات بۆ ئەمین و کاربەدەستانی بـەناوی ئـەوەوە ئاراستە بکرێن و ئەو سوورە لەسەر ئەوەی لە لایەن خۆیەوە کارمەندێك بـۆ پۆسـتـە دابنێ، کە هەواڵی ئەویێ بۆ بنووسێ، چونکە ئەو خەلیفەی موسـڵمانانە و دەتوانێـت بەرژەوەندی گشتی چۆنی خواست بەو جۆرە هەڵسوکەوت بە کاروباری خوراسانەوە بکات [٢].

مەئموون سەبارەت بە داوای براکـەی ڕاوێـژی بـە لایـەنگرەکانی کـرد، هـەموویان گووتیان بـە گـوێی بکـە، تـەنها فـەزڵی کـوڕی سـەهل نـەبێت کـە پێـی بـاش نـەبو، مەئموون بە گوێی ئین سەهلی کرد و ئـەو وەڵامـەی بـۆ ئـەمین نـارد، [٣] ئـەو وەزیـرە فارسیە ئەو سیاسەتەی بۆ مەئموون دارشت، کە دەبێ بیگرێتەبەر کەبریتیە لە:

- پشتی بەخوراسـان ببەسـتێت، چـونکە خوراسـانیەکان بـە پێـی نزیکیـان لـەو هەرگیز بەڵێنیان هەڵناوەشێنەوە
- سیاسەتێکی ئاینی ژیرانە بگرێتەبەر.
- خۆی گرنگی بە کاروباری دەوڵەت بدات و دژ بە ستەمەکان بوەستێت [٤].

بەوەیش خەڵك خۆشیانویست و لەدەوری کۆبونەوە [٥].

---

١ـ الطبري: ج٨ ص٣٧٢.

٢ـ الطبري: ج٨ ص٣٧٧.

٣ـ هەمان سەرچاوە: ص٣٧٧ـ ٣٧٩.

٤ـ الجهشياري: ٢٧٨ـ ٢٧٩.

٥ـ هەمان سەرچاوە: ص٢٧٩.

لە ئەنجامی ئەو وشکیەدا نالەباری نێوان دوو براکە زیادی کردو سنووری نێوانیان دورخراو مەئموون هەندێ هەنگاوی گرتەبەر تا ڕێگەی ئەوبانگەشان نەدات کە ئەمین بەردەوام دژ بەئەو بەرپایدەکردن تا خەڵکی خوراسانی لەدەست بسێنێت، بۆیە بەدرێژایی ڕێگەی نێوان عێراق و خوراسان پاسەوانێکی توندی دامەزراند وفەرمانی کرد هەرچی کەسێ لەعێراقەوە بێت و گومانی لێبکرێت بگیرێت[١]. خەریك بو دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی دەبو بە دوو بەشی جیای دژ بە یەك، بەشی ڕۆژئاوا کە شاری بەغداد بو وئەمین سەرکردایەتی دەکرد وعەرەب پاڵپشتی دەکرد، لە سەروی هەمووشیانەوە عەلی کوڕی عیسای کوڕی ماهانی سەرکردەی عەرەبی بو، بەشی ڕۆژهەلات واتە: خوراسان و هەرێمە ڕۆژهەلاتیەکان مەئموون لە شاری (مەڕو) و بە پاڵپشتی فارس لە سەروو هەموویانەوە تاهیری کوڕی حوسەین سەرکردایەتی دەکرد، بە تێپەڕ بونی کات ململانێکە گەورەتر بو ئەمین نەیتوانی وا لە مەئموونی برای بکات کەواز لە جێگیرایەتی بۆ موسای کوڕی ئەمین بهێنێ[٢]. ئەمە وایلێکرد لە ساڵی (١٩٥ك/٨١١ز) دا لاییبات و نووسینەکەی لای کەعبە لاببات و بیسووتێنێ، ئەمە لەگەڵ ئەوەی هەندێ لە دەور و بەرەکانی لەو بارەوە هۆشیارییان پێدابو،[٣] ئەم هەڵسوکەوتە خوراسانیەکان و خەڵکی تریشی تووڕە کردو لە ڕوویداوەستان و بارگرژی هەڵگیرسا و ململانێکە بو بە ململانێ چەکداری و هەرکامیان خۆی بۆ ئامادە کرد.

## قۆناغی یەکلاکردنەوی سەربازی

ئەمین بە سەرکردایەتی عەلی کوڕی عیسای کوڕی ماهانی والی پێشووی خوراسان سوپایەکی بۆ جەنگ لە گەڵ مەئموونی برایدا بەڕێخست و سوپاکەی بەرەو (ڕەی) کە سوپاکەی مەئموون بە سەرکردایەتی تاهیری کوڕی حوسەین لەوێ

---

١ـ الطبري: ج٨ ص٣٧٩.

٢ـ هەمان سەرچاوە: ص٣٧٥ـ ٣٧٦.

٣ـ الجهشياري: ص٢٩٢.

چاوەڕوانی دەرکرد، هەردوو سووپاکە لە جەنگێکی قورسادا پێکییاندادا و سوپای مەئموون سەرکەوت عەلی عیسا کوژرا. هەرکە هەواڵی سەرکەوتنەکە گەیشتە مەڵبەندی مەئموون لە(مەرو)، خەڵکی یەکسەر بەیعەتی خیلافەتیان بەمەئموون دا[١].

لەڕاستیدا ئەمین لە دەست نیشان کردنی هەڵوێستی سیاسی و سەربازی هەڵەی کردیان دەست نیشان کردنی عەلی کوڕی عیسادا بۆسەرکردایەتی هێزەکانی هەڵخەڵەتا، چونکە ئەودەستنیشان کردنی هیوای خوراسانیەکانی لە ناوبرد ڕقیان لە عەلی بو، ئەمەش گەرمی کرد و وای لێکردن مەرگخوازانە و نەترسانە بجەنگن.

ئارەزووی شەخسی لەودەست نشانکردنەدا ڕۆلی بینی، چونکە عەلی دەیویست پایەکەی جارانی خۆی وەك فەرمانڕەوای ویلایەتی خوراسان بگرێتەوە، پێدەچێ ئەمین بۆ تووڕەکردنی دانیشتوانەکەی ویستبێتی، بۆیە ئەوەی کرد بەسەرکردە تا توندییان لەڕوو بنوێنێ ڕای ڕاستر ئەوەیە، کە یەکێ لە هەواڵگرەکانی فەزڵی کوڕی سەهل کەعەبباسی کوڕی موسا بو، ڕاوێژی لەگەڵ ئەمیندا کردو ئاماژەی پێدا تاعەلی بکاتە ئەمیر تا خوراسانیەکان لەسەر جەنگ کرد گەرمبن.

هەواڵی شکستی سوپای ئەمین ترسی لە بەغداد لێکەوتەوەو خەلیفەی هاندا سوپایەکی تر ئامادە بکات و بە سەرکردایەتی عەبدوڕەحمانی کوڕی جیلەی ئەنساری ناردی بۆ خوراسان تا ڕێ لە کشانی تاهیر بگرێت،[٢] جەنگی دووەم لە نێوان هەردوو لادا لە هەمەدان ڕوویداو دووبارەتیایدا مەئموون سەرکەوت و تاهیر دەستی بەسەر شارەکەدا گرت و دواتر بە ئاڕاستەی بەغداد و بەهاودەمی هەرثەمەی کوڕی ئەعیوان کشا،[٣] کاتێ گەیشتە بەغداد گە مارۆیەکی سەختی خستە سەر شارەکە و ئاژاوە و پشێوی بەغدادی گرتەوە و شەقامەکانی پێکدادانی ناوخۆیی نێوان لایەنگرانی هەردوو لایان بەخۆیەوە بینی، هێزێکی خوراسانی توانی بچێتە ژوورەوە و ئەمین بە دیلبگرێت و لابردنی ئەمینی ڕاگەیاند، بەڵام ڕەگەزە عەرەبیەکان

---

١ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو: ص٤١١، ص٢٩٣.

٢ـ الطبري: هەمان سەرچاوە ص٤١٣ـ ٤١٤.

٣ـ الطبري: ج٨ ص٤١٣ـ ٤١٤

هێرشێکی دژیان ئەنجامدا و توانیان ئەمین ئازاد بکەن و خوراسانیەکانیان لە شارەکە دەرکرد.

لە ئەنجامی فشاری گەمارۆدانەکەدا هێزی ئەمین دارما و لەدوای ئەوەی سەربازەکانی ورەیان پێنەما و بەرگریکردن کۆتایی پێهات و تاهیر لە کتوپڕێکدا چوویە ناوشارەکە، خەلیفە سەیریکرد دەبێ یەکێ لەم دوو بڕیارەهەڵبژێرێ: یان هەوڵێکی تری تێکدان و چوونە ناو ڕێزی خوراسانیەکان بدات، یان خۆی بدات بەدەستەوە و داوای پەنادان بکات، لەبەر ئەوەی کەسی لەگەڵدا نەبوکە لە بەرگریکردندا یارمەتی بدەن، بۆیە پێی باشبو خۆی بداتە دەست سەرکردە هەرثەمەی کوڕی ئەعیون، بۆیە ئەوی هەڵبژارد، چونکە تاهیر توند و تیژبو، بەلاّم تاهیر لەڕووباردا بۆسەی بۆ نایەوەوگرتی وبەندی کرد دواتر کۆمەڵێ لە سەربازە خوراسانیەکان بەندیخانەکەیان بڕی و چوونە ناوی و ئەمینیان کوشت، ئەمەش لە بیست و پێنجی (مانگی موحەڕەمی ساڵی ١٩٨ك/ مانگی ئابی ساڵی ٨١٣ز) دا بو، تاهیر دەستی بە سەر بەغداد داگرت و خەڵکەکەی دڵنیا کرد، بەمە کۆتایی بە خیلافەتی ئەمین هات [١].



١ـ بۆ دوور و درێژی ئەو ڕووداوانە بگەڕێرەوە بۆ الطبري: ج٨ ص٤٧٢ـ ٤٨٩.

# ئەبوجەعفەر عەبدڵڵای مەئموون (١٩٨ــ٢١٨ك/٨١٣ــ٨٣٣ز)

## * ناساندنی مەئموون:

عەبدوڵڵا مەئموونی کوڕی هارونە ڕەشیدی قوڕەیشی هاشمی ئەبوجەعفەری ئەمیری باوەڕدارانە، دایکی ئوم وەلەدەو پێی دەوترا (مەراجیلی باذغیسی) لە ساڵی (١٧٠ك/٧٨٦ن) لەدایك بوە و لە تەمەنی سیانزەساڵیدا باوکی کردوویەتی بە جێگیر، لە ساڵی(١٩٨ك/٨١٣ن) لەڕەی بەیعەتی خیلافەتی پێدراوەو لە ساڵی(٢٠٤ك/٨١٩ن)دابەرەو بەغداد هاتووە[١].

مەئموون کۆمەڵێ سیەفەتی تایبەتی هەبو، کە لە هەمووخەلیفە عەبباسیەکانی تر جیای دەکردەوە، لەوانە: لێبوردە بوە و حەزی لە تۆڵەسەندنەوە نەکردووە، ڕێزێکی هەبو کە لە ڕێزی هەموو خەلیفە عەبباسیەکانی تر زیاتر بوە، توانای بەڵگەی پازیکردنی بەهێز بو، ڕاستەوخۆ قسەو وەڵامی بۆ دەهات، ئەدیب بو بەچاکی شیعری دەزانی و حەزی لە گوێگرتنی گۆرانی بو[٢].

## بارودۆخی ناوخۆیی لە سەردەمی مەئمووندا

### بارودۆخی بەغداد لە سەرەتای سەردەمی مەئمووندا:

فەزڵی کوڕی سەهل ویستی بەرهەمی سەرکەوتنەکەی بچنێتەوەو هەرکە هەواڵی کوژرانی ئەمین گەیشتە (مەڕوە) ئامۆژگاری خەلیفەی کرد تا گۆرانکاری لە کارگێریدا بکات و لەگەڵ باری نوێدا هەنگاو نێت، لەمەدا ئامانجی دوورخستنەوەی هەردوو سەرکردە تاهیری کوڕی حوسەین و هەرثەمەی کوڕی ئەعیون بو لە عێراق تا بە تەنها دەسەڵاتی بۆ بمێنێتەوە.

---

١ـ إبن كثير: ج٧ ص٢٧٤ـ ٢٧٥.

٢ـ بۆ باس و سیفاتی مەئموون یگەڕێرەوە بۆ الطبري: ج٨ ص٦١٥ـ ٦٦٦.

مەئموون ئا مژگاری وەزیری خۆی وەرگرت و تاهیری کوڕی حوسەینی لە عێراق لابردو حەسەنی کوڕی سەهلی برای لە جێی دانا، هەروەك هەثمەی کوڕی ئەعیونی بۆ خوراسان نارد،[1] دوورخستنەوەی ئەودوو سەرکردەیە لە عێراق بوە هۆی بڵاوبونەوەی بارگرژی لەو وڵاتەدا.

خەلیفە لە لایەن خۆیەوە ویستی دەستخۆشی لە وەزیرەکەی بکات، بۆیە نازناوێکی نوێی پێدا، کە ئەوەیش نازناوی (ذوریئاسەتین) بو، واتە: سەرکردایەتی شمشێر و سەرکردایەتی پێنووس، ئەمە بەڵگەی ئاستی ئەو قەڵەمڕەوە فراوانەیە کە ئەو پیاوە فارسیە پێی گەیشتووە، لە پاڵ ئەمەشدا فەزڵ تایبەتمەندی دەسەڵاتداری هەبو، یەکەم وەزیریش بو، کە نازناوی وەرگرت، یەکەم وەزیریش بو هەم نازناو وهەم ئەیرایەتی پێکەوە هەبن، پێیان دەوت (وەزیری ئەمیر) هەروەها مەئموون کارگێڕی کاروباری وڵاتی پێسپارد[2].

ئەو هەڵوێستەی مەئموون بویە هۆی بێزارکردنی ڕەگەزە عەرەبیەکان و ڕق هەڵگرتنی بەنی هاشم و زۆری خەڵك، بەمە لە بەغداد ئاژاوە هەڵگیرسا و خەڵکەکەی بەعەتیان بە مەنسووری کوڕی مەهدی مامی مەئموون دا، بەڵام ئەو ئامادە نەبو ئەوە قبوڵ بکات، هەرچەندە ڕازیبو بەناوی مەئموونەوە کاروباری بەغداد بگرێتە دەست[3].

ئەوەی هێندەی تر بارەکەی گرژتر کردوە، ئەوەبو خەڵك لەو ململانێیە و ئەنجامەکەی سەختی وبێزارییان چەشتبوتا ئەوەی خوازیاری ڕزگاربونیان دەکرد، ئەوەیش مەترسی بارەکەی زیاتر کردەوە گرتنەوەی دەستی بەهێز وباڵای تاهیرلە عێراق و لاوازی دەسەڵاتی حەسەنی کوڕی سەهل و خواستی مەئموون بەلای تالیبیەکاندا بو، ئەمەش بەشێوەیەکی کتووپڕی و بۆ یەکەم جار و بەبەیعەتدان بە عەلی ڕەزا خۆی نواند.

---

١ـ هەمان سەرچاوە: ص٥٢٧.

٢ـ الجهشياري: ص٣٠٥ـ ٣٠٦.

٣ـ الطبري: ج٨ ص٥٤٦..

بەوجۆرە جەنگی ناوخۆ لە بەغداد هەڵگیرسا و کاروباری دەسەڵات و کارگێری وەستان و گوندەکانی باشووری عێراق تووشی تاڵای و بڕی بەکرێگیراوان بون، پاش ئەوەی شەقەماکانی بەغداد پڕبون لە دزوجەردە ئیتر باری بەغداد، گەیشتە حاڵێك کە قبوڵ کردنی سەخت بو.

ئەو بارگرژیانەی کارگێری مەئموون ڕوویدا و مەئموونیش خۆی لە(مەروە)بو هەواڵی بەغدادی پێ نەدەگەیشت، فەزڵی کوڕی سەهل ئەو هەواڵانەی لێدەشاردەوە.

بەیعەتدان بەعەلی ڕەزا: کاتێ مەئموون لە عێراق دادەنیشت خواستی بەلای تالیبیەکاندا دەچوو و ڕەنگەی سەوزی دروشمی تالیبیەکانی پۆشی و ڕەنگی ڕەشی دروشمی عەبباسیەکانی وەلانا و تێکەلی خزمایەتی لەگەڵ عەلی کوڕی موسای کوڕی جەعفەری سادق بەست،[١] عەلی پێشەوای هەشتەمی پێشەواکانی شیعەی ئیمامی دوانزە ئیمامە، پاشان لە (مانگی ڕەمەزانی ساڵی٢٠١ك/مانگی نیسانی ساڵی ٨١٧ز) دا کردی بەجێگیری خۆی و ناوی ڕەزای لێنا، چونکە لای ئەمیری باوەڕداران جێی ڕەزامەندی بو.

بەڵام ئەوبەیعەتە بەبێ شوێنەواردانان تێنەپەڕی، بۆیە پێویستی بە خوێندنەوەیەکی وردو وەستان و تێڕامان هەیە تا پاڵنەر و ئەنجامەکانی بەدەستبخەن.

لە ڕووی پاڵنەر و هۆکارەوە، دەبێ کەمێك بگەڕێینەوە دواوە تابچینە کۆڕەکانی ناو کۆشکی سەردەمی هاروونە ڕەشید، لەوێ مشتومڕی هزری و سیاسی ئەهلی کەلام لە موعتەزیلە و شیعە دەبینین، کە بەپاڵپشتی هاندانی بەرمەکیەکان ئەو کۆڕانە دەبەستن و قسەکردن لەسەر خیلافەت یەکێك لە دیارترین بابەتەکانی بو.

لە ئەنجامی دیدی هاوبەشی هەردوولا بۆ بابەتی خیلافەت ئەودوو مەزهەبە لێك نزیك بونەوە، زۆربەی زانایانی موعتەزلە پێیان وایە عەلی کوڕی ئەبوتالیب زیاتر

---

١ـ مەئموون کچەکەی خۆی کە ناوی ئرم حەبیب بو دا بە عەلی ڕەزا، هەروەك ئوممولفەزڵی کچی دا بە کوڕی عەلی ڕەزا، هەمان سەرچاوە: ص٥٦٦

شیاوی خیلافەت بو، ئەمە ڕای شیعەیە، ئەئموون لەژێر سایەی ئەو مشتومڕەدا هزریانەدا پێگەیشت وبە بەش وپێکهاتەکانی کاریگەربو، بۆیەباری موعتەزیلەکانی وەرگرت، بەتایبەت لە بابەتی خیلافەت و بابەتی خەلقی قەرئاندا[1]. تێبینی ئەوە دەکەین ئەو شایەتانەی ئیمزای بەڵێنی جێگیرایەتیەکەی عەلی ڕەزایان کردووە لەو موعتەزیلانەن کە بە خواستی عەلەوی ناسراون،[2] هەروەك گەورە شیعەکانیش ئیمزایان کرد [3].

لە پاڵ ئەم دیاردەیەدا مەئموون بەپێی پێناسی فارسی دایکی لە کەشێکی فارسیدا پەروەردەبو کە باوەڕی وایەعەلی کوڕی ئەبوتالیب زیاتر شیاوی خیلافەتە، دوای خۆیشی منداڵەکانی شیاوترن، پەیوەندیەکی پتەویش بە وراسانەوە هەبو، بۆیە شیعەگەرایی نیشاندا وخواستی بەلای عەلەویەکاندا چوو [4].

مەئموون بەو بارەسیاسیانە کاریگر بو، کە لە کاتی ململانێی لەگەڵ ئەمینی برایدا تیایدادەژیا، بەتایبەت ئەگەر بزانین ئەو ململانێیە ڕەنگی دەمارگیری و ڕەگەزایەتی لەخۆگرتبو وفەزڵی کوڕی سەهل کەخواستە فاسیەکانی لەئەستۆدابو بە توندی لە پشت مەئموونەوە وەستا تا زلمنی سەرکەوتنی بۆ کرد، بۆیە مەئموون هەردەبو هەستی فارسەکان ڕازی بکات، کە ڕێزی بنەماڵەی عەلی کوڕی ئەبوتالیبیان لە لابو و سۆزیان بۆیان هەبر، بۆیە مەئموون بەڵێنی بەخوا دا تا ئەگەر بە سەر براکەی سەرکەوێت خیلافەت بداتە چاکترین کەسی بنەماڵەی عەلی، سەرکەوتنەکەیشی هاتەدی تائەویش بەڵێنی خۆی بباتە سەر، بۆیە عەلی ڕەزای وەك خەلیفە لەدوای خۆی و بەڕاوێژی فەزڵی کوڕی سەهل دەست نیشان کرد [5].

ئەو بۆ لە بەرچاوگرتنی هەستی خوراسانیەکان ناچاربو نەخشەکەی جێبەجێ بکات، ئەمەش لە کاتی وتوێژی لەگەڵ عەلی ڕەزادا تێبینی دەکەین، چونکەکاتێ

---

۱ـ البغداد: الفرق بين الفرق: ص۱٥۷.

۲ـ ئەوانیش: بیشری کوڕی موعتەمەر و یەحیای کوڕی ئەکتەم و حەمادی کوڕی نوعمان.

۳ـ وەك فەزڵی کوڕی سەهل و عەبدوڵلای کوڕی تلهیر.

٤ـ المسعودي: ج٤ ص٥، إبن الأثير: ج٥ ص۲۳۰.

٥ـ الأصفهاني: ص٤٥٤، إبن الطقطقا ص۲۱۷، المسند ص۲۳٥ــ ۲٤۱.

ئەو ئامادە نەبو هەڕەشەی لێکرد و وتی: (هەردەبێ ئەوەی من دەمەوێت قبوڵی بکەیت، چونکە ناچارم و ڕێگەیەکی ترم نیە)[1].

لە ڕووی ئەنجامیشەوە، دیارترین ئەنجامی گواستنەوەی خیلافەتی ئیسلامیە لە بنەماڵەی عەبباسیەوە بۆ بنەماڵەی عەلەوی و بەرپەرچدانەوەی توندی ئەوە لە بەغداد و هەندێ ناوچەی تردا کە بەرامبەر ئەو ڕووداوە بە خراپی نیشانیاندا و خەڵکی ناوچەی جەنگی لە بەغداد بەیعەتیان بە ئیبراهیمی کوڕی مەهدی دا[2].

ئەوەی چاو بخشێنێت دەزانێت فەزڵ ڕووداوەکانی بەغدادی لە مەئموون شارد بویەوە تا عەلی ڕەزا ئەو هەواڵانەی پێوت[3].

لە ناوچەکانیشدا، والی عەباسی بەسرە ئیسماعیلی کوڕی جەعفەری کوڕی سولەیمانی کوڕی عەلی دژی ئەو هەڵوێستەی خەلیفەبو و بە دەرچوون لە بنەماڵەی عەباسی دەزانی، بۆیە ئامادەنەبو جلی سەوز بپۆشێت و لابردنی مەئمونی ڕاگەیاند،[4] خەڵکی مەککەیش بەیعەتیان بەعەلی ڕەزاداو خەڵکی مەدینەش هیچ نەیاریەکیان نیشان نەداکاتێ خەلیفە دەقی بەیعەتەکەی ناردتا بۆیان بخوێنێتەوە.[5]

## ڕووداوەکانی گەڕانەوە بۆ بەغداد

پاش ئەوەی عەلی ڕەزا هەواڵی باری نالەباری ناوچەکانی دەوڵەتی بە مەئموون گەیاند، مەئموون زانی ئیتر نابێ لە مەرو بمێنێتەوە و بەغداد ناتوانێت بەبێ خەلیفە بژیت، وێڕای مەترسی ئەو بارگرژیەی لە میسر و جەزیرەدا ڕوویدابو، هەستی بە مەترسی جەنگی ناوخۆیی نێوان ئەندامانی بنەماڵەی عەبباسی کرد و زانی سیاسەتەکەی فەزڵی کوڕی سەهل دواتر دەبێتە هۆی لەناوبردنی دەسەڵاتەکەی،

---

١ـ هەمان سەرچاوە: ص٤٥٤ـ ٤٥٥.

٢ـ الطبري: ج٨ ص٥٥٤ـ ٥٥٥.

٣ـ إبن الطقطقا: ص٢١٨ـ ٢١٩.

٤ـ اليعقوبي: ج٢ ص ٤٠٢ ـ ٤٠٣.

٥ـ الاصفهاني: ص ٤٥٦.

هەروەك بەرەبەرە لە باکووردا چەند بزووتنەوەیەکی مەزهەبی لەسەر بنەمای ڕێنماییەکانی ئەبوموسلیم و موقەننەع دەرکەوتن و بەهۆی دەرکەوتنی بابەکی خورەمیەوە کەشوێنکەوتەیەکی زۆری هەبوو بزووتنەوەکەی لەفراوانبوندابو قەڵەمڕەوی زیادی دەکرد، لە ئازەربێجاندا بڵاوبویەوە تا ئەوەی هەڕەشەی لە ناوچە ئیسلامیەکان دەکرد، ڕەزاچی بەمەئموون ووتبو سەرکردەکانیشی جەختیان لە سەر کردەوە و ئامازەیان پێدا تا بەپەلە بەرەو بەغداد بچێت تا بگاتە بارەکە، ئەگەرنا خیلافەتی لە دەستدا نامێنێت بۆیە مەئموون بە پەلە بڕیاری گەڕانەوەی بەغدادی داو لە ساڵی(٢٠٢ك/ ٨١٧ز)دا چوو بەرەو بەغداد.

ئەو گەڕانەوەیە بۆ پایەختی مەرکەزی گۆڕانێکی ڕیشەیی لە ڕێڕەوی دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسیدا دەنوێنێت ئەمە واتە: ئاوابونی ئەو مۆرکە فارسیەی بەدرێژایی ماوەی ژیانی مەئموون لە مەرو بەدەوڵەتەکەوە بو و گەڕانەوەب ۆ ئەوبنەڕەتە عەرەبیانەی، کە بەغدادی پایتەختی باوباپیرانی دەگرتەوە، ئەمە فەزڵی کوڕی سەهلی بێزارکرد، چونکە بەم کارە قەڵەمڕەو و دەسەڵاتەکەی ئاوا دەبو.

مەئموون زانی، کە وەزیرەکەی بەوگۆڕانەی کە ڕوویدا بێزاربوەودواتر کاتێ بەرژەوەندی خێزانەکەی وخەڵکی بەغداد پێش دەخات ئەمەدەبێتە بەربەستی ڕێی وێڕای ئەمەش مەئموون لەڕوانگەی هەڵسوکەوتەکانی وەزیرەکەیەوە زانی وەزیرەکەی پیلان دادەنێت تابەتەواوەتی لەناوەوە دەست بەسەردەوڵەتی عەبباسیدا بگرێت وئەولایەنە سیاسیانەی بۆ ڕوون بویەوە، کە ئەودەیگرێتە بەرولادانی لەقسەی مەئموونی دەسەلماند ئەمە بەتەواوەتی لەگەڵ بەرژەوەندیە باڵاکانی دەوڵەتی عەبباسیدا ناکۆك بو.

بۆیە بەپێویستیەکی سیاسی دەزانی کە لەدەست فەزڵی کورشی سەهل ڕزگاری بکات،[1] هەرکە مەئموون دەستیکرد بە گەشتەکەی بۆ بەغدادو گەیشتەشاری

---

١ـ لەوهەڵسوکەوتانەی لەسەرفەزلی کوڕی سەهل تێبینی دەکرێت، ئەو هەڵوێستە بوکە نەعیمی کوڕی خازمی گەورە پیاوی خوڕاسانیەکان کەمەئموون لەبەیعەتدان بەعەلی ڕەزاداراوێژی پێکردن، نەعیم بەئامادەبونی مەئموون بەفەزڵی ووت: (تۆدەتەوێت دەسەڵات لە

(سەرخەس) پیلانی کوشتنی فەزڵی کوڕی سەهلی لە (مانگی شەعبانی ساڵی۲۰۲ك / مانگی شوباتی ۸۱۸ز) دا داڕشت، ئینجا درێژی بەڕێگەکەی بەرەو بەغداد دا.

کاتێ گەیشتە تووس، لە سەرەتاکانی ساڵی (۲۰۳ك/ ۸۱۸ز) لە کتوپڕێکدا عەلی ڕەزا مردو مەئموون لەپاڵ گۆڕی ڕەشیدی باوکی لە تووس بەخاك سپارد، مێژوونوسان لە چۆنیەتی کوژرانی عەلیدا ناکۆکن، شیعەوا مەئموون تۆمەتباردەکەن کە ترێی ژەهراوی پێداوەوناوی (مەشهەد)یان لە شاری تووس ناوە،[1] مردنی ئەو دووکەسە لە گەورەترین هۆکارەکانی بێزاری عەلەویەکان لە مەئموونن.

پاشان وا ڕوویدا، کە مەئموون درێژەی بەگەشتەکەی داوگەیشتە هەمەدان، هەرکە لە بەغدادنزیکبویەوە خەڵکەکەی بەپەلە ئیبراهیمی کوڕی مەهدیان لابردو بەیعەتیان دابە مەئموون، ئەمەش لەحەڤدەی (مانگی ذو الحجەی ساڵی۲۰۳ك/مانگی حوزەیرانی ساڵی۸۱۹ز) دابو، مەئموون لە ڕۆژی شەممە (شانزەی مانگی سەفەری ساڵی۲۰٤ك/مانگی ئابی ساڵی۸۱۹ز) دا چوویە بەغداد، هێشتا خۆی و ئەوانەی لەگەڵیدابون سەوزپۆش بون و ئاڵای سەوزیان پێ بو، بەمە

---

عەبباسیەکان بسێنیتەوە و بیدەیتە منداڵانی عەلی، پاشان ئەوانیش لابدەیت و بیکەیتە دەسەڵاتی کیسرەوی. ئەگەر ئەوەت نەویستایە جل وبەرگی سپی منداڵانی عەلیت نەدەگۆڕی بۆ سەوز کە ڕەنگی کیسرا و ئاگر پەرستانە)، هەڵوێستێکی تر لەئامانجی فەزڵی کوڕی سەهلدا بۆ زیندوکردنەوەی دەسەڵات ونەریتی فارسی دەیخستە گەڕ (ژوریاسەتەیی لەسەرکورسی باڵداردادەنیشت، کەئەگەرمەئموون بیویستایە بچێتەدەرەوە لەسەر ئەوە هەڵدەگیرا، بەردەوام بەوجۆرەبو تامەئموون چاوی پێبکەوتایە ئەوکات دادەبەزی ودەچوو وکورسیەکەی هەڵدەگرت تابیبرێتە بەردەستی مەئموون ژوریاسەتەی سەلامی دەکرد و دەگەڕایەوە و دادەنیشت ... ژوریاسەتەیی لەمەدا لەسەر مەزهەبی کیسراکان دەچوو، چونکە یەکێ لەوەزیرەکانیان کورسیەکی وای پێبو ولەبەردەمیدالەسەردادەنیشت ودوانزە کەس لەمنداڵانی پاشاکان هەڵیاندەگرت) پێدەچێ ئەو دوو باڵە باڵی ئاهوارمازداخوای چاکەی لای زەردەشتیەکان بێت، بگەڕێرەوە: الجهشیاری: ص ۳۱۳- ۳۱٦، الدوری: ص ۱٦٥.

[1] الاصفهانی: ص٤٥۷ -٤٦۰، المسعودی: ج۳ / ص ٤٤۱، إبن الآثیر: ج٥ ص ۱۹۳(ئەم بەدووری دەزانێت مەئموون ژەهر خواردی کردبێت، بەڵام الطبری مەئموون تۆمەتبار دەکات، ج ۸، ص ٥۷٥، خەلیفە بن خیاط تۆمەتباری ناکات، ص ۷٦٦.

هاشمیەکان و پشتیوانیان هەڵچوون تا ئەوەی مەئموون ناچاربو دوای هەفتەیەك دووبارە ڕەنگی ڕەش بپۆشێت،[١] دوای ئەوەی زانی عەبباسیەکان بەرامبەر عەلەویەکان هەستیان چەندە قووڵ وناڕەزایە.

## بزووتنەوە بەرهەڵستکارەکانی دەوڵەت

### أ ـ بزووتنەوەی تالیبی:

*** بزووتنەوەی (ئەبی سەرایا):**

تالیبیەکان باری ناجێگیری سیاسی دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسیان لە ئەنجامی ململانێی نێوان ئەمین و مەئمووندا بە هەند وەرگرت و چەند بزووتنەوەیەکی ڕاپەڕیوو بەرهەڵستکارییان لە عێراق و حیجازو یەمەندا ئەنجامدا، مەترسیدارترینیان بزووتنەوەکەی ئەبوسەریای سری کوڕی مەنسوری شەیبانی بو، کە موحەمەدی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی ئیسماعیل ناسراو بە (ئیبن تەباتەبا) لە کۆتاییەکانی مانگی جەمادی دووەمی ساڵی١٩٩ك/مانگی شوباتی ساڵی٨١٥ز، لە کووفەپێی هەڵسا.[٢]

ئەم بزووتنەوەبەئەڵقەی زنجیرە بزووتنەوە شیعەزەیدیەکان دادەنرێت لە دوای ئەوەی ئەبوسەرایا دەستیگرت بەسەر بەسرەو حیجاز و یەمەندا، قەڵەمڕەوەکەی فراوانبو و سوپای عەبباسی کەحەسەنی کوڕی سەهل بۆ ڕێگرتن لە ئەبوسەرایای ناردبون، لەسەر دەستی ئەبو سەرایا شکستیان تووشبو.

ئەبوسەرایا دەیوویست دەسەڵات بۆ خۆی بمێنێتەوە بۆیە بەژەهر ئیبن تەباتەبای کوشت و لەشوێنیداموحەمەدی کوڕی زەیدی عەلەوی دانا کە غولامێك بو.[٣]

ئەبوسەرایا درهەمی لێداو بەرگێکی بۆکەعبە نارد و لەسەری نووسی (ئەبوسەرایا

---

١ـ الطبری: ج ٢، ص ٥٧٤ ـ ٥٧٥.

٢ـ الطبری: ج٨، ص ٥٢٨.

٣ـ هەمان سەرچاوە: ص ٥٢٩.

بانگەواز کەری بنەماڵەی موحەممەد بۆ داپۆشینی ماڵی خوا ناردوویەتی تا تاریکی بنەماڵەی عەبباس لاببات).[١]

لە ئەنجامی ئەو سەرکەوتنانەی بەدەستیهێنا، حەسەنی کوڕی سەهل ناچار بو داوا لە هەرشەمەی کوڕی ئەعیون بکات تا بزووتنەوەکەی بکوژێنێتەوە ئەو سەرکردەیەش توانی ئەو کارە بکات و چوویە کوفەو ئەبوسەرایا لەکوفەوە بەرەو سوس لە وڵاتی فارس و دواتر بۆ جەزیرە ڕایکرد و لەجەلەولا گیراو برا بۆ لای حەسەنی کوڕی سەهل لە نەهرەوان و ئەویش دای لە ملی و کوشتی.[٢]

شتێکی روونە ئەم بزووتنەوە ەبزوتنەوە عەلەویەکانی تری سەردەمی یەکەمی عەبباسی جیاوازە، چونکە پیاوێك نەخشەی بۆداڕشت کە لە بنەماڵەی ئال و بەیت نەبو کوفەیشی کردەمەڵبەندی خۆی، ئەوەیش یەکەمجاربو لە سەردەمی یەکەمی عەبباسیدا ئەو شارە بزووتنەوەی عەلەوی بەخۆیەوە ببینێت.[٣]

سەبارەت بەهۆکارەکانی سەرکوتکردنیشی لەگەڵ فراوانی قەڵەمڕە و سەرکەوتنەکانیدا چوارهۆکار هەبون:

یەکەم : ئەبوسەرایا لەگەڵ بانگەوازی بۆ عەلەویەکان کەچی هەواداری بۆ بنەماڵەی عەلەوی نەبو، چونکە شیعە بەپەلە پاڵپشتی چەند سەرکردەیەکی تری عەلەویان دەکرد، لە پێش هەمووشیانەوە موحەممەدی کوڕی جەعفەری سادق و لە دەوری کۆبونەوە ئەوە توانای ئەوی لاواز کرد.

دووەم : ڕابردووی ئەبوسەرایا گومانی لەسەردروستکردبو چونکە ئەو پیاوە لەسەرەتاوە لەژێر سەرکردایەتی سەرکردەی عەبباسی هەرثەمی کوڕی ئەعیوندا کاری دەکرد، دواتر بەهۆی دواکەوتنی ڕۆزی ومووچەوە وازی لێهێنا.[٤]

سێیەم: بزووتنەوەکەی ئەبوسەرایا توندو تیژ بو ئەمە وایکرد زۆرینەی خەڵك پشگیری نەکەن، ئەمە بوە هۆی دوا کەوتنی و لاوازکردنی.

---

١ـ هەمان سەرچاوە: ص ٥٣٠ ـ ٥٣٦.

٢ـ هەمان سەرچاوە: ص ٥٣٤ ـ ٥٣٥.

٣ـ الليثي، سميرة مختار / جهاد الشيعة، ص ٣٣١.

٤ـ الطبري: ج ٨ ـ ص ٥٢٩.

چـــوارەم: کاروبـــاری تالیبیـــەکانی سەربەئەبوســـەرایا لەمەککـــە،[١] هـــەموو موسڵمانانیان تورەکرد، ئەمەبوەهۆی ئەوەی بەرامبەر ئەوبزووتنەوەیە هەنگاو بنێن بەتایبەت کاتێ ئەبوسەرایابەرگی کەعبەی لابردوبەرگێکی تری کردەبەر کەدروشمی دژبە عەبباسیەکانی لەخۆ دەگرت.[٢]

## * بزووتنەوەکەی موحەممەدی کوڕی جەعفەری سادق:

سەردەمی مەئموون بـەرپابونی بزووتنەوەیـەکی تـری تـالیبی بەخۆیـەوە دی کـە لـەمۆرك و شـێوەی شـوێنی سـەرهەڵدانیدا لـە بزووتنـەوەکانی تـر جیـاوازبون وموحەممەدی دیباجی کوڕی جەعفەری سادق لەساڵی(٢٠٠ك/٨١٦ن)لەوڵاتی حیجاز سەرکردایەتی دەکرد و لەمەککە بەیعەتی ئەمیری بـاوەڕدارانی پێـدرا، ئـەویش دوای ڕاڕایەك ڕازیبو.[٣]

دەوڵـەتی خیلافـەتی عەبباسـی تـەواو کـەوتبو بەکێـشەی ناوخۆییـەوە، بۆیـە گرنگیەکی زۆری بە بزووتنەوەیە نەدا کە مەترسیەکی وای نەبو، چونکە لە مەککـەدا بەرتەسـکبویەوە ئەمـە دەرفـەتی بەخیلافـەت دەدا تـا بەئاسـانی لـەناوی ببـات، موحەممەد دیباج ناچاربو لەبەردەم هەمواندا لە مەککە وازبهێنێت.[٤]

- گرینگترین هۆکارەکانی شکستخواردنی ئەو بزووتنەوەیە دەگەڕێتەوە بۆ:

- نەبونی وردی ولێزانـی ڕێکخستن و بنکەیـەکی جـەماوەری کـە پاڵپـشت بێـت و بڵاونـەبونی لـە ناوچـەکاندا و کـەمی شـوێنکەوتەکانی لـە بەرەنگاربونـەوەی عەبباسیەکاندا.

١ـ موحەممەدی کـوڕی جەعفـەر لەبانگـەواز کـردن بـۆ خـۆی دوودڵ بـو و حـەزی

---

١ـ الطبری: ئەو کارە دەگێڕێتەوە کە شـوێنکەوتوانی ئەبوسـەرایا لـە مەککـە ئەنجامیانـداوە، هەمان سەرچاوە: ص ٥٣٦ـ ٥٤٠.

٢ـ اللیثی: ص ٣٣١ـ ٣٣٤.

٣ـ الخطیب البغدادی: ج ٢، ص ١١٣ـ ١١٤.

٤ـ الطبری: ج ٨، ص ٥٣٨ـ ٥٣٩.

نەدەکرد، لەسەر فشاری بنەماڵەی عەلی کوڕی ئەبوتالیب و عەلی کوڕی ڕازیبو.

٢ـ پشتی بە کەسانێك بەستبو کە ژیانیان خراپ بو، ئاژاوە چیانی ناو مەککە هەندێ سوودانی عەلی کوڕی ئەمە وای کرد خەڵکی لێی دوور بکەونەوە.

٣ـ هەندێ لە خەڵکی مەککە دوو دڵ بون کە بەیعەتی پێبدەن، هەروەك ئەو کەسەی بەیعەتی پێدەدان هۆگری و پاڵپشتیان بۆی نەبو.[1]

## ب ـ بزووتنەوە نا عەلەویەکان :

### * زووتنەوەکەی نەسری کوڕی شبث:

نەسری کوڕی شبث سەرکردەیەکی عەرەبی لەبەنی عوقەیل بو، لە کیسوم لەباکووری حەلەب نیشتەجێ بو، دەرمارگیری بۆ ئەمین هەبو، چونکە ئەمین نوێنەرایەتی ڕەگەزی عەرەبی دەکرد دژ بە مەئموونیش بوچونکە مەئموون لەگەڵ خوراسانیەکاندا خۆشی دەهات، لە کۆتاییەکانی ساڵی (١٩٨ك/ ٨١٤ن) دا دەرچوو و دەستی بەسەر وڵاتە دراوسێکاندا گرت و (سیساط)ی گرت و زۆرێك لە عەرەبەکان کەوتنە شوێنی،[2] دەسەڵاتی بەهێزبو ت ئەوەی خەلیفەلێی ترسا، لە ڕاستیدا بزووتنەوەکەی دژ بە دەسەڵاتی عەبباسی نەبو، بەڵکو ڕاپەڕینێك بو دژی قەڵەمڕەوی فارسی کە دەستی بەسەر تواناکانی خیلافەتدا گرتبو.[3]

کاتێ تاهیری کوڕی حوسەین بەسەرئەمیندا سەرکەوت، مەئموون ڕایسپارد تا لەگەڵ ئەویشدا بجەنگێت و موسڵ و جەزیرەو شام و مەغریبی دایە دەست و عێراقی لێ سەند، ئەمەش تاهیری بێزارکرد بۆیە لەجەنگی دژ بە نەسردا کەمتەرخەمی نواند و دەرفەتی سەرکەوتن بەسەر سوپای عەبباسی دایەدەست نەسرو نەسریش شاری حەڕرانی گەمارۆدا، لەوێ تالیبیەکانی بەدیدەکرد، کە یەکێ لە هێما نەیارەکانی دەسەڵاتی عەبباسی بو ئەوانیش هەوڵیاندا قۆرخی ئەوە بکەن و

---

١ـ اللیثی: ص ٣٤١ـ ٣٤٣.

٢ـ الیعقوبی: ج٢، ص ٣٩٨.

٣ـ الدوري: ص ١٦٩.

ڕازیبکەن تا بەیعەت بە عەلەویەکان بدات، بەڵام لەبەر ئەوەی هۆگری بۆ عەبباسیەکان هەبو ئامادە نەبو داواکەیان قبوڵ بکات.[١]

مەئموون هەستی بەو کەمتەرخەمیەی تاهیر دژبە نەسرکرد بۆیە بانگیکرد و خوراسانی دایەدەست و عەبدوڵای کوڕی لەسەر ویلایەتە ڕۆژئاواییەکانی ڕەقە تامیسری پێدا و فەرمانیپێکردتا لەگەڵیدا بجەنگێت، عەبدوڵایش توانی گەمارۆی نەسر بدات و فشاری لەسەر دروست بکات تا ئەوەی ناچار بو لە ساڵی (٢٠٩ك/٨٢٤ن)دا داوای ڕێککەوتن بکات وبۆ ساڵی داهاتو و هێنرا بۆ بەغداد، ئەمە لە دوای ئەوەی خەلیفە پەنای دا،[٢] بەمەش بزووتنەوەکەی کۆتایی پێهات.

## * بزووتنەوەی( زط ):

زەتتەکان لە باشووری عێراق لە دەوروبەری بەسرە ڕاپەڕینێکی سەختیان بەرپاکرد، ئەمانە تێکەڵەیەکی خەڵك بون کەبە (نوور) ناسراوبون ولەبنەڕەتدا لەهیندەکانی ئاسیا بون ولەچەم ودۆڵی نێوان واسیت وبەسرەداولەدوای کۆچیان لە ڕۆژهەڵاتەوە سەقامگیر بون، ئەمانە لە ماوەی ناکۆکی نێوان ئەمین و مەئموونندا بەهێزبون و دەستیان بەسەر ڕێگەی بەسرەدا گرت و پەیوەندی نێوان بەسرەو بەغدادیان بڕی و لەسەردەمی مەئموونندا زیاتر بەهێز بون.[٣]

کاتێ مەئموون لە بەغداد سەقامگیر بو دەستی بۆ ئەم کۆمەڵەیە بەتاڵبو کە خۆیان لە دەسەڵاتەکەی جیاکردبویەوە، بۆیە چەند شاڵاوێکی سەربازی لەساڵی(٢٠٥ك/٨٢٠ن)داناردەسەریان، بەڵام نەیتوانی لەناویان ببات،[٤] چونکەئەوان زۆر وریاییان وەرگتبو و ئەگەر ترسیان بەدیبکردایە پەرشوبڵاو دەبونەوە و چالاکی دوژمنکارانەیان بەرامبەردەوڵەت چڕو پڕدەکردەوە تا ئاستی باجیان لەسەر

---

١ـ الطبري: ج ٨، ص ٥٧٩ـ ٥٨٠.

٢ـ سەرچاوەی پێشوو: ص ٥٩٨ـ ٦٠١.

٣ـ دائرة المعارف الأسلامية: ج ١٠، ص ٣٤٩ـ ٣٥٠.

٤ـ الطبري: ج ٨، ص ٥٨٠.

کەشتیەکانی ناو بەغدا دانابو هەوڵیشیان دەدایارمەتی و شمەك نەگاتەپایتەختی خیلافەت.[1]

بەم جۆرە لە پاڵ دەوڵەتی عەبباسیدا ئەم شانوشکۆیەیان هەبو تا سەردەمی موعتەسەم کە بزووتنەوەکەی لەناوبردن و دووری خستنەوە بۆ عەین زربە لە ناوچە سنوریەکانی ئیسلامیەکان.

## * بارگرژی لە میسر:

بارودۆخی سیاسی ناو ویلایەتە ئیسلامیەکان کەوتە ژێر کاریگەری ئەو ململانێیەی، کە لەنێوان ئەمین و مەئموون ڕوویدا و لە ئەنجامی ئەوەدا لە میسر بە شێوەیەکی تایبەت و بەڕوونی و لە ئاسۆی سیاسیەوە لەساڵی (٢٠٦ك/٨٢١ن)ەوە ئامـاژەی بزوتنەوەی سەرەخۆیی بەڕیوبەری سری کوڕی حەکەم و لەئەنجامی فشاری عەبباسی کوڕی موسای والی مەئموون لەسەر میسر دەرکەوت، ئەو پیاوە ناکۆکی ناوخۆیی نێوان قیسی و یەمەنیەکانی بۆبە جەنگدانی دەستە نەیارەکان دژ بە ئەمەدا کەشێکی ڕاڕایی و ناسەقامگیری میسری گرتەوە.

لە ساڵی (٢١٤ك/٨٢٩ن) دا هۆزە عەرەبیەکانی میسری خواروو هۆی سیاسەتی توندوتیژی والیەعەبباسیەکانەوە ڕاپەڕین و جێگری والییان کوشت.

مەئموون لە دژی ئەوبزووتنەوە نەیارە وەستا و موعتەسەمی برای ڕاسپارد تارێی پێبگرێت ئەویش توانی سەرکوتی بکات، بەڵام لە گەڵ ئەوەی میسری بەجێهێشت بارگرژیەکان نوێبونەوە و خەلیفەیش ئەفشینی سەرکردەی تورکی خۆی لە ساڵی (٢١٥ك/٨٣٠ن) دا ناردو ئەویش بارگرژییەکەی نەهێشت.[2]

باری ناوخۆیی میسر بەتەواوی ئارام نەبویەوە و لە ساڵی (٢١٦ك/٨٣١ن) دا قوبتی و عەرەبیەکان بزووتنەوەیەکی ڕاپەڕینی گەورەیان بەرپاکرد ومەئموون ناچاربو بۆئارامکردنەوەی بارەکەخۆی بچێت بۆمیسرو بزووتنەوەکەی سەرکوتکردو

---

١ـ هەمان سەرچاوە: ص ٥٨١.

٢ـ الیعقوبی: ج ٢ ـ ص ٤٢٣.

زۆرێك لە قبتیەكانی بەدیل گرت وسەركردەكانی بزووتنەوەكەیشی لەگەڵ خۆیدا هێنا بۆ بەغداد و بەرپرسی خەراجی لابرد، چونكە ئەو هۆكاری ئەو بارگرژیانەبو.[١]

## *بزووتنەوەكەی بابەكی خورەمی:

مەترسیدارترین بزووتنەوەیەك بو، كە بە ڕوخسار ئاینی و بەئامانج سیاسی بو و دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی هەر لە دامەزراندنیەوە مەترسی وای بەخۆیەوە نەدیبو، ئەم بزووتنەوەیە بەفراوانی بڵاوبویەوەو بانگەوازی ڕێكخراو و بە بەرنامەبو و سەركردەكانی لێهاتوو بون و پەیوەندی بەجگە لە فارسەكانیشەوە هەبو،[٢] ئەمە كۆتا پلەی پیلانی چەكدارانەی فارسی بو دژ بە دەسەڵاتی عەرەبی عەبباسی.

بابەك لە سەر دەستی جاویدان ڕیبازی خورەمی وەرگرت.[٣]

---

١ـ هەمان سەرچاوە: ص ٤٢٣ــ ٤٢٥.

٢ـ الدوريي: ص١٧٩، خورەمیە دەدرێتەوەپاڵ وشەی فارسی(خورەم) كەبەواتای بەچێژدێت ئەمەش بەپێی ڕێنماییەرەواكارییەكەی لەبارەی ڕاوبۆچوونی ناونانیەوە بگەڕێرەوە بۆ: عمر ص ٢٠٨ــ ٢١٠.

٣ـ خورەمیە چەند دەستە وتاقمێكن، جگەلەوەی لەمەڕ (ڕەجعیەت) یەكدەنگن وبڕوایان بەگۆڕانی ناو وگۆڕانی جەستە هەیەوبانگەشەی ئەو دەكەن كە بە جیاوازی ئاین و شەریعەتیانەوە هەموویان پێغەمبەرن و ڕۆحی پێغەمبەرێكیان بۆ هاتووە و هەرگیزسروش (وەحی) ناپچڕێ و هەركەس چاوەڕێی پاداشت بێ و لەسزا بترسێت وهەر ئاینێكی هەبێت ڕاستە و هێرشی ناكەنە سەرو بەهەڵەی دانانێن، بەمەرجێ دژ بەوان قسەنەكات و لە مەزهەبەكەیان نەدا، بە تەواوی خۆیان لە خوێن بەدووردەگر، ئەگەر ئاڵای ناكۆكی هەڵكرا، ئەبوموسلیم زۆربە گەورەدەگرن و لەسەر كوشتنی ئافەرین لە ئەبو جەعفەردەكەن و سەڵەواتی زۆر لەسەر مەهدی كوڕی فەیرۆزێ دەدەن، چونكە كورشی فاتیمەی كچی ئەبوموسلیمە، ئەوان چەند پێشەوایەكیان هەیە كە لەقسەكانیاندا دەگەڕێنەوە بۆ ئەوان، چەند پێغەمبەرێكیشیان هەن كە لە ناویاندان و بە فریشتەكان ناویان دەبەن و بەهیچ جۆرێك وەك مەی پیرۆزنابن، بنەڕەتی ئاینەكەشیان ئەوەیەكەباس لەڕووناكی وتاریكی دەكەن، هەندێكیان باس لەوەدەكەن ئەگەرئافرەتان ڕازیبون داوێن پیسی دروستەو هەر شتێك دەروون چێژی لێوەربگرێت ئەگەر زیانی لێنەدات دروستە بگەڕێرەوە بۆ: المقدسی: ج٤، ص ٣٠.

کاتێ جاویدان مرد ژنەکەی بانگەشەی ئەوەی دەکرد، کە گیانی مێردەکەی چووەتە ناو جەستەی، بابەکیش ئەم بیرۆکەیەی پێ قبوڵ بو و لەو ڕوانگەوە هەڵوێستی دەنواند،[1] لە ڕاستیدا ڕای ڕاستتر ئەوەیە، کە بابەك لە ناوچەی شاخدا جێگیرایەتی جاویدانی دەکردو سەرکردایەتی ئەو بیرەی دەکرد، پاشان گەشەی بە بزووتنەوەکەی دەداو ڕیکیدەخست تا هەوڵی ئەوە بدات دەسەڵاتی بەهێز بکات، تا بگاتە ئامانجە سیاسی و ئاینیەکانی.

بابەکی دەستەیەك لە خورەمیەکانن و شوێنکەوتەکانی کەوتنە شوێن بابەك،[2] ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە بابەك و شوێنکەوتەکانی دژبە دەسەڵاتی عەرەبی عەبباسی و دژبەئاینی ئیسلام بون کە عەباسیەکان وەریانگرتبو، بۆیە تەنها لە دیدەئایینی وڕەگەزپەرستیەکەیەوە دەتوانین سەیری ئەو بزووتنەوەیە بکەین.

جا لە ڕووی ئایینەوە بابەکیەکان ڕێبازی تەناسوخ و گەڕانەوەیان گرتە بەر و باوەڕیان پێی هەبو و باسی ئیشتراکیەت (هاوبەشەکی) وڕەوابون(ئیباحیەت)یان دەکرد، وەك ئەوەی ئەگەر ئافرەتان خۆیان ڕازیبن ئەوا داوێن پیسی ڕەوایە بەرپەچی ئەرکەئاینیەکانیشیان دەدایەوە، بەم جۆرە بیرە بابەکیەکان دژ بە ڕێبازی ئایینی ئیسلام بون.[3]

بابەکیەکان هەوڵیاندا کێشەی جیاوازی دابەشکردنی سامانی نێوان گەورە موڵکداران و جووتیاران چارەسەر بکەن، ئەمەش بەوەی زەوی لە موڵکدارەکان بسێنن و بەسەر جوتیاراندادا بەشی بکەن، جامازیارکە ئاینی (موحەممەرە)[4]ی لەجورجان ڕاگەیاند وپەیوەندیەکی بەهێزی بەبابەکەوەهەبو فەرمانی بەجووتیاران

---

١ـ کاتێ بابەك چوویە ناودەستەی خورەمی بۆدووبەشی سەرەکی دابەشبوکە هەرکام لەدەسەڵات ململانێی بو بەیەکێکیان دەوترا جاویدان و بەوی تریش دەوترا عیمران.

٢ـ الطبری: ج ٨، ص ٥٥٦، البغدادي: ص ٢١٥، إبن الندیم: الفهرست ص ٤٨٢.

٣ـ المقدسی: ج ٤، ص ٣٠.

٤ـ خورەمیەکانی شوێنکەوتەی بابەك بە موحەممەرە دەناسران، چونکە لە ڕۆژانی بابەکدا ڕەنگی سوری جل و بەرگیان دەپۆشی هەروەك ڕەنگی سوور دروشمیان بو.

کرد تا لەگەورەکان ڕاپەڕن وماڵ وسامانیان تالان بکەن.[١]

لەڕووی ڕەگەز پەرستیەوە، بزووتنەوەکەی بابەك دەربڕی ناخی ناحەزانەی فارسەکان بودژبەئایینی ئیسلام کەپاڵی بە عەرەبەوەنا تائیمپڕاتۆریەتی فارسی لەناوببات، هەروەهادژ بەوعەرەبانەبو کەدەوڵەتەکەی ئەوانیان لەناوبردبو، بابەك خۆی بەئەبوموسلیمی خوراسانیەوەدەبەستەوەوبانگەشەی ئەوەی دەکردکەئەولەوەچەی فاتیمەی کچی ئەبوموسلیم ئەمەش بەڵگەی ئەو نەزعە و دیدە کۆنە فارسیەیە.

بابەك کەسێکی لێهاتووی سیاسی بو، کاتێ ئەو بارە سەختانەی دەوڵەتی عەبباسی پێدا تێدەپەڕی لە ئەنجامی ململانێی نێوان ئەمین و مەئموون دابابەك ئەو بارەی قۆستەوەو لە ساڵی (٢٠١ك/٨١٦ز) لە هەرێمەکانی باکوردا کە ناوچەی دوور لە دەسەڵاتی دەوڵەت بون بزووتنەوەکەی خۆی ڕاگەیاند شاخەکانی ئازەربێجان و ئاران لانکەی ئەو بزووتنەوەیە بون.[٢]

بابەك لە کۆکردنەوەی شوێنکەوتوانیدا سیاسەتێکی ژیرانەی گرتەبەرو توانی هەموو بەشەکانی ئازەربێجان بداتە پاڵ خۆی، بانگەوازەکەی لەناوچەی شاخ و هەمەدان و ئەسفەهان و ماسبەذان و میهرەجاندا زۆرسەرکەوتوو بو، هەروەك کۆمەڵێ لە کوردەکانی شاخ وژمارەیەکی زۆری دەیلەمەکان چوونەناو بانگەوازەکەی ولەتەبەرستان و وجورجان وئەرمینیا وخوراسان و هەموو خاکی عەجەمەکاندا بڵاو بویەوە.[٣]

بزووتنەوەکە هەندێ لە دیهقان و سەرکردە فارسەکانی لەگەڵ سوادەکاندا گرتە خۆ و هەموویان لە شۆڕشی چەکداری دژ بە عەبباسیەکان دا بەشداریان کرد و بابەك هەوڵیدا ئەرمەن بۆلای خۆی ڕابکێشێ و لەگەڵ بیزەنتیەکاندا هاوکاری بکات، بەهۆی ئامادە نەبونی هێزی عەبباسیەوە کە رووچووبو بە ململانێی ناوەخۆییەوە و

---

١ الطبری: ج ٩، ص ٨١.

٢ـ بەذ: گوندێکە لە نێوان ئازەربێجان و ئاران.

٣ـ الدینوري: ص ٢٨٠، الیعقوبي: ج ٢ / ص ٤١٩، البغدادي: ص ٢٥٢ـ ٢٦٨.

سەرقاڵی سەرکوتکردنی بزووتنەوە دوژمنکاریەکانی میسرو وڵاتی شام و عێراق و جەنگی دژ بە بیزەنتیەکان بو، بۆیە بابەك بەردەوام لەسەرکەوتنندا بو ئەم بارودۆخە هۆکارێکی یاریدەدەری سەرکەوتنی سەربازی بابەك بو، بارگرژی باری ناوخۆیی ئەو کاتەی ئازەربێجانیش هۆکارێکی تر بو تا ببێتە هۆی رخێراتر ڕاگەیاندنی شۆڕشەکە، جا کاتێ حاتەمی کوڕی هەرثەمە لە ئازەربێجان هەواڵی مردنی هەرثەمەی کوڕی ئەعیونی باوکی خۆی بیست لەدەسەڵات دەرچوو و پەیوەندی بە بابەکەوە کرد و دژی موسڵمانان هانیدا.[1]

بابەك سیاسەتێکی سەربازی گرتەبەر کە کاری وێرانکردنی قەڵاکان بو تابەرگریکاری عەبباسیەکان لاواز بکات، هەروەك جەختیکردەوە لەسەر بڕینی هێڵی پاڵپشتی تەموینیان وتاڵان وبڕینی کاروانەکانیان تاهێرشەکانیان لەپەل وپۆبخات، شوێنکەوتە شاخاویەکانی واناسراوبون کە شارەزای ڕێگەشاخاویەکان بۆسەنانەوەبو، ئەوان لەڕێڕەو و تەنگەبەرە شاخاویەکان دا گەمارۆی سەربازانی عەبباسیان دەداو لێیان دەدان ئەمەش هۆکاری شکستی چەندین هەڵمەتی مەئموونمان دژ بە ئەوان بۆ ڕووندەکاتەوە.[2]

لەئەنجامی ئەم سەرکەوتنە یەك دوای یەکانە دابابەك بو بەهێزێکی مەترسیداری دژ بەدەوڵەتی عەبباسی، مەئموون لە ساڵی (٢١٨ك/٨٣٣ز) دامردو بابەکیش گەیشتە ئەوپەڕی بەهێزی بەڵگەی مەترسی ئەم بزووتنەوەیەیش ئەوەیە، کە مەئموون لە پێش مردنی وەسیەتی بۆ موعتەسەمی برای کرد کە پێویستە بەهەموو هێزی خۆی ڕێ لەو دەستەوتاقمە بگرێت.[3]

---

١ـ اليعقوبي: ج٢/ ص ٤١٩.

٢ـ مەئموون لەساڵی٢٠٤ك ەوەبەسەرکردایەتی ناودارترین سەرکردەکانی وەك یەحیای کوڕی موعاز وعیسای کوڕی موحەممەدو عەلی کوڕی سدقەوموحەممەدی کوڕی حەمیدی تووسی وچەندێکی ترچەند هەڵمەتێکی دژبەبابەکیەکان نارد، بەڵام هیچ کام سەرکەوتنیان بەسەریاندا بەدەست نەهێنا.

٣ـ بۆ دەقی وەسیەتەکە بگەڕێرەوە بۆ: الطبری: ج ٢/ ص ٦٤٨ـ ٦٤٩.

# زانست لەسەردەمی مەئموونندا

ناوی مەئموون لەپاڵ ئەو ڕاپەڕینە زانستیەدا دێت، کە بەشێوەیەکی گشتی لە سەردەمی یەکەمی عەبباسیدا و بەشێوەیەکی تایبەت لە سەردەمی ئەودا گەشەی کرد، سەردەمی ئەو خەلیفەیە بەپێگەیشتووترین سەردەمی زانستی سەردەمی یەکەمی عەبباسی دادەنرێت و هەوڵە ڕۆشەنبیریەکان گەیشتنە ئەو پەڕ، ئەمەش لەبەر چەند هۆکارێك بو، دیارترینی ئەو هۆکارانەش بریتین لە:

١- مەئموون هەر لەمنداڵیەوەتەواو رووچوبویە خوێندنەوە وزانست وفقە ومێژوو و تەفسیرو زمانی خوێندبو، حەزی لە زانست دەکردوتەواوهەولی زیاتری بۆ دەداو ڕێگەی بە مشتومڕە هزرییەکان دەداوخۆیشی بەشداری تێدادەکردو هەموودا بینکارییەکی بۆ ئامادەکرد بو و هەموو ڕێگەیەکی دەگرتەبەر تالە کتێبخانەکانی قوستەنتینیەو قوبرسدا کانی هزری بدۆزنەوە.[١]

٢- بەهۆی ئەوەی خەڵکی سەرقاڵی لێکۆڵینەوەی زانستی و پێشوازیکردن لە مەعریفە کۆنەکان بون وژمارەی زانایان لە ناوچەکاندا زیادی دەکرد، بۆیە سەردەمی مەئموون ڕاپەڕینێکی زانستی بەخۆیەوە بینی.

٣ــ گەشەسەندنی پەیوەندی ئەوکاتەی نێوان وڵاتان و ئەو هەوڵانەی عەبباسیەکان بۆ پێکهێنانی ئاشتی دەیانگرتە بەر، وێڕای ئاڵوگۆڕە بازرگانیەکان یارمەتی گەشەکردنی ئەو بزووتنەوەی وەرگێرانەیاندا گەیشتە ئەو پەڕ، ئەمەش کەشێکی لەباری بۆوەرگرتن وپێشخستنی زانست هێنایەکایەوە.

٤ــ دەوڵەتی عەبباسی هەر لەسەردەمی مەنسوورەوە چەند ڕێککەوتنێکی بازرگانی تایبەت بەکڕین و بە دەستخستنی کتێب بەستبو، هەندێ جار زۆربەی سامانەکە لەو بوارەداخەرج دەکرا، ئەم دیاردەیە لە سەردەمی مەئموونندا زیادی

---

١- إبن النديم: ص ٣٥٣ــ ٣٥٤.

کرد وبەردەوام پەیوەندی بەئیمپڕاتۆری بیزەنتی(لێوی ئەرمەنی)یەوەهەبو، دەستەیش بۆلای بیزەنتیەکان دەنێردرا تا کتێبە زانستیە کۆنە خەزنکراو و موڵدراوەکانی ئەویَ دەستنیشان بکەن.

٥ــ بزووتنەوەی وەرگێران تەنها بە بزووتنەوەیەکی تاکەکەسی نەماو بو بەرەسمی و دەوڵەت گرنگی پێدەداوهانی دەدا و ماڵ و سامانی بۆ خەرجدەکرد.[١]

لەڕاستیدا خوای گەورە وا قەدەری مەئموونی دیاری کردبو تا لە ڕوانگەی ژیانی سیاسیەوە لە ڕێگەی گرنگیدانی شەخسی خۆی بە کۆکردنەوەی کەلتوری گەلە کۆنەکان و بەتایبەت، کەلتوری یۆنانی کە تەواو پێوەی سەرقاڵ بو خزمەت بە ڕۆشنبیری ئیسلامی بکات، بۆیە چەند دەستەیەکی زانستی بۆ گەڕان بەدوای کتێبە یۆنانیەکان ناردو ئەو کتێبانەی گواستەوە بۆ بەیتولحیکمە کە لە ساڵی (٢١٥ك/٨٣٠ز)دا دایمەزراند، ئەو خانەیە بە پەیمانگایەکی زانستی دادەنرێت کە کتێبخانەیەکی لە خۆدەگرت بۆ لەبەرگرتنەوەی کتێبەبیانیەکان و خانەیەکیش بۆ وەرگێران و خوێندنەوەی ئەو کتێبانە، ڕوانگەیەکی گەردوونیشی هەبو، مەئموون کۆمەڵێ وەرگێری داناولەبەیتولمال موچەی بۆبڕینەوەبەمە ئەم خانەیەلەپاڵ کەلتووری ڕۆشەنبیری بیانیدا کەلتوری ڕۆشەنبیری ئیسلامی گۆتەخۆ.

هزری ئیسلامی لە سەردەمی مەئموونداا بەسێ بوار کاریگەربو، هزری ئیسلامی کەوتە بەرکاریگەری شێوە و بابەتی ئیغریقی و هیلینی، لە ڕووی شێوەوە مەنتیقی یۆنانی شێوەیەکی مشتومڕ و لێکۆڵینەوە و بەڵگە هێنانەوەی بەهزری ئیسلامی بەخشی و ئەهلی کەلام بەوشێوەیەکاریگەربون بەتایبەت مەنتیقی ئەرستۆ، لە ڕووی بابەتیشەوەکاریگەری گەورەی لەسەر ڕێنماییەکانی ئەهلی کەلام هەبوو ئەفلاتوونی نویَ کاری کردەسەر تەسەوف.[٢]

هزری ئیسلامی لەڕێگەی فەتح کردن وبازرگانیەوەکەوتەبەرکاریگەری ڕۆشەنبیری هیندی ولەو ڕوانگەی هیندەکان دەهاتنە ناوچە ئیسلامیەکان و بیری ڕۆشەنبیری

---

١ـ محمود و الشريف: ص ٢٧١ـ ٢٧٢.

٢ـ أمين احمد: ضحى الإسلام ج ١/ ص ٢٧٧.

خۆیان لەگەڵ خۆیاندا دەهێنا ئەوبیروهزرانە گوازرانەوە، هەروەك لە ڕێگەی فارسەكانەوە هەندێك لە هزرە هیندیەكان دزەیان كردە ناو خیلافەتی ئیسلامی كاریگەری هیندی گەیشتە ئیلاهیات و نووسینە ئەدەبیەكان و بیركاری و گەردوون.[١] ئەو كاریگەریە قووڵەی ڕۆشەنبیری هیندی لە بیركاری و گەردونناسیدا هەیبو، دەردەكەوێت موحەممەدی خوارزمی وەرگێری كتێبی(گەردوونی هیندی (سرهنتا)ی لەلایەن ئیبراهیم فەزازیەوە بۆ خەلیفە مەئموون پوخت كردەوە، پێدەچێ ئەو كتێبە هۆكاری ئەوە بێت كە ژمارە عەرەبیەكان و سفر لە وڵاتی هیندەوە هاتبێتە وڵاتی ئیسلامەوە،

لە ساڵی (١٩٨ك/٨١٤ز) دا خوارزمی لە جەدوەلە بیركاریەكانیدا ژمارە هیندیەكانی بەكارهێنا، پاشان لە ساڵی(٢١٠ك/٨٢٥ز)دا نامەی ناسراوبە (الخوارزمی لە ژمارە هیندیەكاندا) بڵاوبویەوە.[٢]

هەروەك ڕۆشەنبیری فراسی بەشێوەیەكی تایبەت كاری كردەسەرزمان و ئەدەبی عەرەبی و چەندین ووشەی فارس هاتنەناو زمانی عەرەبی و لەبواری ئەستێرەگەرایی و ئەندازیاری و جوگرافیا و ئەدەب و مێژوودا چەند كتێبێكی فارسی كراوەبە عەرەبی.[٣]

وەرگێرەكان لە سەردەمی مەئموندا هەوڵیاندا گەورە كتێبەكانی زمانەكانی سنسكریتی و پەهلەوی ویۆنانی وسریانی وەربگێڕن و لەناویاندا لە بەیتولحیكمەدا حنینی كوڕی ئیسحاق دەركەوت، كە زۆربەی نووسینەكانی گالینۆس و ئەرستۆ و ئەفلاتوون و ئەبقورات و بەتلیمۆسی وەرگێڕا، بۆ ئەم كارەیشی مەئموون بەبڕی كێشی كتێبەكان زێری پێدا،[٤] ئیسحاقی كوڕیشی هەر سەرقاڵی وەرگێران بو و هەندێ نووسینی ئەرستۆ و هەموو بەرهەمە فەلسەفی و پزیشكیەكانی گالینۆسی وەرگێڕا،

---

١ـ محمود والشريف: ص ٢٧٧.

٢ـ عمران، محمود: محاضرات في معالم التأريخ الإسلامی الوسيط: ص ٢٤٣.

٣ـ محمود والشريف: ص ٢٧٨ـ ٢٧٩.

٤ـ عمران: ص ٢٤٢.

لەگەڵ كۆمەڵێ لە زانایانیشدا لە دانانی مەوسوعەیەكی جوگرافیدا بۆ خەلیفە بەشداری كرد.[١]

مەئموون كۆمەڵێ لە گەردووناسەكانی بەكارهێنا تا جووڵە و شێوە ئەستێرە ئاسمانیەكانی بۆ بخەنە ڕوو ئەنجامی ئەو لێكۆڵینەوەیە تۆماربكەن و لێكۆڵینەوە لە ئاشكراكاریەكانی بە تلیمۆس بكەن و لە باس و خواسی خۆرگیران بكۆڵنەوە.[٢] بەم جۆرە هەموو كەلتووری گەورەی زانستی، كە زانایانی یۆنان بەجێیان هێشتبو گوازرایەوە بۆ جیهانی ئیسلامی.

## پەیوەندییە دەرەكیەكان لە سەردەمی مەئموونندا

*** پەیوەندی لەگەڵ بیزەنتیەكاندا:**

خەریكبو جەنگی نێوان موسڵمانان و بیزەنتیەكان لەسەردەمی مەئموونندا خەلیفە مەئموون تەواو ڕووچووبو لە ململانێی لەگەڵ ئەمینی برایدا، ئەمە دەرفەتی بە بیزەنتیەكاندا تا هەناسەیەك هەڵبكێشن.

بۆیە بەرەی ئیسلامی ـ بیزەنتی جگە لەچەند حاڵەتێكی كەم نەبێت بەستوویی و وەستانی بەخۆیەوە دی، ئەم بارە نیمچە سەقامگیرە تا ساڵی (٢٠٥ك/٨٢٠ن) بەردەوام بو تا لەو ساڵەدا بەشێوەیەكی ڕێژەیی لە سەردەمی ئیمپڕاتۆرمیخایلی دووەمدا چالاكی سەربازی دەستیپێكردەوە هەریەك لە مەئموون و میخائیل بۆ پاڵپشتی هەڵوێستی دژ بەیەكتر ئاژاوە و شۆڕشەكانیان لە ڕووی یەكتردا بەهەند وەرگرت، جامە ئموون لەگەڵ تۆماسی سقلی، كە دژ بە نیزامی بیزەنتی سەركردایەتی شۆڕشێكی چەكداری دەكرد ڕێككەوتنێكی بەست، میخائیلیش لەگەڵ خوڕەمیەكان كە لەڕووی مەئموونندا ڕاپەڕیبون دانوستانی بەست لەڕاستیدا هەڵمەتی چالاكی ئیسلامی بۆ سەر خاكی بیزەنتی لە ساڵی (٢١٥ك/٨٣٠ن)ەوە دەستی پێكردووەك پەرچە كردارێك بو بۆئەو شاڵاوەی ئیمپڕاتۆر پیوفیل دژ بە

---

١ـ عمران: ٢٤٤.

٢ـ هەمان سەرچاوە.

زەبتەرە بەهۆی یارمەتی دانی چەند هێزێکی خورەمیەوەجێبەجێ کرد.[١] مەئموون و عەبباسی کوڕی سەرکردایەتی چەندهەڵمەتێکی سەربازییان کردوتوانیان چەند قەڵایەك لەناوچەی کەبادوکیە فەتح بکەن،[٢]هەرقلە و لوئلوئەبگێڕنەوە.[٣]

## *مردنی مەئموون :

مەئموون لەپێش مردنیدا لە دوای لابردنی قاسمی برای و تێپەڕاندنی عەبباسی کوڕی بەڵێنی بەموعتەسەمی برای داولە کاتی جەنگی دژ بە بیزەنتیەکاندا لە (هەژدەی مانگی ڕەجەبی ساڵی ٢١٨ك/ مانگی ئابی ساڵی ٨٣٣ز) لە (بدندون) مردو برابۆترسوس و لەوێ بەخاکسپێردرا و موسڵمانان نا چاربون شوێنی خۆیان لەو دیوشاخی تۆرۆسدا چۆڵبکەن.[٤]

١ـ العرینی: الدولة البیزنطیة: ص ٢٧٩.

٢ـ الطبری: ج ٨، ص ٦٢٣ــ ٦٢٤.

٣ـ هەمان سەرچاوە: ص ٦٢٩، ڤازیلیف: العرب و الروم: ص ١٠٧ــ ١٠٨ــ ١١١.

٤ـ هەمان سەرچاوە: ص ٦٥٠.

# بەشی شەشەم

## ( موحەممەد موعتەسەم ـ هارون واثق )

## ئەبوئیسحاق موحەممەد موعتەسەم( ٢١٨ـــ٢٢٧ك/ ٨٣٣ـــ٨٤١ز)

***ناساندنی موعتەسەم:**

ئـەمیری بـاوەڕداران ئـەبو ئیـسحاق موحەممـەد موعتەسـەمی کـوڕی هاروونـە ڕەشـیدی کـوڕی مەهـدی کـوڕی مەنـسوری عەبباسـیە و بـە(مـثمن) (هەشتینە)ناودەبرێت، چونکە کوڕی هەشتەمی عەبباسیە وهەشتەمین خەلیفەی عەبباسیەکانە، هەروەها توانیویەتی هەشت فتوحات ئەنجام بدات لە خیلافەتیشدا هەشت ساڵ و هەشت مانگ و هەشت ڕۆژمایەوە، لە ساڵی سەدو هەشتای کۆچی لە شەعباندا کەمانگی هەشتەمی ساڵە لەدایکبوە کاتێکیش مرد تەمەنی چل وهەشت ساڵ بو، هەشت کوڕوهەشت کچیشی لەدوای خۆی بەجێهێشت نەخوێندەوار بو بەچاکی نەیدەزانی بنووسێ وبخوێنێتەوەبەڵام سەربازێکی دلێروڕاهێنراو لەسەرجەنگ بو، لە ڕووی جەستەیشەوە بەهێز بو،[1] ئەو ڕۆژەی مەئموونی برای لە تەرسووس مرد بەیعەتی خیلافەتی پێدرا، هەندێ لە سەرکردەکان هەوڵیاندا عەبباسی کوڕی مەئموون دابنێن،بەڵام عەبباس وەك ڕێزێك بۆوەسیەتەکەی باوکی و سوکنایی دان بەسەربازان بەپەلە بەیعەتی بە موعتەسەمی مامی دا.[2]

موعتەسەم دەسەڵاتێکی خۆسەپێنی لە دەوڵەتی عەبباسیدا بەکارهێنا و کەمێك سۆز و دابینکاری و پلاندانی چاکیشی هەبو، دلێر و پیچشڕەو و نەبەرد و نەترس و بەسام بو، زۆرشەیدای بینادنان و کشتوکاڵ بو و کاتی خۆی بۆ بنیادنانی کۆشك و نەخشەسازی باخ وبێستان خەرج دەکرد.

---

١ـ إبن كثير: ج١٠ / ص ٢٩٥ـ ٢٩٦.

٢ـ اليعقوبي: ج ٢ / ص ٤٣٠.

# بارودۆخی ناوخۆیی لەسەردەمی موعتەسەمدا

## * بزووتنەوەی تالیبییەکان:

سیاسەتی موعتەسەم بەرامبەر بە تالیبییەکان هەروەکو خەلیفەعەبباسیەکانی تری پێش خۆی توند بو تەنها مەئموون نەبێت، لە سەردەمی مەئموونـدا موحەممەدی کوڕی قاسمی کوڕی عەلی زەیدی لە ساڵی (٢١ك/٨٣٤ن)دا لە تا لەقان دەرچوو و زۆرێك لە دانیشتوانی خوراسان لە دەوری کۆبونەوە،[١] بەڵام بزووتنەوەکەی ڕێکخراونەبو ومەترسیەکی وای بۆ سەردەسەڵاتی مەعتەسەم نەبو، موعتەسەم فرمانی بەسەرکردە عەبدوڵڵای کوڕی تاهیری ئەمیری خوراسان کرد تا ڕێی لێبگرێت، ئەویش توانی موحەممەد بشکێنێت و بیگرێت و ناردی بۆ سامەراو و لەوێ بەندیکرد بەڵام بە یارمەتی چەند لایەنگرێکی خۆی لە بەندینخانە ڕایکردو لە ڕۆژانی موعتەسەم و واثقدا وێڵ بو دواترلە ڕۆژانی متەوەکیلدا گیراو بەندکراو لە بەندینخانەدا مرد.[٢]

*هۆکارەکانی سەرکووتبونی بزووتنەوەکەی لەگەڵ بڵاوبونەوەیشیدا بۆ سێ هۆکار دەگەڕێتەوە:

١ـ هێزی دەوڵەتی عەبباسی لەسەردەمی موعتەسەمدا.

٢ـ موحەممەدی کوڕی قاسم باوەڕی بە بیروڕای زەیدی و جاروودی[٣] هەبو، کە زۆرێك لە زەیدیەکان ڕازی نەبون، بەتایبەت زەییدیەکانی کوفە، جگە لەوەی شیعەی ئیمامی ڕقیان لە شیعەی زەیدی شوێنکەوتەی ئەبولجاروود بو.

---

١ـ المسعودی: ج ٣ / ص ٤٦٤ـ ٤٦٥.

٢ـ الأصفهانی: ص ٤٧٢.

٣ـ جاروودی دەستەیەکی ئیسلامین کەدەدرێتەوە پاڵ ئەبولجاروود، شوێنکەوتوانی بڕوایان وایەپێغەمبەرﷺ بەدەق بڕیاری پێشەوایەتی عەلی کوڕی ئەبوتالیبی بەوەسف نەوەك بەناوداوە. الشهرستانی: ج ١/ ص ١٥٧ـ ١٥٨.

٣ـ موحەممەدی کوڕی قاسم بڕوای بە بیروڕای موعتەزیلە هەبو.[1]

لە ساڵی(٢٢٠ك/٨٣٥ز)و لە سەردەمی موعتەسەمدا موحەممەدجەوادی کوڕی عەلی ڕەزای نۆیەم پێشەوای شیعە دوانزە ئیمامیەکان مرد، موعتەسەم دوای ئەوەی ترسی لەموحەممەدهەبو کەلەسەر دەسەڵات ڕکابەری لەگەڵ بکات وداوای گرتنە دەستی خیلافەتی لێبکات و بەو پێیەی منداڵەکانی لە وەچەی مەئموونن لە ئوم فەزڵی ژنیەوە، بەمردنی موحەممەد دڵنیا و بێخەم بو.

* بزووتنەوەی (زەط):

لەو سەختیانەی هاتنە ڕێی موعتەسەم و لەکاتی خیلافەتدا باری سەرشانیان سەختکرد بزووتنەوەی زەط بو کە توانیان دەستبگرن بەسەر ڕێگەی بەسرەدا و هەڕەشەیان لەبەش و کاری دەوڵەت کرد و باجیان لەسەر کەشتیەکان دانا و هەوڵیاندا یارمەتی و فریاگوزاری نەگاتە بەغداد، ئەویش سەرکردە عەجیفی کوڕی عەنبەسەی لە ساڵی (٢١٩ك/٨٣٤ز) دا نارد تا لەبەتیعە ڕێیان لێ بگرێت و فشاری خستنە سەر تا داوای پەنایان کرد، خەلیفەیش دووری خستنەوە بۆ عەین زربە.[2]

* لەناو بردنی بزووتنەوەکەی بابەك:

موعتەسەم گومانی باشی هەبو ئەو دژ بەبابەکی وەستا لە ساڵی(٢٢٣ك/٨٣٨ز)دا بەسەریداسەرکەوت لەدوای سەقامگیربونی باری ناوخۆیی موعتەسەم هەموو هەوڵێکی خستەگەڕ بۆجەنگی دژ بەبابەك ویەك لەدوای یەك لەدژی هێرشی دەنارد، لەلایەکی تریشەوە مەترسی بابەك زیادیکرد لە دوای ئەوەی ئازەربێجانیشی کەوتە دەست و لەو ناوچانەوە تائێران مەترسی بڵاو بویەوە و یەکێ لە دەستە عەبباسیەکان بەسەرکردایەتی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی موسعەب توانی لەساڵی(٢١٨ك/٨٣٣ز)شوێنکەوتووەکانی لەئێران لەناوببات.[3]

---

١ـ اللیثي: ص ٣٨٦ـ ٣٨٧.

٢ـ الطبري: ج ٩ / ص ٨ـ ٩.

٣ـ هەمان سەرچاوە: ج ٨ / ص ٦٦٧ـ ٦٦٨.

لەساڵی(٢٢٠ك/٨٣٥ز)داموعتەسەم گەورەترین سەرکردەی خۆی کەئەفشین حەیدەری کوڕی کاوس بو کرد بە ئەمیری ناوچەی شاخ وفرمانی پێکرد تا لەگەڵ بابەکدابجەنگێت.[١]

ئەم سەرکردەیە وریایی زۆر و ئەزموون و شارەزایی بەڕێگە شاخاویەکان هەبو، بۆیەنەخشەیەکی سەبازی نەرمی گرتە بەر تا پێشڕەوی لەسەر خۆ بگرێتە خۆو لەبەرزەند لەناوچەی تەفلیس سەنگەریگرت و لەنێوان ئەویژ و ئەردەبیلدا قەلاو ڕێگەکانی ڕێکخست و سەربازەکانی خۆی بەسەر هەموو قەلاو پێگەکاندا دابەشکرد.[٢]

موعتەسەمیش یارمەتی وفریاگوزاری بۆ دەنارد وبەردەوام مووچەوی سەربازانی دەداو پۆستەی ڕێکخست وڕێگەکانی بۆ دڵنیا کردنی پەیوەندی وهاتووچۆی خێراو ئاشتی ئامادەولەبارکرد، تائەوەی ئالو گۆڕی نامەی نێوان سامەراوو سەربازگەکەی ئەفشین ماوەی چوار ساڵ یان کەمتری خایاند،[٣]هەروەك کۆتری نامەبەر بۆ گواستنەوەی هەواڵەکان بۆ یەکەمجار لەو جەنگەدا بەکارهات،[٤]هەروەك سەرپەرشتی بەڕێوەچوونی جەنگەکان لە سامەرا ئەوە دەکرد وخۆی نەخشەی سەربازی دادەنا.

بەمەیش موسڵمانان دژ بەبابەك لەکۆمەڵێ قەلای پەیوەست بەیەکیان هەبو، ئەفشین بۆ لاوازکردنی نەیارەکەی وزانینی پلانەکانی شێوەی هەواڵگری بەکارهێنا، هەرچی هەواڵگری دەستی بەسەریدا زاڵبوایە بۆ لای خۆی ڕای دەکێشاو و بەخششی زیاتری پێدەدان و ئاسانکاری بۆ هەواڵگری بۆدەکردن.[٥]

یەکسەر بابەك زانی ئەمجارەیان بەرەو ڕووی سەرکردەیەکی لێزان بوەتەوە، بۆ ئەوەی فشار لەسەر هێزەکانی لە ئازەربێجان کەمبکات پەیوەندی بە ئیمپڕاتۆری

---

١ـ هەمان سەرچاوە: ج ٩ / ص ١١.

٢ـ هەمان سەرچاوە: ص ١١ـ ١٢.

٣ـ الطبري: ڕێگەکانی گواستنەوەی فریاگوزاری نێوان سامەراو وبەرزەندی شوێنی سەربازگاکەی ئەفشین دەستنیشان دەکات. الطبري: ج ٩ / ص ١٢ـ ١٣.

٤ـ الدوري: ص ١٨٥.

٥ـ الطبري: ج ٩ / ص ١٣.

بیزەنتی پیوفیلەوە کرد تاهێرش بکاتە سەر خاکی ئیسلامیەکان و بەڵێنی پێدابێت بە مەسیحی.[١]

لە ئەنجامی ئەمەدا هەردوولا پێکدابدەن، دوای ئەو ئامادەسازیە سەربازییانە خەلیفە فەرمانی بۆ ئەفشین دەکرد تا چالاکی سەربازی دەست پێبکات و شاری (بەذ)ی وەك یەکەم ئامانجی سەربازی بۆ دەست نیشان کرد، ئەمە لە دوای ئەوەی بابەك لە ئەنجامی جەنگی (ئەرشەق) ناچاربو لەوێ سەنگەر بگرێت.[٢]

ئەفشین یەکسەربەرەو(بەذ) پێشڕەوی نەکرد وبەرەبەرەو لەسەرخۆدەکشا تا گەیشتە ئەوێ وگەمارۆیەکی سەختی لەسەر داناو شاری (روذ)ی کرد بە سەربازگەیەکی نوێی هێزەکانی بابەك لەم نێوەندەدا هەوڵیدا بۆ لای خۆی ڕایبکێشێت، بەڵام نەیتوانی ئەفشین لە گەمارۆدانی بەژ دامایەوە تا ئەوەی توانی لە ڕۆژی هەینی (لەدەی مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٢٢٢ك/ مانگی ئابی ساڵی٨٣٧ز)دا بچێتە ناوشارەکە،[٣] لەدوای کەوتنی بەذ بابەك ڕایکرد بۆ ئەرمینیا و ئەفشین نامەی بۆ پاشاو سەرکردەکانی ئەرمینیا نووسی تارێی لێبگرن، سەرچاوەکان باس لە وەدەکەن کە بەتریك (سەهلی کوڕی سەنبات) زانیویەتی لەکوێ خۆی حەشارداوە بۆیە پەنای داوەو دواتر ناپاکی لە ڕوودانوانەوە وداویەتیە دەست ئەفشین.[٤]

لە مانگی سەفەری ساڵی٢٢٣ك/ مانگی کانوونی دووەمی ساڵی٨٣٨ز)دا بابەك و عەبدوڵای برای هێنران بۆسامەڕائەو ڕۆژە ڕۆژێکی نادیاربو، سەربازان بەرگە ئەرجوانیەکەیان کردەبەری و لەسەر پشتی فیلێك دایناو بە شەقامەکانیدا گێڕایان کاتێ برایە کۆڕی خەلیفە سەربازان ئەو پۆشاکەیان لابرد ودواتر دەست و پێیان بڕی و لەسەر سك شمشێرەکانیان دەکرد بە لەشیداو نەیاندەهێشتن بکوژرێت تا سزا و ئازاری درێژە بکێشێت، لەکۆتاییدا سەریان بڕی، خەلیفە سەری نارد بۆ

١ـ ڤازیلییف: ص ١٤٢. Bury: p: cit. p٢٥٩.

٢ـ سەبارەت بە جەنگی ئەرشەق بڕوانە / الطبری: ج ٩ / ص ١٣ــ ١٧.

٣ـ هەمان سەرچاوە: ص ٣١ــ ٤٥.

٤ـ هەمان سەرچاوە: ص ٤٥ــ ٥١.

بەغداد و پیشانی خەڵك دراو جەستەی لەخاچدارو لە سامەرا نیشاندرا و عەبدوڵڵای برایشی لەگەڵیدا لەخاچدرا،[١] بەمە بزووتنەوەیەی بوارێکی گرنگیەکانی خیلافەتی هەرلەسەر دەمی مەئموونەوە سەرقاڵکرد بو کۆتایی پێهات.

***بزووتنەوەی مازیار:**

هەرکە دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی لەدەست مەترسیەکانی بزووتنەوەکەی بابەکی خورەمی لەناوچەکانی ڕۆژئاوای دەریای قەزوین لەڕزگاربوندابو، بزووتنەوەیەکی تری فارسی بەرەو ڕووی بویەوە کەخۆی لە بزووتنەوەکەی مازیاری کوڕی قارنی کۆتائەمیری قاریانیەکان لە تەبەرستاندا بینیەوە، مازیار نشینگەی خۆی کردە پێگەیەك بۆچالاکی شۆرشگێڕی دژی دەوڵەت.

مازیار موسڵمان بو ناوی موحەممەدی لە خۆی ناو مەئموون لەسەر تەبەرستان و رویان و دنباوند داینا و نازناوی ئەسبەهدی پێدا.[٢]

ئەو نەزعەودیدی سەربەخۆیی هەبو دەیویست لە دەوڵەت جیا ببێتەوە، بۆیە نەیاری و دوژمنایەتی نێوان تاهیریەکانی کە خۆی رشقی لەتاهیریەکان بولەگەڵ ئەفشینداقۆستەوە کەچاوی بڕیبویەویلایەتی خوراسان تائاڵای شۆڕش هەڵبکات، ئەفشین نامەی بۆ مازیار نووسی و هانیدا تا سەرکەشی لە دەسەڵاتیان ڕابگەیەنێت بەو هیوایەی ئەوان نەتوانن ملکەچی بکەن، ئەوکات ئەم مازیاردەکاتە بنەڕەتێك بۆئەوەی خوراسانیان لێبسێنێت.[٣]

بەڵام ئەو پەیوەندیەی نێوان ئەفشین ومازیاربەو ڕووکەشیە نەبو، بەڵکو ئەو پەیوەندیەی ئەو دوانەی کۆدەکردەوە، درێژخایەن وریشەی قوڵ بو، مازیاردان بەوەدادەنێت، کە ئەفشین هانیداوەلەسەر مەزهەبێك کەلەسەری کۆکبون وئاینێك کە لەسەری کۆك بون وسەر بەمەزهەبە فرەخودایی وئاگرپەرستەکان بێت

---

١ـ هەمان سەرچاوە: ص ٥٢ـ ٥٥.

٢ـ الیعقوبی: ج ٢ / ص ٤٣٧ـ ٤٣٨.

٣ـ المسعودی: ج ٣ / ص ٤٧٣، الطبری: ج ٩/ ص ٨٠.

سەرکەشی ودەرچوونی خۆی نیشان بدات.[١] هەروەك مازیارپەیوەندی بەبابەکەوە دەکردوداوای یارمەتی بۆدەخستە ڕوو.[٢]

ڕای ڕاستتر ەوەیە لەسەر مەزهەبی خوڕەمی بوە، ئەو مەزهەبەی شۆڕشی هۆشی فارسی دژ بەدەسەڵاتی عەبباسی و ئەو کۆمەڵگایەی بەرپایانکردبو لەخۆدەگرت.[٣]

ئەو پاڵنەرانەی بابەکی هاندا هەمان ئەوانەن، کە ئەمیانی بۆ سەرکەش بون هاندابەتایبەت ئەگەربزانین ئەوتازەموسڵمان بو بو، واتە: ئەوپاڵنەرانە تێکەڵ بەپاڵنەری سیاسی وڕەگەزی وئایینی بون.[٤]

ئەو پلاندانانەی مازیارلەدوای ڕاگەیاندنی بزووتنەوەی جێبەجێکردن بەڵگەی ئەوەن کەئەولەسەردیدوتێڕوانینی خوڕەمی هاوبەشەکی (ئیشتراکییە) چونکە دەیویست زەوی خاوەن موڵکەکان دەستبەسەردا بگرێت و بەسەر جووتیاراندا دابەشی بکات،[٥] ئەم دیدەواتایەکی سیاسیشی لە پاڵ واتا ئابوریەکەیدا هەیە، بەتایبەت ئەگەر زانیمان ژمارەیەکی زۆری خاوەن موڵکەکان لە عەرەب و مەوالیەکانی عەرەب بون، بۆیە مازیار فرمانی بەکاربەدەستی خۆی لە سەرخستان کرد تا دووسەدو شەست کوڕەسەرکردە کۆبکاتەوە و بیانداتە دەستن جووتیاران تا بیانکوژن، بەو واتایەی ئەوانە خەڵکانێکن مەترسی دروست دەکەن هەروەك جووتیارانی بە کوشتنی کەسانی دەوڵەمەند و خاوەن مەسرەف سەرکەش کردو ڕێگەی پێدان تاماڵ و سامان و ژنیان ببەن، بەمە هەوڵیدا هێزی چینی گشتی بداتە پاڵ خۆی و بۆ ڕزگاربون لە دەسەڵاتی عەرەبی بەکاری بهێنێت.[٦] خەلیفە لەسەر ئامانجەکانی ئەم شۆڕشەوە وەستا کاتێ عەبدوڵڵای کوڕی تاهیرنامەیەکی ئەفشینی

---

١ـ المسعودی: ج ٣ / ص ٤٧٣.

٢ـ الطبری: ج ٩ / ص ٨١.

٣ـ الدوری: ص ١٨٨.

٤ـ العمرو: ص ٣٦٠.

٥ـ الطبری: ج ٩ / ص ٨١.

٦ـ هەمان سەرچاوە: ص ٨٦ـ ٨٧.

بۆ مازیار ئاشکراکرد، هەروەها چەند نامەیەکی تری خودی مازیاریشی دەست کەوت.[1]

لەڕاستیدا ئەو بزووتنەوەیە بەمردوویی لە دایکبو، چونکە کاتی ڕاگەیاندنی لە ساڵی (٢٢٤ك/ ٨٣٩ن)دا لە بارنەبو، لەو کاتەدا دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی لە بارێکی سەقامگیریدابو و تا ئاستێکی باڵا بەهێز بو، ئەمەش لەدوای ئەوەی لە دەست چەندین بزووتنەوەی دژ بە دەسەڵاتی عەبباسی ڕزگاری بو، پاشان لەناوبردنی بزووتنەوەکەی مازیار هەوڵێکی زۆری نەخستە گەڕ،[2] کۆتایی پێهێنانی مازیاریش وەك ئەوەی بابەك وابو کاتیٚ خەلیفە کوشتی و دواترلەپاڵ بابەکدا لە خاچی دا.[3]

*** دەرکەوتنی ڕەگەزی تورکی :**

لە ژێرسایەی ململانێی توندی نێوان عەرەب لایەك و فارسەکانیش کەسۆزی مەئموونیان لە ساڵانی یەکەمی خیلافەتدا ڕاکێشابو و لەلایەکی ترەوە و تێکچوونی هاوسەنگی نێوان ئەو ڕەگەزانەی دەوڵەتی عەبباسیان لیٚ پێك هاتبو، بەیعەتی خیلافەت بە موعتەسەم درا، لەوکاتەی مەئموون لە (مەڕوە)وە گواستیەوە بۆ بەغداد پەیوەندی نێوان عەبباسیەکان و خوراسنیەکان تێکچووکاریگەری ئەمەش لە لەناوبردنی بەنی سەهل و بەرپابونی بزووتنەوەکانی دژ بە دەوڵەتدا کە پاشخانی فارسیان هەبو دەرکەوت، پاشان بەهیچ جۆرێك خواستی خوراسانیەکان و بەرژەوەندی عەبباسیەکان یەکینەدەگرت و موعتەسەم متمانەی بە فارسەکان لاواز دەبو.

لە لایەکی تریشەوە موعتەسەم پشتی بەڕەگەزی عەرەبی نەدەبەست و متمانەی بە عەرەب نەبو، چونکە هەڵگەڕانەوە و بارگرژی زۆریان هەبو و زۆر جاردژ بەخەلیفەکان هەڵدەستان وێڕای ئەوەی ئەوانە چەندین بنەڕەتی هێزی سیاسی و

---

١ـ سەبارەت بەو نامانە بڕوانە: هەمان سەرچاوە: ص ٨١ـ ٨٤ـ ٨٩ـ ٩٣.
٢ـ العمرو: ص ٣٦٠ـ ٣٦١.
٣ـ الیعقوبی: ج ٢/ ص ٤٣٨.

سەربازی خۆیان لە دەستدا بو و کەمترین مەترسی و لاوازترین شان و شکۆیان هەبو، هەموو ئەمانە وای لە موعتەسەم کرد تاکاری سەلامەتی شەخسی خۆی بداتە دەست دەستەیەك لە ڕەگەزی تورکەکان، مۆرکی دەروونی و سیفەتی جەستەیی خۆیشی لە ڕووی هێزی دلێری ونەبەردیەوەلەگەڵ سیفەتی تورکەخاڵۆەکانیدا کەگەلێکی توندی جەنگاوەری نەبەردبون یەکیدەگرت، ئەو ڕەگەزە کاریگەریەکی گەورەی لە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی داهەبو وێڕای ئەوەی تورکەکان خەڵکانێکی ژیاری وا نەبون، لەڕۆژانی دەسەڵاتیداپاسەوانی تورکی یەکێ لەپاڵپشتەکانی دەوڵەتی لەخۆ دەگرت.

لە ڕاستیدا تورکەکان هەر لەسەردەمی ئەمەویەوە لە ئەنجامی فتوحاتی ئیسلامی بۆ وڵاتی ئەودیوو ڕووبار دەهاتنە ناو کۆمەڵگەی ئیسلامی، بەڵام هیچ کاریگەری سیاسیان لە سەر کۆمەڵگەی ئیسلامیدا نەبو بەڵام لەسەردەمی عەبباسیدا ڕووچونە نێو ژیانی ئیسلامیەوە وبەرەبەرەژمارەیان زیادی دەکردوبەڕوونی لەسەر شانۆی ڕووداوەکان لە بەغداد دەردەکەوتن، ئەمە لەسەردەمی مەئموونەوە کە لە سوپادا بەکاریهێنان تا جۆرێك لە هاوسەنگی نێوان دووڕەگەزی فارسی و عەرەبی بەدی بهێنێت.

موعتەسەم ئەم ڕەگەزە نوێیەی بۆ بەهەند وەرگرتنی خواستە سەربازیەکانی بۆ پاراستنی دەوڵەتەکەی ومانەوەلەسەر خیلافەتەکەی لە ژێر سایەی ململانێی عەرەبی ـ فارسیدا بەکارهێنا و تورکەکانی بە شێوەیەکی بەرفراوان لە سوپادا بە کارهێنا و لەژێر دەسەڵاتی سەرکردەیەکیاندا دانیان و بەمەیش گورزێکی توندی لە سەرکردە و سەربازە عەرەبەکان و سیاسەتی تەقلیدی مەنسووردا کە ئامانجی پاراستنی هاوسەنگی نێوان سوپا و نێوان تاقمەبیانیەکان و دەستە عەرەبیەکانە.[١]

سەبارەت بە سەرچاوەی ئەو تورکانە موعتەسەم لە هەرێمەکانی ئەو دیو ڕووبارەوە وەك سەمەرقەند و فەرغانە و ئەشرسنە و شاش و خوارزم هێنانی، ئەمەش یانلەڕێگەی کڕینەوە یانلەڕێگەی بەدیلگرتن لەجەنگدا، یان لەڕێگەی

---

١ـ الدوري: ص ١٧٧ــ ١٧٨.

دیاریەوە، کە والیەکانی ئەو هەرێمە وەك خەڵات بۆ خەلیفەیان دەنارد دواتر ولاتی ئەودیو رووباربو بەسەرچاوەیەکی گرنگ بۆهێنانی تورکەکان.[١]

موعتەسەم تورکەکانی سەقامگیر و پێ چەسپاوکرد و لە خۆی نزیککردنەوە و قەڵەمرەوی تایبەتی پێدان و سەرکردایەتی سوپای دایە دەستیان و لەبواری سیاسیدا مەڵبەندێکی بۆ دانان و لەسامەرا، کە بەتایبەت بۆ ئەوانی بنیادنابو نیشتەجێی کردن، لە لایەکی ترەوە عەرەب لەسەرکردایەتی کردنی سوپا بێبەش بون و ناویان لە دیوانەکاندا لابراو پشك و بەشیان لێ برا.

ئەم سیاسەتەی موعتەسەم چەند ئەنجامێکی نزیك ودووری هەبو:

لە ڕووی ئەنجامی نزیکەوە ئەو سیاسەتە عەرەبی تورەکرد و دژ بە دەسەڵاتی موعتەسەم ڕاپەڕین و پیلانیان بۆ کوشتنی بەسەرکردایەتی عەجیفی کوڕی عەنبەسە و عەبباسی کوڕی مەئموون دانا، بەڵام پیلانەکە سەری نەگرت،موعتەسەمیش لە وەڵامی ئەمەدا عەبباسی لەناو برد لەو کاتەی عەجیف خۆی مرد، پاشان بەرەبەرە عەرەب و فارسەکانی دوورخستەوەو لە دیوانی بەخششدا لایبردن.[٢]

لە ڕووی ئەنجامی دوورەوە، ئەو سیاسەتە بویەهۆی ڕوودانی زیانێکی زۆر و پڕمەترسی بۆ سەر دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی چونکە دەوڵەتەکە لە ڕێرەوە عەرەبی ـ فارسیەکەی خۆی لایداو ئەمەش بوە هۆی لاوازکردنی دەسەڵاتی خەلیفە، پێدەچێ سەرهەڵدانی دەوڵەتە جیابوەکان لە بەشەکانی دەوڵەتدا لە سەردەمی دووەمی عەبباسی یەکێ لەو ئەنجامانە بێت، بەڵام لە سەردەمی موعتەسەمدا بەڕوونی دەرنەکەوت و دواترلە سەردەمی کوژرانی متەوەکیلەوە لە ساڵی (٢٤٧ك/٦٨١ن) دەرکەوت.

١ـ العبادي: ص ١١٧.

٢ـ اليعقوبی: ج ٢ / ص ٤٣٧.

***لەناوبردنی ئەفشین:**

هەندێ لەسەرکردە تورکەکانی ناو دەوڵەتی عەبباسی پایەسەرکردایەتیەکانی خۆیان و قەڵەمڕەوی خۆیان لە کۆشکدا بۆ خواستی جیابونەوە لە دەوڵەت قۆستەوە، لە ناو ئەوانەشدا خواستی سەربەخۆییان هەبو، سەرکردەی تورکی ئەفشین بو کە دەیویست لە ئەشروسنە دەوڵەتێکی جیا و سەربەخۆ بۆ خۆی دابمەزرێنێت، بۆ گەیشتن بەم ئامانجەیشی بەم هەنگاوانەڕێگەی خۆشکرد:

- هەوڵیدا دانیشتوان بۆلای خۆی ڕابکێشێ تا لەوالی عەبباسی دوربکەونەوە و بەدەوری بانگەوازەکەی ئەودا کۆببنەوە.
- هەوڵی دا والی خوراسان عبدوڵای کوڕی تاهیر کە لە ڕوویدا وەستا بو لابدات.
- هەریەك لە مازیار و منکجوری فەرغانی هاندا تا دژ بە دەسەڵاتی موعتەسەم شۆڕش بکەن.

لە دوای ئەو پیلانەکەی ئاشکرا بو ئەفشین نەیتوانی ئامانجەکەی بەدیبهێنێت،[1] بۆیە سیاسەتی خەلیفە بەرامبەربەو گۆردرا و ئەویش هەستی بەو گۆڕانە کرد، ئەمە پاڵی پێوەنا تا بیربکاتەوە لە خەلیفە خۆی ڕزگار بکات بەڵام گیراو موعتەسەم دادگایی کرد بەڵام کوڕی دادگاییکردنەکە ئاماژەی بە پیلان نەدا، بەڵکو کۆمەڵێك تۆمەت بون، کە ویسترا بچەسپێنرێت کە ئەفشین بەڕاستی موسڵمان نەبوە، هێشتادەمارگیری بۆ ئاگر پەرستی هەیەوهەوڵدەدات دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی لەناوببات ئامانجی موعتەسەم ئەوەبو نەهێڵێت ڕق و گومان لای سەرکردە تورکەکانی تردروست ببێت، ئەفشین لەساڵی (٢٢٦ك/٨٤١ز) لەبەندیخانەدامرد.[2]

---

١ـ الیعقوبی: ج٢ / ص ٤٣٩ ـ الطبری: ج٩ / ص ١٠٤.

٢ـ الطبری: هەمان سەرچاوە / ص ١١٤.

## پەیوەندیە دەرەکیەکان لەسەردەمی موعتەسەمدا

*** پەیوەندی لەگەڵ بیزەنتەکاندا:**

لـە سـاڵانی سـەرەتای خیلافـەتی موعتەسـەمدا لەئـەنجامی ئـەوەی خیلافـەت سەرقاڵی لەناوبردنی شۆڕشەکەی بابەکی خوڕەمی بو، جەنگی نێوان موسڵمانان و بیزەنتیـەکان وەسـت لەبەرامبـەردائیمپڕاتۆری بیزەنتـی ئیوفیـل دەسـبەرداری نەخـشەی گێڕانـەوەی دوورگـەی سقلیەلەدەسـت موسـڵمانان بووبەمـەیش ناوچەسەرسنوریەکان ئارامشێکی نیمچەتەواویان بەخۆوە بینـی، بەڵام چوار ساڵ بەسـەرخیلافەتی موعتەسـەمدا تێپەڕنـەبو تائـەوەی ئیوفیـل بڕیاریـدا لەسـەر سنورەکانی ڕۆژهەڵاتی ئیمپڕاتۆریەکەیدا دەست بەجەنگی دژبەموسڵمانان بکاتـەوە ئەودانووستانانەی لەگەڵ بابەکدائەنجامی دان کەبابەک بەڵێنی پێدابێت بەمەسیحی لەبەرامبەرئەوەی لەجەنگی دژبەموسڵماناندایارمەتی بدات، ئەمە هانیداهەروەها پێی وابو دەتوانێت سەرکەوتنی سەربازییان بـە سـەردا بهێنێت بۆیـە شاڵاوی بردەسـەر بەرزاییەکانی فورات تـا پەیوەنـدی لەگـەڵ خوڕەمیـەکان لـە ئـەرمینیاو ئازەربێجـان دڵنیا بکات لە ڕێگەیشدا دەستیگرت بەسـەر زەبتـەرەی مەڵبەنـدی دایکی خەلیفەو چی موسڵمانی تێدابو بەدیلیگرت و کەوتەکوشتن و شێواندانی جەستەیان و ئافرەتـە موسـڵمانەکانیش بـە کـەنیزەك گـرت، هـەروەك هێرشـی کـردە سـەر سومەیـسات و مەلتیە و سووتاندنی.[1]

موعتەسەم ئەم شاڵاوە بیزەنتیـەی بەهەڕەشـەیەکی شەخسی دانـاپێش ئـەوەی هەڕەشە بێت بۆسەرخیلافەتی عەبباسی بۆیە بڕیاریداتۆڵەی زەبتەربکاتەوە، هەرکە لـە سـاڵی (٢٢٣ك/٨٣٨ن)دا شۆڕشـەکەی بابـەکی کوژانـدەوە سـوپایەکی چڕوپڕی بەئامانجی وەشاندنی گورزێکی توند دژ بە ئیمپڕاتۆریەتەکـەی بوەشـێنێت و شـان و شکۆی ئیمپڕاتۆرلە ناوببات، خۆیـشی سـەرکردایەتی سـوپاکەی کـرد و چـوو بـەرەو

---

١ـ هەمان سەرچاوە: ص ٥٦.

عموریـەی مەڵبەنـدی بنەماڵـەی ئیوفیـل و بڕیاریـدا وێرانـی بکـات، شـیاوی باسـە دەستگرتن بەسەر عموریەدا بە هەنگاوێك دادەنرێت بۆ گەیشتن بە قوستەنتنیە.[١]

خەلیفـە لـە ئامادەسـازیدا بـو و سـامەرای بەجێهێـشت ئەنقـەرەی کـرد بەیـەك ئامانجی هەڵمەتەکەی و ئەشناسی تورکی وەك سـەرکردەی پێشەوە و ئیتـافی وەك سـەرکردەی ڕاسـت و جەعفـەری کـوڕی دینـاری لەسـەر چـەپ و عـەجیفی کـوڕی عەنبەسەی لە دڵ وناوەوە دانا، ئەفشین لـە هەڵمەتـەدا سـەرکردایەتی دەسـتەیەکی سەربازی لە دەستدابو و لەسەرئاڵای سـوپاکە نووسـی (عموریـە) وبڕیاریـدا لەسـێ ڕێگەوە بچێتە خاکی بیزەنتیەکانەوە.

سوپای ڕۆژهـەڵاتی بەسـەرکردایەتی ئەفـشین بـەرەو شـاری(سـروج) نـارد تـا لـە ڕۆژێکـــی دیـــاریکراو و لـــە ڕێگـــەی درب الحـــدث)ەوە بـــچێتە خـــاکی بیزەنتیەکانـەوە،[٢]سـوپای ڕۆژئـاوایش بـە سـەرکردایەتی ئەشـناس دەبـو بـەرەو شاخەکانی تۆرۆس بەر شاری سفساف لە نزیك قەڵای لوئلوئە بچێت تـا لـە دەشـتی ئەنقەرە بگاتەوە بەسـوپای ڕۆژهـەڵات، خەلیفـەیش سـەرکردایەتی بەشـی سـێیەمی سوپای کرد و ڕاستەوخۆ بەرەو ئەنقەرە کشا، خەلیفە نەخشەتە کتیکیەکەی خـۆی کێشا تا لەدەشتی ئەنقەرە بۆ ڕوبەڕوبونەوە شارەکە سێ سوپاکە کۆ ببنەوە.[٣]

لەو کاتەدا ئیمپراتۆری بیزەنتی(ئیوفیل) لەدوای ئەوەی زانـی خەلیفـە نەخـشەی بۆ ئەنقەرە و عموریە داناوە، قوستەنتنیەی بە جێهێـشت و لـەدوای دووری سـێ ڕۆژ لە عموریە لە دوریلیوم وەستا و فەرمانیکرد تا سـەنگەر بگـرن و عموریـە تونـدوتۆڵ بکەنەوە و فریاگوزاری بۆ عموریە نارد، ئـەو نەخـشە جەنگیـەش کـەدواینا بریتـی بـو لەوەی لەکاتی کشانی سوپای ئیسلامی بەرەو باکوور و بەرەو ئەنقەرە هێرش بکەنە سەرهێزە ئیسلامیەکان، لەم پێناوەشدا لەسەر ڕوبـاری هـالیس سـەنگەریگرت و بـۆ پەڕینەوە لێی ئامادەسازی کرد تاموسـڵمانان بخاتـە داوەوە چونکە پێـی وابـو ئـەو

---

١ـهەمان سەرچاوە: ص ٥٧.

٢ـ ڤازیلیف: ص ١٣٣.

٣ـ الطبری: ج ٩/ ص ٥٧ـ ٥٨.

هێزانە دواتر لە ڕێگەیاندا بۆ ئەنقەرە ڕێگەی کیلیکیا دەبڕن، هیچی لە بارەی سوپای ئەفشینەوە نەدەزانی.[1]

پاشان خەلیفە فەرمانیکرد تا بوەستن تا هەواڵی سوپای بیزەنتی بزانن و نامەی بۆ ئەشناس نارد کە ئەوکات گەیشبوە (مرج الأسقف) لە نزیك لوئلوئە تا هەواڵی گۆڕانکاریەکان هەڵوێستی سەربازی پێبلێت و فەرمانیکرد تا بوەستێ تا قەدو بالای سوپای پێبگات چونکە پێویستی جەنگی هەڵگرتووە.[2]

ئیوفیل زانی کەسوپای ڕۆژهەلات بەسەرکدایەتی ئەفشین پێشڕەوی کردووە بۆیە نەخشەکەی گۆڕی وناچاربو سوپاکەی بکات بە دووبەشەوە، خۆی سەرکردایەتی بەشی یەکەمی کرد تال بەرەو ڕوی ئەفشین بوەستێ لە کاتێکدا بەشی دووەمی سوپاکەی بەجێهێشت، تا ڕێگە لە سوپای خەلیفە بگرێت تا نەهێلێت پێشڕەوی بکات بەوەیش هەوڵبدات ڕێگە بەوە نەدات هەردوو سوپای ئیسلامی بەیەکبگەن.[3]

کاتێ موعتەسەم نەخشەکەی ئیوفیلی زانی، ویستی ئەفشین ئاگاداربکاتەوە، کە ئیمپراتۆر بەرەو ڕووی دێت، بەلام ئەفشین ڕوچویە ناوئاسیای بچووك و هیچ نامەیەکی پێنەگەیشت ئەشنیش بەرەو ئەنقەرە درێژەی بە کشانەکەی داو خەلیفەیش لە دوایەوە چوو لە نێوانیاندا ماوەی یەك ڕۆژ ڕێگە هەبو هیچ کامیشیان سەرەنجام وڕێی ئەفشینیان نەدەزانی.[4]

لەوکاتەی سوپای خەلیفە لە ئەنقەرە نزیکدەبویەوە، ئەفشین سیواسی بەرەو توقات دەبڕی ئەو کات هەردەبولەجەنگێکدا لەگەڵ ئیمپراتۆردا پێکدا بدەن.

جەنگەکە لە بەرەبەیانی ڕۆژی بیست و پێنجی مانگی شەعبانی ساڵی (٢٢٣ك/مانگی تەمموزی ساڵی٨٣٨ز) دا دەستیپکرد، لەگەڵ ئەوەی بیزەنتیەکان لە سەرەتاوە سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، بەلام سوارچاکەکانی موسڵمانان بارەکەیان

---

١. Bury: op.cit. p٢٦٤.

٢. الطبری: ج٩ / ص ٥٨.

٣. Bury: op.cit. p٢٦٤.

٤. الطبری: ج٩ / ص ٥٩-٦٠.

لە شکستەوە گۆڕی کاتێ هەواڵ بڵاوبویەوە، کە ئیمپڕاتۆر مردووە و جەنگەکەیش بەردەوام بو بار گرژی و پێکدادان لەڕیزەکانی بیزەنتیەکاندا ڕوویدا و بیزەنتیەکان شکان و بەبێ لاکردنەوە ڕایانکرد ئیمپڕاتۆر پاش کەمێك ناڕەحەتی مەیدانی جەنگەکەی جێهێشت و چووتا گەیشتە شاری (فلیوکومن) لە باکووری ئەماسیاو لەوێ بەشەکانی سوپا ڕاکردووەکەی کۆکردەوەو گەڕایەوە بۆ سەربازگەکەی لەسەر ڕووباری هالیس و یەکێ لە دەستەکانی نارد بۆ ئەنقەرە تابەرگری لێبکات، بەڵام کارەکە لەدەست چوبو ئینجا گەیشتە ئەوێ چونکە سوپا ئیسلامیە پەرش و بڵاوەکان لە دەشتی ئەنقەرە کۆبونەوەو وێرانی و کاولییان تووشی شارەکە کرد.[١]

ئیوفیل لە دوای شکستی خۆی و کەوتنی ئەنقەرە هەر ئەوەی بۆ مایەوە نوێنەر بنێرێت بۆ لای موعتەسەم و داوای ڕێککەوتن بکات و پۆزش بۆ قەسابخانەکەی زەبتەرە بهێنێتەوە وبەڵێنیدا بنیادی بنێتەوە ودانیشتوانەکانی بۆبگەڕێتەوە و چی دیلی موسڵمان هەیە ئازادی بکات، بەڵام خەلیفە ئامادەی ڕێککەوتن نەبو و بەرەو عموریە درێژەی بەکشانەکەی دائیوفیلیش بەرەو دوریلیوم چوو و چاوەڕێی ئەو بارەحەتمیە تووشی عموریە ببێت.[٢]

خەلیفە لە دوای وێرانکردنی ئەنقەرە بەرەو عموریە پێشڕەوی کرد و لەحەوت ڕۆژدا گەیشتە ئەوێ و کەوتە گەمارۆدانی لەگەڵ سەختی وپتەوی شارەکەدا لەدوای دووهەفتە گەمارۆدان لە(حەفدەی مانگی ڕەمەزانی ساڵی٢٢٣ك/مانگی ئابی ساڵی ٨٣٨ز) دا شارەکە خۆیدا بەدەستەوە[٣] و موسڵمانان زۆرێك لە خەڵکەکەیان بەدیلگرت و دەستکەوتێکی زۆریان دەستکەوت و موعتەسەم شورەکانی ئەو شارەی وێرانکرد لە بەرامبەر فرمانی کرد تا زەبتەرە بنیاد بنرێتەوە.

هەڵمەتەکەی موعتەسەم لاوازی ئیمپڕاتۆریەتی بیزەنتی ئاشکرا کرد، ئەمە خەلیفەی هاندا تا درێژە بە کشانەکەی بەرەو قوستەنتنیە بدات و ڕێگەیش لە

---

١ـ هەمان سەرچاوە: ص ٦١ـ٦٢/ ٢٦٥ Bury: op.cit. P.

٢ـ اليعقوبي: ج ٢/ص٤٣٦.

٣ـ هەمان سەرچاوە: ص ٤٣٧.

بەردەمیدا کراوە بو، بەڵام ناچار بو بگەڕێتەوە بۆ عێراق، چونکە پیلانێکی بۆ ئاشکرا بو، کە سەربازەکانی لە بەرژەوەندی عەبباسیدا دایاننابو.[١]

لەو بارودۆخەدا وهەمووکات هەڵمەتەکەی موعتەسەم بۆسەروڵاتی بیزەنتیەکان تایبەتمەند وجیابو لەهەڵمەتەکانی پێشوو، کە ئامانجیان بەشەکان بو، ئەمجار عموریە دوور لە ناوەندی ئاسیای بچووك بو و تەبەری بە گەورەترین شوێنێك دایدەنێت کە لەوڵاتی ڕۆمدا بێت و کرابێتە ئامانج.[٢]

ئەو چەرمەسەریانەی لە ئاسیای بچوك لە دوای جەنگەکەی موعتەسەم کەوتن و ئەو پێشڕەویەی موسڵمانانی ئەفریقیا لە دوورگەی سقلیە روویدا و ئەو زیان و شکستانەی موسڵمانان لە دوورگەی کریت تووشی ئیمپڕاتۆریەتەکەیان کرد، هەموو ئەمانە قەناعەتیان بۆ ئیوفیل کرد کە ئیمپڕاتۆریەت ناتوانێت لە بەردەم هێزی زیادی موسڵماناندا بوەستێت، بۆیەخواستی ڕێککەوتنی هەبو.

لە کۆتاییدا لەساڵی(٢٢٧ك/٨٤٢ز)دا ڕێککەوتن لە نێوان هەر دوولا بەسترا،[٣] دواتر هەریەك لە موعتەسەم وئیوفیل لەو ساڵەدا مردن و واثق خیلافەتی گرتە دەست و میخائیلی سێیەمیش بەوەسیەتی تیودورای دایکی کورسی دەسەڵاتی ئیمپڕاتۆریەتی بیزەنتی گرتە دەست.

*** مردنی موعتەسەم :**

موعتەسەم لە ڕۆژی یەکەمی(مانگی موحەرەمی ساڵی٢٢٧ك/مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ٨٤١ز)دا کەڵە شاخی گرت، دوای ئەو تووشی نەخۆشیەك بو و لە هەشتی مانگی رەبیع ئەوەل کۆتاییەکانی مانگی کانونی یەکەمی ساڵی٨٤١ز بەو نەخۆشیە مرد، هاروونی کوڕی جێگیری بو وشوێنی گرتەوە و هیچ کەس لەوەدا هاوبەشی هاروون نەبو.[٤]

---

١ الطبری: ج ٩ / ص ٧١ – ٧٧ / المسعودی: ج٣ / ٤٧٣.

٢ هەمان سەرچاوە: ص ٥٧ـ ٥٨.

٣ Canb. Med.hist. ivp ١٣٠

٤ الطبری: ج ٩ / ص ١١٨ـ ١١٩.

# ئەبوجەعفەر هاروون واثق ( ٢٢٧ـــ٢٣٢ك / ٨٤١ـــ ٨٤٧ز

*** ناساندنی واثق :**

هاروونی کوڕی موعتەسەمەو کونیەی ئەبوجەعفەری هەیە، دایکی ئوم وەلەد بوو بە (قراتیس) بانگ دەکرا، لەو ڕۆژەی باوکی مرد و ەیعەتی موعتەسەمی باوکی لە ڕۆژی هەشتی مانگی ڕەبیع ئەوەلدا بەیعەتی خیلافەتی پێدرا.

واثق واناسراوە، کە عەقڵێکی چاك و هەڵس وکەوتێکی سیاسی باوکی لە سەردەمی باوکیدا هەبو، بۆیە ئەمەپاڵی بە باوکیەوە نا تا لەوکاتەی خۆی لە مەڵبەندی خیلافەتدا ئامادەنیە پشتی پێببەستێت پاشان کردی بە جێگیری خۆی تەوا سەرقاڵی زانست و ئەدەب بو، ئەو شاعیر بو و شیعری جوانی هەیە و پاداشتی بەشاعیران دەبەخشی و لەسەردەمیدا شاعیران زۆر زۆر بون، لە کۆشکەکەیدا بەتایبەت کۆڕێکی بۆ مشتومڕی هزری هەبو، لە مەدا پێشەنگی بە مەئموونەوە دەکرد وپێی دەوترا (مەئموونی بچووك)وەك باوکیشی پشتی بەڕەگەزی تورکی بەست، بەمە تورکەکان لەپایەسەرکردایەتیەکاندا شوێنی عەرەبیان گرتەوە.[١]

***بارودۆخی ناوخۆیی لەسەردەمی واثقدا :**

سەردەمی واثق بەماوەی گواستنەوەی نێوان دوو ڕەگەزی جیاوازسەردەمەکانی دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی دادەنرێت و لە زۆر دیاردەیدا هاوشێوەی سەردەمی مەئموون وسەردەمی موعتەسەمی باوکی بو.

واثق لە سەرەتای سەردەمە کەیەوە بەرەو ڕووی بزوتنەوە عەرەبیەکانی بەنی سەلیم و چەندێکی تر لەو خێڵەکیانە بویەوە، کە لە بەرەکانی شاردائاژاوەوخراپەیان دەنایەوەوکەوتەسەپاندنی ئارامی بەسەرڕێگە بازرگانیەکانی باکووری دوورگەی عەرەبیدا.[٢]

---

١ـ بۆ ژیانی واثق بگەڕێرەوە بۆ: إبن کثیر: ج ١٠/ص ٢٩٧ــ ٣٠٨ــ ٣١٠. محمد بن شاکر لکتبی: فوات الوفیات: ج ٤ /ص ٢٢٨ــ ٢٣٠.

٢ـ الطبری: ج ٩ / ص ١٢٩ــ ١٣١.

واثــق بــیری خــەلقی قورئــانی لــە بیروبــاوەڕی موعتەزیلەکانــەوە گرتەبــەر و لەسەرخستن و پاڵپشتی ئەوڕایەدا سیاسـەتەکەی بـاوکی گرتەبـەر و بۆ سـەپاندنی بـیروڕا ئایینیـەکانی بەسـەرخەڵکدا فشاری بەکاردەهێنائەمەوایکردلەلایـەن خـەڵکی گشتی و زانایانەوە بزوتنەوەیەك سەرهەڵبدات و خەڵکی بەغداد پیلانیان لە دژگێرا و داوای لابردنیان کرد، ئەویش لە پێش مردنی لەو بیرو باوەڕەی پاشەکشەی کرد.[١]

کارگێری واثق لەلایـەن والی و چواردەورەکانیەوە تووشـی لاوازی و دەستبەسـەر داگــرتن بــو و لەســەردەمیدا بــەرتیل و گەنــدەڵی زیــادیکرد، ئــەو خەلیفــەیش بەرامبەرکاربەدەســت و نووســەرەکانی سیاســەتێکی تونــدی گرتەبــەر و ڕێــڕەوی ڕەشیدی باپیری گرتە بەر، ئەم قسە بەناوبەنگەیشی وت: (دەستـەو سان کەسێکە خۆسـەپێن نـەبێت) بۆیـە دای لەنووسـەرەکانی ومـاڵ سـامانی لێ سـەندنەوە بـەو تۆمەتەی لەسەر حیسابی دەوڵەت خۆیان دەوڵەمەند دەکەن.[٢]

والیـەکانی هەرێمـەکان لەسـەردەمی واثقــدا قەڵـەمڕەوێکی گـەورەیان هــەبو، عەبـدوڵلای کـوڕی تـاهیری کـوڕی حوسـەین بـە نیمـچەسەربەخۆیی فـەرمانڕەوایی خوراسـان وتەبەرسـتان وکرمـانی دەکـرد،[٣] خەلیفـە فـەرمانڕەوایی جـەزیرە وشـام و مەغریبی دایەپاڵ ئەشناسی سەرکردەی تورکی،هەروەك ئیتاخی تورکی خوراسـان و سند و دیجلەی گرتە دەست.[٤]

*** مردنی واثق:**

واثــق کــەمتر لەشــەش ســاڵ خیلافــەتی عەبباســی گرتــە دەســت و دواتــر بەنەخۆشــی(استــسقاء) لــە(٣٠مــانگی ذیلحەجــەی ســاڵی ٢٣٢ك/مــانگی ئـابی ســاڵی٨٤٧ز)دا بــەبێ ئــەوەی کەســێ لــەدوای خــۆی دابنێــت مــرد، لــەکاتی نەخۆشـیەکەیدا کەمــرگی نزیکبویــەوە داوایــان لێکــرد وەســیەتی خیلافــەت بــۆ کوڕەکەی بکات، ئەویش ئامادەنەبو ووتی: (بەزیندوویی و مردوویش کار و بارتان لە ئەستۆ ناگرم) سەردەمی ئەوکۆتایی سەردەمی یەکەمی عەبباسی بو.[٥]

---

١ـ إبن کثیر: ج ١٠/ ص ٣٠٩.
٢ـ الطبری: ج ٩ / ص ١٢٥ــ ١٢٨.
٣ـ هەمان سەرچاوە: ص ١٣١.
٤ الیعقوبی: ج ٢/ ص ٤٤١.
٥ـ الطبری:ج ٩ / ص ١٥٠ـ ١٥١ ،حسن ابراهیم حسن:تاریخ الإسلام:سەرچاوەی پێشوو،ص ٨٤.

# سەردەمی عەبباسی دووەم

## سەردەمی قەڵەمڕەوی تورکی ( ٢٣٢ــ٣٣٤ ك / ٨٤٧ــ٩٤٦ز)

## خەلیفــەکانی ســـەردەمی عەبباســـی دووەم و مـــاوەی خیلافـــەتی هەریەکەیان:

ــ ئەبولفەزل جەعفەرمتەوەکیل ٢٣٢ــ٢٤٧ك / ٨٤٧ــ٨٦١ز

ــ ئەبوجەعفەرموحەممەد موختەسەر٢٤٧ــ٢٤٨ك / ٨٦١ــ٨٦٢ز

ــ ئەبولعەبباس ئەحمەدموستەعین ٢٤٨ــ٢٥٢ك / ٨٦٢ــ ٨٦٦ز

ــ ئەبوعەبدوڵڵا موحەممەد موعتەز ٢٥٢ــ٢٥٥ك / ٨٦٦ــ٨٦٩ز

ــ ئەبوئیسحاق موحەممەد موهتەدی٢٥٥ــ ٢٥٦ك / ٨٦٩ــ٨٧٠ز

ــ ئەحمەد موعتەمەد٢٥٦ــ٢٧٩ك / ٨٧٠ــ ٨٩٢ز

ــ ئەبولعەبباس ئەحمەد موعتەزەد ٢٧٩ــ ٢٨٩ك / ٨٩٢ــ ٩٠٢ز

ــ ئەبوموحەممەد موکتەفی ٢٨٩ــ ٢٩٥ك / ٩٠٢ــ ٩٠٨ز

ــ ئەبولفەزل جەعفەر موقتەدیر ٢٩٥ــ٣٢٠ك / ٩٠٨ــ ٩٣٢ز

ــ ئەبومنسوور موحەممەد قاهیر ٣٢٠ــ ٣٢٢ك / ٩٣٢ــ ٩٣٤ز

ــ ئەبولعەبباس ئەحمەد ڕازی ٣٢٢ــ ٣٢٩ك / ٩٣٤ــ ٩٤٠ز

ــ ئەبوئیسحاق جەعفەر موتتەقی ٣٢٩ــ ٣٣٣ك / ٩٤٠ــ ٩٤٤ز

ــ ئەبولقاسم عەبدوڵڵا موستەکفی٣٣٣ــ ٣٣٤ك / ٩٤٤ــ ٩٤٥ز

# سروشتی سەردەمی عەبباسی دووەم

سەردەمی عەبباسی دووەم لەزۆر دیاردەیەوە لەسەردەمی عەبباسی یەکەم جیاوازە، چونکە سەردەمی عەبباسی یەکەم سەردەمی بەهێزی خیلافەتەو جەخت لەسەر ئەوە دەکرایەوە کە دەسەڵات لە دەست خەلیفە سیاسیە لێهاتوو کەسایەتی بە هێزەکاندا بێت وتوانیان پەیوەندی پتەو لەگەڵ گەلدا بپارێزن ئەمە لەماوەی ئامادەسازی بۆ شۆڕش یارمەتیدان وەك:

ئەو ڕەگەزانەی بەرەو قەڵەمڕەو و دەسەڵات دەچن لێهاتوویەکی کەم وێنەیان نیشاندا ئەمە جیا لەوەی لە ئەفریقیاو هەندێ هەرێمی باکووری ئەفریقیادا ڕوویدا،[1] توانیان جۆرێك هاوسەنگی نێوان تەیارە سیاسیە جیاوازەکانیش بکەن کە لە دوای دامەزراندنی دەوڵەتەکە دەرکەوتن.

ئەم دیاردانەلەسەردەمی عەبباسی دووەمدا گۆڕان ودەوڵەت لە نیزامی دەسەڵاتدا لە مەرکەزیەتەوە گوازرایەوە بۆ لامەرکەزی چەند دەوڵەتێکی جیاش دامەزران کەیان سەربەخۆیی تەواویان هەبو، یان لەگەڵ داننان بەدەسەڵاتی رشۆحی خەلیفەدا نیمچە سەربەخۆییەکیان هەبو،[2] چەند گەلێکی نوێش هاتنە ناو کۆمەڵگەی ئیسلامی و توانیان بگەنە دەسەڵات وخەلیفەکان کەوتنە ژێرقەڵەمڕەوییانەوە ئەمە

---

١ـ عەبدوڕەحمانی داخل لە ئەندەلوس سەربەخۆیی وەرگرت و عەبدوڕەحمانی کوڕی حەبیب کە بەرپرسی ئەفریقیا بو دژ بە ئەمەوییەکان شۆڕشێکی بەرپاکرد و وەك ئەمیرێکی سەربەخۆدانی بە عەبباسیەکاندانا، مەغریبیش دامەزراندنی دەوڵەتی ڕۆستەمی لە تاهرت و ئەداریسەی لە مەغریبی دوور و ئەغالیبەی لە تونس بەخۆیەوە دی.

٢ـ لە دیمەنەکانی داننانی دەوڵەتە جیاکان بە دەسەڵاتی ئایینی خەلیفەدا:

١ـ لەسەر مینبەرەکان بانگەواز بۆ خەلیفە بکرێت

٢ـ ناوی خەلیفە لەپێش ناوی ئەمیری سەربەخۆ لەسەردراو بنەخشێنرێت.

٣ـ برێك لە خەراج بنێرێت بۆ بەیتولمال. بگەڕێرەوە بۆ: العش: یوسف / تاریخ عصر الخلافه العباسیه: ص ١٣٨.

بویە هۆی ئەوەی ڕۆڵی کارای سیاسیان نەمێنێت و ئەورێزەی پێشینەکانیان واتە: خەلیفەکانی سەردەمی عەبباسی یەکەم هەیانبو ئەمان لە دەستیاندا.[1]

ڕیشەی ئەو گۆڕانە لەو بارودۆخە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوریەداخۆی پەنگدابو کە دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی لە سەردەمی عەبباسی یەکەمدا تیایدادەژیاو تۆوی جیابونەوەی لەگەڵ خۆی هەڵگرت، چوارچێوەی دەوڵەتی عەبباسی تەواو فراوانبو، تا ئاستێ نەیدەتوانی لەمەڵبەندی خیلافەتەوە کارگێڕی بکات ئەمەش لە لایەکەوە لەبەرئەوەی گەشەسەندنی پێناوەکانی گواستنەوە لەگەڵ ئەو فراوانخوازیەدا نەبو ولەلایەکی تریشەوە لەئەنجامی گەشەسەندنی هەستی ڕەگەزی، لە بەرامبەر ئەم واقیعەدا دەوڵەت پەنای بۆ گرتنەوەی سیاسەتێکی دژبەست کە جەختی لەسەربەش بەشکردن دەکردەوە، جا هاروونە رەشید دەوڵەتی لە نێوان ئەمین و مەئموونی کوڕیدا دابەشکرد، بەشی یەکەم کە ناوچەکانی مەغریبی عەرەبی دەگرتەوە، بەشی دووەمیش ڕۆژهەڵات بو، وا عادەت بو کە خەلیفە بەیعەتی جێگیرایەتی بە دوو کوڕی بدات یەك لەدوای یەك بێت، کارگێری مەغریب بدرێتە دەست یەکەمیان و کارگێری ڕۆژهەڵاتیش بدرێتە دەست دووەم، خەلیفەکانی دوای هاروونە رەشید ئەم سیاسەتەیان گرتە بەر.

لە ئەنجامی ئەم دابەشکاریەدا دوو دیاردەی دژ بەیەك هاتنەکایە، دیاردەیەکیان هەوڵیدەدا جەخت لەسەر دەسەڵاتی مەرکەزی و مانەوەی تاك دەسەڵاتی بکاتەوە، دیاردەیەکیش ئیشی لەسەر جیاکردنەوەی هەرێمایەتی دەکردوباری کۆمەڵایەتی و ئابوری داڕماوی گەلانی بۆ بەدیهێنانی جیابونەوەی بەهەند وەردەگرت، لە کۆتاییدا دیدی جیا بونەوە سەرکەوت و ڕێگەی بۆدامەزراندنی دەوڵەتەجیابوەکان خۆشکرد، وێڕای ئەمەش دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی لەکاتی دامەزراندنیدا تۆوی جیابونەوەی هەڵگرت کاتێ گەلە ناعەرەبەکان ویستیان بگەنە ڕێبازی یەکسانی تەواو لەگەڵ عەرەبدا ئەمەش بەپێی حوکمەکانی شەریعەتی ئیسلامی لەدوای ئەوەی لەچەند قۆناغێکی پێشتردا ئەمەی لێ زەوتکرابو، خیلافەتی عەبباسی ئیشی

[1] ـ محمود والشريف: ص ٢٥٨

لەسەر جێبەجێ کردنی ئەو خواستە دەکرد، ئەمە بوە هۆی ئەوەی گیانی شعوبیەت لای گەلەناعەرەبەکان بەهێز بێت و پاڵیان پێوە بنێت بۆ دامەزراندنی چەند دەوڵەتێکی ڕەگەزی جیابوەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا هۆگری و پشتیوانی خۆی بۆپایەی خیلافەت دەپاراست ودانی بەدەسەڵاتی ڕۆحیی خەلیفەدا دەنا.

ئەم داواکاریەی ئەوگەلانە لە پشتەوە ئامانجێکی سیاسی هەبوە ئسلوب وشێوەی حوکمڕانی لە ویلایەتە کەنارو دوورەکاندا ڕۆڵی لە زاڵبونی دیدی جیابونەوەدا هەبو، خەلیفە عەبباسیەکان بە تایبەت لە سەردەمی زیادبونی قەڵەمڕەوی تورکەکاندا هەوڵیاندا هەندێ سەرکردەیان وەك فەرمانڕەوای ئەوهەرێمانە دابمەزرێنن، لە هەمان کاتداچاودێری ولێپرسینەوەی ئەو سەرکردانەیان پشتگوێ خست، بەپێی باری پشێوی کارگێڕی مەرکەزیین، ئەوانیش کەوتنە دانانی چەند نوێنەرێك بۆ خۆیان تا بەناوی ئەوانەوە کارگێڕی هەرێمەکان بکەن و بونیان لە پایتەختدا بپارێزن و لە ڕێوڕەسمی باڵای سیاسی دەوڵەتدا بەشداری بکەن و لەپیلانەکاندا بەشداربن و لە ژیانی کۆشك بێبەش نەبن.

شتێکی ئاساییە لەو بارە نائاساییەدا جێگیرەکان بۆ ڕازیکردنی سەرکردەو خەلیفەکان و تەنانەت خۆیشیان بکەونە ماڵ و سامان کۆکردنەوە بۆ کەوتنە زیادکردنی باجەکان ولەکۆکردنەوەیدا زیادەڕەوییان نواندتائەوەی کەوتنە ستەمکردن لەخەڵك وهەرکەس بەرامبەر ئەو ستەمەیان بوەستایە و باری ئابوریانی چاکبردایە دەکەوتنە شوێنی تەنانەت ئەگەرلە ویلایەتێکدا کەسێکە بەهێز بەدیکرایە، ئەو بارە نالەبارەی باری کۆمەڵایەتی و ئابوریەی دەقۆستەوە و خەڵکی دەوری کۆدەبونەوە و ئەویش جیابونەوەی خۆی ڕادەگەیاند.

بزووتنەوەی زەنج کە لە ساڵی (٢٥٥ك/٨٦٩ز) دا بەرپابو بەقۆناغی یەکلاکەرەوەی ناومێژووی دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی دادەنرێت وئیترهێزە جیابوەکان زۆر بەهێز بون تا ئەوەی بوە هۆی لێك هەڵوەشانی دەوڵەتەکە، جاباکووری ئەفریقیا هەر لە زووەوە لە دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی جیابویەوە، لە کاتی جەنگی دوورودرێژی لەگەڵ زەنج و دواتریش بە ماوەیەکی کورت، چەندین

ناوچەی تر لەخیلافەت جیابونەوە، ئەو بارەسەختەی خەلیفەکان خۆیانیان تێدا دەبینیەوە دەرفەتی بۆ سەرکردە چاوچنۆکەکان ڕەخساند تا لەبەشە جیاکانی دەوڵەتدا حکومەتی جیابوەوەی خۆیان دابمەزرێنن، سەرکەوتنی ئەوانیش لەگەڵ خواستەکانی ئەو چینەدا دەگونجا کە لە وڵاتان داستەمیان لێدەکرا، وێڕای چینی ناوەندی جووتیارو پیشەگەر و بازرگان و خاوەن موڵکەکان جا گەشەسەندنی پیشەسازی بەخێراییەکی پێویست پێشنەکەوت تادەستی کار بەهەند وەربگرێت و کشتوکاڵیش بەهۆی جەنگ و کاری دروجەردەکانەوە گەڕایەوە دواوە، هەروەك بزووتنەوەی جیهادیش پاشەکشەیەکی زۆری کرد، ئیتربێکاران هیچ ئیشێکیان نەبو، لەگەڵ ئەمەشدا لە هەمووشوێنێکدا گەنجێکی زۆرهەبون، کە دابویانە پاڵ بزووتنەوە جیاخوازییەکان، زیاد بونی کاری تاڵان و بڕی بڵاوبونەوەی دزی بویەهۆی ئەوەی چینی دووەم تووشی ترسی نالەباری کۆمەڵایەتی ببن، ئەمە ئەندامانی ئەو چینەی هاندا تایارمەتی ئەو فەرمانڕەوایانە بکەرەکە دەیانتوانی زامنی ئاسایش بکەن چونکە ئاسایش بۆ چالاکی کۆمەڵایەتی و پاراستنی سەقامگیرییان پێویست بو.

کاتێ شۆڕش هەڵگیرسا هێشتا ویلایەتە هەرێمیەکان لە ژێر دەستی ڕاستەوخۆی کارگێری خەلیفەکان، یان کارگێری چەند والیەکی دڵسۆزی خەلیفەکاندابون، لەکاتی شۆڕشدا هەموو شتەکان گۆڕان بیری کۆکردنەوەی جیهانی ئیسلامی لە ژێر یەك سەرکردایەتی سیاسیدا گرنگی خۆی لە دەستدا و بیری بەدیهێنانی بەرژەوەندیە هەرێمەکانی گەلە جیاوازەکانی ژێر ئاڵای خیلافەت شوێنی گرتەوە، بەجۆرێك هەمووگەلێك شەخسیەتی ڕەگەزی و دەمارگیری نەتەوەیی خۆی دەست بکەوێت و هەوڵبدات گەشەی پێبدات و بگاتە ئاستی جیابونەوە تا بارێك هات هەموو ڕەگەزێك خۆی حوکمڕانی خۆی دەکرد، هەندێ بەرەی ناوخۆیی وەك بەرهەڵستکاری عەلەوی وخەواریجی هانی ئەم ئاڕاستە شعوبیەتیەیان دا وخیلافەتیش نەیدەتوانی بەرامبەر بەو تەیارانە بەرگرییبکات.

بەڵام خیلافەت وەك نیزامێکی بنەڕەتی لە دیدی هەموو موسڵمانانەدا بونی بۆ بەردەوامی یەکبونی گشتی ئیسلامی پێویستیەکی ئایینی بو، چونکە هێمایەك

دەنوێنێت کەبەشە جیاکانی جیهانی ئیسلامی پێکەوە دەبەستێتەوە ، ئەو گەلانەیش جیابونەوەی سیاسی خۆیان هەبو، هەرگیز بیریان لە جیابونەوەی ئایینی نەدەکردەوە جگە لەوەی فاتیمیەکان کە هەر لەبنەڕەتدا دانیان بە شیاوێتی عەبباسیەکاندا بۆ خیلافەت نەدەنا.

خیلافەتیش لەلایەن خۆیەوە ئەو دیاردەی لەبەر چاو دەگرت و سووربو لەسەرئەوەی نەزعەکانی گەلان و خواستە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانیان و نێوان ڕێبازی یەکبون پێکەوە بگونجێنێ، بەڵام نەیتوانی هاوسەنگی نێوان هێزی مەرکەزی لە بەغداد و لە نێوان هێزە نامەرکەزیەکانی هەرێمەکان بە دیبهێنێت. ئەمە بویە هۆی دامەزراندنی چەن دەوڵەتێکی جیابویەوە،لەڕۆژهەڵاتدا دەوڵەتی تاهیری و سەفاری وسامانی دەرکەوت، هەروەك لەمیسر دوو دەوڵەتی تۆلۆنی وئەخشیدی دامەزران پاشان باکووری ئەفریقیا کەوتە بەرکاریگەری مەزهەبی و دەوڵەتی عەبیدی فاتیمی تیایدا دامەزرا.

لەبەرامبەر ئەم واقیعەدا خەلیفە عەبباسیەکان ناچاربون دان بەو بوارەدا بنێنن و لەژێر سایەی ئەو واقیعە نوێیەی کە پێی ڕازی بون هەموو گەلێك دەرفەتی بۆ ڕەخساتا لە چوارچێوەی ژیاری ئیسلامیدا داهاتووی خۆی بنیاد بنێ و بەڕێگەیەك لە ڕێگەکان لە بنیادنانی دەوڵەتی ئیسلامیدا بە پێی توانای خۆی بەشداری بکات.

لەوسەردەمەدا کە مەرکەزیەت لە کاروباری دەسەڵاتدا زاڵبو، ناکۆکیەکانی سیاسی لە نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای ئیسلامیدا بەدی دەینم، لەو کاتەی هەرێمە ڕۆژهەڵاتیەکان لە کاتی گەشەسەندنی ئاراستەی ڕەگەزی جیاکاری خۆیاندابون لە سەرئەوە سووربون لە بازنەی خیلافەتدا بمێننەوە و ڕیزی بۆدابنێنن و دان بەدەسەڵاتی ڕۆحی خیلافەتدا بنێن و هەوڵیاندەدا بە پاڵپشتی ئەودابمەزرێن تا ئەمە ببێتە بەڵگەی بونی دەسەڵاتی باڵای عەبباسی دەوڵەتە یا خوازەکانی مەغرییبیش بەرەو جیابونەوەی تەواو دەچوون و خواستی ڕەگەزی دەمارگیری حیزبە بەرهەڵستکارەکانیان بە دیدەهێنا.

دەوڵە تەجیابوەکان بەرپرسیارێتی بەرگریکردن لە جیهانی ئیسلامییان لە هەموو لایەکەوە گرتە ئەستۆی خۆیان و ئەو ئەرکەیان لە سەر شانی خیلافەت لابرد،

هەروەك قەڵەمڕەوی جیهانی ئیسلامیان بۆ چەندلایەکی نویێ درێژکردەوە، کە پێدەچێت خیلافەتی مەرکەزی نەیتوانیبا ئەوە بەدیبهێنێت هەروەها ڕێگەیان لەو هێرش و شاڵاوانە دەگرت کە دەکرانە سەر جیهانی ئیسلامی.

ناوچە سەر سنوریەکان وەك چەند یەکەیەك بەپێی گەشەسەندنی جیهانی ئیسلامی و پێویستی بەرگریکردن یان هێرش بردن بەهێز و لاواز دەبون و دەکەوتنە بەرکاریگەری مەترسی دەرەکی و هێزی خیلافەت.

جادەوڵەتی حەمدانی لەسەرسنورەکانی شام وجەزیرەدامەزرا، سەبارەت بەسەر سنورەکانی ئەودیوڕووباردەوڵەتە جیابوەکان کە لە ڕۆژهەڵات دامەزرابون ئەوئەرکەیان لە ئەستۆ گرت.

عێراقیش باری تایبەتی خۆی هەبو کە پەیوەست بە خیلافەت بو و ڕاستوخۆ یان بە ناوی خیلافەتەوە فەرمانڕەوایی دەکرد کاتێ ڕەگەزە قەڵەمڕە و خوازەکان بەهێز بون تا لە کۆتاییدا خیلافەت لە پایتەختدا قەڵەم ڕەوی خۆی لەبەردەم زیاد بونی قەڵەمڕەوی تورکەکاندا بە تەواوی لە دەستدا هەروەك پێشتر لە هەرێمەکاندا لە دەستیدا تا پایەی خیلافەت بە تەنها ڕەمز و هێمایەك بێت و دەوڵەت بە دەوریدا کۆببێتەوە.

لە کۆتاییدا سەردەمی عەبباسی دووەەم ئەو تایبەتمەندیەی هەبو، کە پەیوەندی نێوان خیلافەت و نێوان سەرچاوەکانی هێزی لە هەرێمەکاندا داڕما ئەمەش بویە هۆی لاواز بونی، خەلیفەیش سیفەتی لوتکەی هەڕەمی تەنزیمی ئەو نیزامەی لە دەستدا، کە لە سەردەمی عەبباسی یەکەمدا بەسەر ژیانی ئیسلامیدا زاڵ بو، پاشان ئەو شان و شکۆ و سامەی لە دەستدا لە دەروونی خەڵکدا بە دەستی خستبو لە ئەنجامی ئەمەدا تووشی سوکایەتی بو.[١]

---

١- بەهۆی چەند هۆکارێکی ناوخۆیی تایبەت بەماڵی عەبباسی ونەزعە بنەماڵەییەکانی و بەهۆی چەند هۆکارێکی دەرەکیەوە، کە لە گەڵ دەرکەوتنی دەمارگیری لە هەرێمەکان و هەوڵەکانی خواستە ناوچەییەکانی لەبەردەم پاشەکشەی ڕەگەزی عەرەبی بەهۆی بەرش و بڵاوبونی عەرەب لەناوچەکان وتێکەڵ بونیان بەوگەلانەی ملکەچیان بون ولەبەرهەڵگیرسانی

# بەشی حەوتەم

# بارودۆخی ناخۆیی دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی

## پەیوەندی لەگەڵ تورکەکان ـ دەرکەوتنی نیزامی ئەمیری ئەمیران ـ بزووتنەوەی زەنج ـ پەیوەندی لەگەڵ عەلەوییەکاندا.

### أ: پەیوەندی لەگەڵ تورکەکاندا:

پایتەختی خیلافەت لەبەغدادەوە گوزرایەوە بۆسامەڕاء وماوەی نزیکەی پەنجاساڵ سامەڕاء پایتەختی خیلافەتی عەبباسی بو وبوبە پێگەیەك بۆ دەمارگیری ڕەگەزایەتی نۆیی توركی، لەسەردەمی موعتەسەمەوە لە سەرشانۆی ژیانی سیاسی چەند کەسایەتیەکی تورکی دەرکەوتن کە ڕۆلێکی گەورەیان لە ژیانی گشتیدا بینی، کە دیارترینیان ئەفشین و ئەشناس و ئیتاح و وەسیف وسیمای دیمەشقی بون، ئەوانە خزمەتی دەوڵەتیان کردو دژ بەو بزووتنەوە بەرهەڵستکارانەی لە بەشە جیاکانی دەوڵەتدا دروست بون و ڕاپەڕین پشتی دەوڵەتیان لە جەنگە ناوخۆییەکاندا گرت، لە جەنگە دەرەکیەکانی خیلافەتیشدا دژ بە ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی پاڵپشتی خیلافەت بون، لەگەڵ تێپەڕبونی کاتدا ئەو تورکانە کەوتنە پێکهێنانی قەوارەیەکی تایبەت بە خۆیان، ئیتر لە کۆشی خیلافەتدا ببێت یان بەجیا لە خیلافەت بێت، هەروەك هەندێکیان دەیان ویست کاروباری دەسەلات لە پایتەختدا تەنها لە دەست خۆیان بێت، کاتێ زانییان خیلافەت بەبێ خزمەتی ئەوان بەڕێوەناچێت.

---

دەمارگیری لەنێوانیاندا ئەوپەیوەندییانەنەمان، ئیتر خیلافەت پاڵپشتی ڕەگەزی عەرەبی لەدەستدا، هەروەك لەدوای ئەوەی چەند گورزێکی لەفارسەکان وەشاند، پاڵپشتی ڕەگەزی فارسیشی لە دەستدا.

خیلافـەتی واثقـی کـوڕی موعتەسـەم (٢٢٧ــ٢٣٢ك/٨٤٢ــ٨٤٧ز) بـە مـاوەی گواسـتنەوەی خیلافـەت لـە نێـوان دوو سـەردەمدا دادەنرێـت، یەکـەم سـەردەمی دەسـتڕۆیی تورکەکانـە بەسـەر تواناکـانی دەوڵەتـدا لەگـەڵ مانـەوەی شانوشـکۆی خیلافەتدا، دووەمیش سەردەمی دەستڕۆیی تورکەکانە لەگەڵ نـەمانی شانوشـکۆی خیلافەت و داکەوتنی پایەی خەلیفەکاندا [١].

تورکـەکان لەسـەردەمی واثقـدا جـێ پێـی خۆیـان لـە دەسـەڵاتدا چەسـپاند و سەرکردەکانیان قەڵەمڕەوێکی گەورەیان بە دەستخست تا ئەوەی خەلیفە ناچار بـو نازناوی شوڵتان لە ئەشناس بنێ و دان بـە مـافی دەرچـوون لـە چوارچێوەی ئەرکـە سەرازیەکانیدا بنێ، بەمەیش ئەو یەکەم خەلیفە بـو کـە سـوڵتانی دانـا [٢] و کاروبـاری جـەزیرە و وڵاتـی شـام و میـسری پێـدا، هـەروەك ویلایـەتی خوراسـان و سـند و کوردیجلەی دایە دەست ئیتاخ [٣].

لـە ئـەنجامی ئـەو بەرفراوانیـەی سـەلاحیاتانە، تورکـەکان هـەژموونی خۆیـان بـە سەردار و لخەلیفەدا سەپاند و دەستڕۆیی کرداری خۆیان بەسەر هەموو هەرێمەکانـدا سەپاند، پاشان هانگاوێکی تریان نا و باوەڕیان وابـو بـۆ درێـژەدان بـە دەسـەڵاتیان دەست بگرن بەسەر خودی خەلیفەدا بەو پێیەی سەرچاوەی ئەو دەسەڵاتەیە. بۆیـە چواردەوریاندا و چـاودێری بـزوات و جوڵـەیان دەکـرد و لـە مـشتومڕە سیاسـیەکاندا بەشـدارییان دەکـرد و نەدەچـوون بـۆ ویلایەتـەکانی خۆیـان و لـە شـوێنی خۆیانـدا جـێگیری خۆیـان دادەنـا [٤]. ئـەو نەخـشەدانانە هـەنگاوێکی سیاسـی لـە سـەر ڕێـی جیاکردنەوەیویلایەتەکان لە کارگێری مەرکەزی پێکهێنا و وەکیلـەکان چاویان بڕیـە ویلایەتەکانیان و دەرفەتی لاوازی دەسـەڵاتی مەرکـەزی و بێئاگـەیی خەلیفـەیان لـە بارودۆخی هەرێمەکان لەبەر بێ خەم بونی لەبەر والیە تورکەکان بەهەنـد وەرگـرت و سەربەخۆییان پەیڕەو کرد.

---

١ـ محمود و الشریف: سەرچاوەی پێشوو، ص٣٢٩.

٢ـ السیوطي: تاریخ الخلفاء ص٣٤٠.

٣ـ الیعقوبي: ج٢ ص٤٤١.

٤ـ المسعودي: ج٤ ص٣.

تورکەکان هەنگاوێکی تریان گرتە بەر لە پێناو ئەوەی زیاتر دەست بەسەر خیلافەتدا بگرن، ئیتر دەستیان وەردەدایە دەستنیشان کردن و دانانی خەلیفەکان، واثق کۆتا خەلیفە بو لەسەر شێوەی پێشوو دانرابێت. دواتر واثق مرد و جێگیرایەتی نەدا بە موحەممەدی کوڕی، چونکە تەمەنی کەم بو، بۆیە سەبارەت بە دەستنیشان کردنی خەلیفە ناکۆکی کەوتە نێوان دوو دەستەی سەرەکی، دەستەی یەکەم لە گەورە پیاوانی دەوڵەت لە منداڵانی خێزانی عەبباسی و وەزیر موحەممەدی کوڕی عەبدولمەلیك زەیات و گەورەی دادوەران ئەحمەدی ئەبوداود پێك دەهات. ئەم دەستەیە موحەممەدی واثقی کاندید کرد، دەستەی دووەم بەهێزی تورکەکان بو کە بە سەرکردایەتی وەسیەتی تورکی ئیشی بۆ چەسپاندنی قەڵەمڕەوی خۆی دەکرد، ئەم دەستەیە جەعفەری کوڕی موعتەسەمی کاندید کرد، ئەم دەستەیە توانی کاندید کراوی خۆی بۆ خیلافەت بچەسپێنیٚ، بەمەیش پایەی خیلافەت درایە دەست جەعفەر و نازناوی متەوەکیلی لێنرا [١].

ئەوڕووداوە دوای ئەوە پێشینەیەکی مەترسیداری بۆدانانی خەلیفەکان پێکهێنا و سەرکردە تورکەکان بون بە ئەهلی حەل و عەقد و تەنها بە ڕەزامەندی ئەوان خەلیفە دادەنرا و هەرکەسیان بویستایە دایاندەنا یان بە پێچەوانەوە، بەم جۆرە بە تەواوی دەستیان بە سەر کاروباری خیلافەتدا گرت و بە خواستی خۆیان هەڵسوکەوتیان بەکاروبارەکانەوە دەکرد.

خەلیفەکانیش بە ئاسانی ملیان بۆ قەڵەمڕەوی تورکی کەچنەکرد و بە سەختی بەرگرییان کرد و هەوڵیاندا لە خەلیفە سازەکان ڕزگاریان بێت، بەڵام هێزی پێویستیان بۆ بەرنگاربونەوەی ئەو قەڵەمڕەوە سەرکەش و یاخبوە نەبو.

متەوەکیل لە ساڵی (٢٣٢ـ٢٤٧ك/٨٤٧ـ٨٦١ز) بەهێزی تورکەکان خیلافەتی گرتە دەست، ئەوان دەیانزانی خیلافەت بەبیٚ ئەوان هیچی پیٚ ناکرێت، بۆیە زیارتر هەڵوێستیان وەرگرت، خەلیفە متەوەکیل هەستی بەڕاستی هەڵوێستی فشار خستنەسەر خیلافەتی تورکەکانی کرد و زانی کە بە زۆر کاروباری خیلافەت بۆ

---

١ـ الطبري: ج٩ ص١٦٨ـ١٦٩.

خۆیان دەهێڵنەوە و کەم ڕێزی کەسایەتی ئەویش دەگرن، بۆیە بڕیاریدا هێزیان بوەستێنێ و لە ئیتاخەوە دەستی پێکرد و لە پایەکانی دووری خستنەوە و بەندیکرد و لە ساڵی (٢٣٥ك/٨٥٠ز) لە بەندیخانەکەیدا مرد [١].

بۆ ئەوەی ڕێگەنەدات تورکەکان لە دانانی جێگیردا دەستوەردەنە ئەو کارە، موتەوەکیل بەیعەتی جێگیرایەتی بۆ سێ کوڕی خۆی دا کە بریتی بون لە: موحەممەد مونتەسەر و ئەبوعەبدوڵلا موعتەز و ئیبراهیم موئەیەد. وڵاتیشی لە نێوانیاندا دابەشکرد و لەمەیشدا ئەو سیاسەتەی گرتەبەر کە خیلافەت لە سەردەمی ڕەشیددا لە سەر بو، بۆیە هەموو مەغریبی دایە دەست مونتەسەر و هەموو ڕۆژهەڵاتیشی دایە دەست موعتەز و ناوچەی حیمس و دیمەشق و فەلەستینی بۆ موئەیەد بڕییەوە، دواتر لە ساڵی (٢٤٠ك/٨٥٤)دا خەزێنەی ماڵ و سامانی هەموو وڵات و پارەلێدانی دایە دەست موعتەز و فرمانیکرد تا بە ناوی ئەوەوە دراو لێبدرێت [٢].

ئەو کات تورکەکان هەستیان بە مەترسی و دواتری ئەو کارە کرد و ڕقیان دژ بە خەلیفە زیادی کرد و دژ بە دورخستنەوەیان لە پایەکانیان هەنگاو بە هەنگاو لە پێناو لە ناو بردنیان وەستان، بۆیە بەردەوام پیلان و نەخشەیان دادەنا، متەوەکیل لەو بارە ناڕەحەتەدا هەستی بە بەرتەسکی کرد، لەبەر ئەوەی ئەگەر لە سامەراء بوایە لە ژێر دەستی ئەواندا دەبو نەیدەتوانی خواستی بە زۆری بە دەست خستنی ماڵ و سامان ببگرێتە دەست خۆی، بۆیە هەوڵیدا لە ڕێگەی گواستنەوە دیمەشق و کردنی بە پایتەختی خۆی دەسەڵاتیان دوور بخاتەوە تاکوو ڕەگەزی عەرەبی لەوێ پاڵپشتی بن، بەڵام باری ناوخۆی و کەش و هەوایی یارمەتی ئەوەی نەدا لەوێ بمێنێتەوە و دوای سێ مانگ لە دیمەشق ناچار بو بگەڕێتەوە بۆ سەمەڕاء [٣].

دژمنایەتی نێوان خەلیفە و تورکەکان لەو قۆناغەدا گەیشتە خاڵی نەگەڕانەوە و کۆتایی و هەردەبو یەکیان ئەویتر لە ناو ببیات، تورکەکان بزاوتیان خێراتر بو، بۆیە

---

١ـ الطبري: ج٩ ص١٦٨ـ١٦٩.

٢ـ هەمان سەرچاوە: ص١٧٥ـ١٨٠.

٣ـ هەمان سەرچاوە: ص٢١٠.

بە یارمەتی مونتەسەری کوڕی کە لە دژی باوکی هەستا لەبەر ئەوەی باوکی لە جێگیرایەتیدا موعتەزی پێشی ئەو خست جگە لە نەکرانی ڕای سیاسی نێوانیان لە بواری پەیوەندی لەگەڵ تالیبیەکاندا، توانییان خەلیفە موتەوەکیل بکوژن [١].

کوشتنی متەوەکیل یەکەم ڕووداوی دەست درێژیکردنە سەر خەلیفە عەبباسیاکانە، پێش ئەوە تەنها ئەمین لە دوای شکستی لە جەنگدا کوژرا بو، کە بویە هۆی ئەوەی تورکەکان لە دەسەڵاتدا جێپێیان چەسپاو بێت هەروەك بێدارکردنەوەیەکیش بو بە ڕووی هەموو عەباسیەکدا کە بیەوێت خیلافەت بگرێتە دەست، دەبێ یەکێ لەم دوانە بگرێتە دەست: یان بە تەواوی ملکەچی ئارەزوو و خواستیان بن، یان جەنگ.

ڕووداوی کوشتنەکەیش شەپۆلێکی توندی دژ بە دەسەڵاتداری سەربازی تورکی نایەوە و لە ساڵی (٢٤٨ك/٨٦٢ز) لە سامەڕاء بزووتنەوەیەکی نەتەوەیی ڕوویدا کە دەربڕی ڕای ناڕەزایی هەموان بو بەرامبەر ئەو کارەیان لە ڕووی خیلافەتدا و نابێ خیلافەت بۆ تورکەکان بێت [٢].

شتێکی سروشتیە مونتەسەر ٢٤٧ـ٢٤٨ك/٨٦١ـ٨٦٢ز) کە تورکەکان بەیعەتیان پێدا و کردیان بە خەلیفە ملکەچی قەڵەمڕەوی تورکەکان بێت، تەنها دیمەنێکی ناوی هەبێت و ناوی لە دراو و وتاردا ببرێت، ئەوان مەترسیان لەوە بو لە دوای مونتەسەر موعتەز و موئەیەدی دوو کوڕی موتەوەکیل بێنە سەر خیلافەت و داوای خوێنی باوکیان بکەن، بۆیە فرمانیان بە مونتەسەر کرد تا هەردووکیان لە جێگیرایەتی لاببات، خەلیفە زاتی ناڕەزایی نەبوو بە ناڕەزایی فرمانەکەی جێبەجێ کرد و دوو براکەی ناچارکرد تا واز لە جێگیرایەتی بهێنن [٣].

بەوجۆرە مونتەسەر هەستی بەمەترسی دەسەڵاتی تورکی کردو ڕقی لێهەڵگرتن و هەوڵیدا سەرکردەکانیان لە ناو ببات کە بە (بکوژانی خەلیفەکان) دەناسران،

---

١ـ مونەسەر لەبەر ئەوە لە دژی باوکی هەستا چونکە باوکی لەگەڵ تالیبیەکاندا توند بو، ئەویش سۆزی هەبو بۆیان و پێی وا بو ئەوان لێیان نزیکن و نابێ سووکایەتیان پێبکرێت.

٢ـ الطبري: ج٩ ص٢٥٦ـ ٢٥٨.

٣ـ هەمان سەرچاوە: ص٢٤٤.

تورکەکانیش لەم مەترسیەی ڕێیان پێدەگرت وریاییان وەرگرت و لە ڕێگەی تـەبیبی تەیفوریەوە کە بە موسێکی ژەهراوی لە کاتی کەڵەشاخدا ژهـراوی کـرد خەلیفـەیان کوشت [١].

تورکەکان هـەموو یـەك دەنـگ بـەڵێنیان داتـا هیـچکام لـە کوڕەکـانی متـەوەکیل هەڵنەبـژێرن لەترسـی ئـەوەی لەبـەر خـوێنی باوکیـان ئەوانـە نـەکوژن و بڕیاریانـدا ئەحمەدی کوڕی موحەممەدی کوڕی موعتەسەم دابنـێن و نازنـاوی(موسـتەعین)یـان لێناو پایە گەورەکانی دەوڵەتیان دابەش کـرد، خەلیفـە ئـەحمـەدی کـوڕی خەسـیبی کردە نووسەری خۆی و ئوتامشی لەسەر میسر و مـەغریب دانـا و کـردی بـە وەزیـر، هەروەك شاهەکی کرد خادمی ماڵ و پەردوو و پاسەوان و کاروباری تایبەتی و ئەوو ئوماشی بەسەر هەموو خەڵکدا پێشخست [٢].

سەردەمی موستەعین (٢٤٨ـ٢٥٢ك/٨٦٢ـ٨٦٦ن) بە ڕوودانی بـارگرژی و جـەنگ لەسەر دەسەڵات دەستی پێکرد و لە سامەراء شۆرشێك بەناوی موعتـەزەوە دەسـتی پێکرد و هەموان و تورکەکان لـە جـەنگێکی کـۆڵان و شـەقامەکاندا پێکیانـدادا و بـە سەرکەوتنی تورکەکان کۆتای پێ هات. خەڵکی لە بەغداد لـە ئـەنجامی خۆسەپێنی تورکەکاندا ڕاپەڕین و هەموو کەوتنـە هـاوار و بانگـەوازی جـەنگ، [٣] بـەڵام تورکـەکان بەسەر بارەکەدا سەرکەوتن.

یـەکبونی تورکـەکان زۆر درێـژەی نەکێـشا و لـە دوای ئـەوەی بەسـەر خەڵکـدا سـەرکەوتن نـاکۆکی کەوتـە نێـوان خۆیـان، موسـتەعین ئـەو ناکۆکیانـەی بەهەنـد وەرگـررت و کەوتـە لـە نـاوبردنی سـەرکردەکانیان، ئەحمـەدی کـوڕی خەسـیبی بـۆ دورگەی کریت [٤] دوورخـستەوە، (ئوتـامش وبـاغر)یـشی کوشـت، [٥] پاشـان ڕایکـرد بـۆ

---

١ـ هەمان سەرچاوە: ص٢٥١.

٢ـ هەمان سەرچاوە: ص٢٥٦ـ ٢٥٧ـ ٢٦٠.

٣ـ الطبري: ج٩ ٢٦٢ـ ٢٦٣.

٤ـ هەمان سەرچاوە: ص٢٥٩.

٥ـ هەمان سەرچاوە: ص٢٦٣ـ ٢٦٤ـ ٢٧٨ـ ٢٨٠.

بەغداد تا لە ناو خەڵکەکەی خۆی بپارێزێت،[١] ئەو کات تورکەکان لابردنی موستەعینیان ڕاگەیاند و بەیعەتیان بە موعتەز دا و زۆربەی سەرکردەکەنیان لە دەوری کۆبونەوە، لە کاتێکدا خەڵکی بەغداد و هەندێ لە سەرکردە تورکەکان کە ڕایان کرد بو بۆ بەغداد پاڵپشتی خەلیفە موستەعینیان دەکرد. جەنگ لە نێوان هەردوو لادا هەڵگیرسا بەغداد و دەوروبەری بەغداد شانۆی جەنگەکە بو، ببەڵام تورکەکان توانییان خۆیان یەکبخەنەوە و موستەعین لاواز بو، بۆیە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی تاهیری ئەمیری بەغداد لە دوای ئەوەی هەستی بە سەختی بارەکە کرد وازی لێهێنا، ئەویش لەگەڵ ئەوە خەڵکی گشتی یارمەتییان دەدا ناچار بو واز لە خلافەت بهێنێ و بەیعەتی خیلافەت بە موعتەز درا (٢٥٢ــ٢٥٥ك/٨٦٦ــ٨٦٩ز) و موستەعین چوو بۆ بەسرە بۆ مەنفاکەی، بەڵام تورکەکان لە مانەوەی دەترسان بۆیە بڕیاری کوشتنیان دا و کوشتیان[٢].

بارودۆخی خیلافەت لە سەردەمی خیلافەتی موعتەز دا لەوە باشتر نەبو، بەڵکو خەلیفە گەڕایەوە بۆ سامەڕاء و کەوتە ژێر کاریگەری قەڵەمڕەوی تورکی، لە لایەکی تریشەوە خۆسەپێنی تورکەکان و بارگرژی و داخوازی ماڵ و سامان لە لایەن تورکەکانەوە زیادی کرد و خەلیفەش ئەوەی پێنەدەکرا، ئەمە بویە هۆی ئەوەی تورکەکان خەلیفە لابەن و موئەیەدی برای دابنێن، بەڵام خەلیفە براکەی خۆی ناچارکرد تا واز بهێنێت و دواتر کوشتی و هەندێ سەرکردەی تورکیشی لەناو برد وەك وەسیف و بەغا کە دوو بەرپرسی جەنگی ناوخۆی نێوان ئەو و نێوان موستەعین بون[٣].

توکەکان زانیین خەلیفە نیازی چییە، بۆیە بۆ پاراستنی ژیان و دەستکەوتی خۆیان کەوتنە جووڵە و خەلیفەیان ناچارکرد تا وازبهێنێت و خیلافەتیان دایە دەست موحەممەدی کوڕی واثق و نازناوی (موهتەدی)یان لێنا و موعتەزیان

---

١ـ هەمان سەرچاوە: ص٢٨١.

٢ـ المسعودي: ج٤ ص٧٩.

٣ـ اليعقوبي: ج٢ ص٤٦٨ــ ٤٧٠.

دایەدەست کەسێك تا سزای بدات، ئەویش کەوتە سزادانی تا مرد [١].

موهتەدی (٢٥٥ـ٢٥٦ك/٨٦٩ـ٨٧٠ز) کەسێکی نەرم و نیان و نەوازش و لە خواترس بو[٢] و زۆر حەزی بە چاکسازی و چاکە دەکرد و لەخۆیەوە کەوتە چاکسازی و ڕەنگ و ڕازاوەی و کەشخەیی دنیای لە خۆی لابرد و فرمانی بە چاکە کرد و ڕێگری لەخراپە کرد و مەی قەدەغە کرد و ڕێگری کرد و دادپەروەری نیشاندا هەموو هەینیەك لەمزگەوت ئامادە دەبو و وتار و بەرنوێژی بۆ خەڵك دەکرد و سەرپەرشتی دیوانەکانی دەکرد و دەیڕوانیە بەشی ستەمەکان و گومەزەیەکی بۆ بنیادنا و چوار دەرگای بۆ دروستکرد و ناوی نا گومەزی مەزالیم، لەوێ بۆ قسە و سکاڵای کەسانی گشتی و تایبەتی دادەنیشت [٣]. بەمە باری بەسەر هەموانداقورس بو و خەڵکی خوازیار بون زیاتر خیلافەتی لە دەستدا بمێنێتەوە تا ئەوەی لەو ماوەیەدا ئازار و ناڕەحەتییان بەخۆوەنەدی.

موهتەدی وای چاوەڕوان دەرکرد سیاسەتە چاکسازیەکەی بەرهەم بدات، بەڵام باری گشتی ناو و دەرەکی وڵات ئەو دەرفەتەی نەدا خەڵکی ل بەغداد دژ بەدەسەڵاتەکەی هەستان، دواتر بەهۆی دواکەوتنی ڕۆزییانەوە سەربازانیش کەوتنە شوێن خەڵك[٤] تالیبیەکانیش لە زۆربەی هەرێمەکاندا ئاگری شۆرشیان هەڵگیرساند [٥] و شۆرشی زەنج هەڵگیرسا کە ماوەی چواردە ساڵ هەڕەشەی لە کیانی دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی دەرکرد و خەواریجیش لە موسڵ ڕاپەڕین، هەروەك ئەحمەدی کوڕی عیسای کوڕی شێخی والی فەلەستین و ئوردونیش شۆڕشی بەرپاکرد.

بەڵام هۆکاری ڕاستیەکەی لەوەدا خۆی مۆلدا بو کە تورکەکان هەژموونیان بەسەر خیلافەتدا هەبو و بۆ سەرکەوتوویی چاکسازی دەبو لە دەستیان ڕزگار

---

١ـ الطبري: ج٩ ص٣٨٩ـ ٣٩٠.

٢ـ إبن عمراني، محمد بن علي بن محمد: الأنباء في تأريخ الخلفاء ص٩٨.

٣ـ المسعودي: ج٤ص٩٦.

٤ـ الطبري: ج٩ ص٣٩٢ـ ٣٩٣، ٣٩٩ـ ٤٠٦.

٥ـ هەمان سەرچاوە: ص٤١٠ـ ٤٢٣.

بوایەو شانۆشکۆی خیلافەت بگێڕێتەوە، بۆیە خەلیفە بڕیاریدا سەرکردە تورکەکان لە ناوخۆیاندا بە جەنگ بدات، بەڵام هەوڵەکەی سەر نەگرت و هەموو تورکەکان یەك دەنگبون لە سەر ئەوەی خەلیفە موهتەدی لەناوببەن [١].

لە دوای کوشتنی موهتەدی تورکەکان بەیعەتیان بە ئەبولعەبباس ئەحمەدی کوڕی تەوەکیل داو نازناوی (موعتەمەد) یان لێنا (٢٥٦ــ٢٧٩ــ ك/٨٧٠ــ٨٩٢ن) [٢]. لە ئەنجامی زۆر بونی ناکۆکی ئەحمەد تەلحە موەفەقی برای کرد سەرکردەی سوپا، ئەو پیاوە بە کەسی کارای مەیدانی بوژاندنەوەی خیلافەت لە سەردەمی موعتەمەدەوە دادەنرێت، ئەو بو کە هەموو کارەکانی لە دەست کۆبویەوە و خەلیفە تەنها وتار و دراوی بۆ مابویەوە و بە ئەمیری باوەڕداران ناوی دەهات. بەمە شانوشکۆی تورکەکان شکا بە تایبەتی لە دوای ئەوەی لە بەردەم زەنجەکاندا شکستیان خوارد و نەیانتوانی لە ڕووی کشانی جیابونەوە لە دەوڵەت و دامەزراندنی دەوڵەتە جیابوەکاندا بەرگری بکەن.

بەڵام مۆفەق لە ساڵی (٢٧٨ك/ ٨٩١ن)دا مرد [٣] و خیلافەتیش هێشتا پێویستی بە پیاوێکی بەهێز هەیە تا دەستکەوتەکانی بپارێزێت، بۆیە موعتەمەد ئەو کوڕەی خۆی لابرد کە جێگیرایەتی پێدا بو، ئەمەش لە دوای ئەوەی کوڕەکەی لە بواری ئەو ململانێیەی لە نێوان خیلافەت ە نەیارەکانیدا ڕوویدا دەستە وسانی نیشاندا. موعتەمەد بەیعەتی بە ئەبولعەبباسی موعتەزەدی کوڕی موفەق دا و دواتر لە کتووپڕێکدا خەلیفە لە دوای چەند مانگێك کۆچی دوایی کرد [٤].

موعتەزەد (٢٧٩ــ٢٩٨ك/ ٨٩٢ــ٩٠٢ن) لە جەنگ و کارگێرییەکانیدا بە ئامانجی بەردەوام بوژاندنەوەی خیلافەت و چەسپاندنی شانوشکۆی هەمان ڕێبازی باوکی

---

١ـ سەبارەت بە لابردن و دواتر مردنی موهتەدی بڕوانە: هەمان سەرچاوە ص٤٥٦ـ ٤٦٩ ئەو کات درێژەی ڕوداوەکە دەزانیت.

٢ـ الطبري: ج٩ ص٤٧٤.

٣ـ هەمان سەرچاوە: ج١٠ ص٢٠ـ ٢٢.

٤ـ المسعودي: ج٤ ص١٤٢.

گرتەبەر، لە سەردەمی ئەویشدا پاشەکشەی قەڵەمڕەوی تورکەکان بەردەوام بو. موعتەزەد لە دوای مردنی خۆی موکتەفی کوڕی دانا (٢٨٩ــ٢٩٥ك/٩٠٢ــ٩٠٨ن)[١] لە سەردەمی ئەمدا بزووتنەوە جیاخوازی و شۆرگێڕیەکانی وەك ئیسماعیلیە و قەرمەتیەکان و عەبیدییە دەرکەوتن و خەلیفەیش بۆ سەرکوتکردنیان هەوڵێکی زۆری خستەگەڕ و دای لە قەرمەتیەکان و لە وڵاتی شامدا دەسەڵاتی خیلافەتی سەقامگیر کرد و قەڵەمڕەوی تۆلۆنیەکانی لە میسر نەهێشت و گێڕایەوە بۆ سەر پایتەختی دەوڵەت.

موکتەفی زۆر نەژیا و دوای شەش ساڵ لە خیلافەتیەکەی مرد و دوای ئەو خیلافەت گەڕایەوە بۆ ئەو لاوازییەی پێشتر، ئەمەش بەهۆی ناکۆکی خێزانی ناو بنەماڵەی عەبباسی و زۆربونی بزووتنەوە جیاخوازییەکان، ئەمە دەرفەتی بۆ تورکەکان دەرەخساند تا هێزی خۆیان بگێڕنەوە و لە هەڵبژاردنی چەند خەلیفەیەکی لاوازدا بۆ بەردەوام بونی قەڵەمڕەوی خۆیان گەڕانەوە سەر ڕێبازی پێشوویان، ئەوان بە کاندید کردنی عەبدوڵڵای کوڕی موعتەز بۆ پایەی خیلافەت ڕازی نەبون، چونکە عەبدوڵڵا کەسێکی لێهاتوو بو، بەڵکوو ئەبولفەزل جەعفەری کوڕی موعتەزدیان هەڵبژارد کە تەمەنی سیانزە ساڵ بو و کردیان بە خەلیفە و نازناوی (موقتەدیر)یان لێنا[٢].

موقتەدیر(٢٩٥ــ٣٢٠ك/٩٠٨ــ٩٣٢ن) لە ئاستی ئەو ڕووداوە سەختانەدا نەبو کە گەمارۆیان دا بو، کاتێ گەیشتە تەمەنی گەنجی ڕوویکردە ئارەزووکانی خۆی و کاروباری دەوڵەتی دایە دەست موئنیسی تورکی. لە سەردەمی ئەمدا دیاردەی دەست تێوەردانی ئافرەتان لە کاروباری دەوڵەتدا دەرکەوت و لە ڕۆژانی ئەمدا ئاژاوە و فیتنە لە ناوخۆ و دەرەوەدا بڵابویەوە، لەبەر خراپی باری ناخۆی و گەندەڵی دەسەڵات پیاوانی سوپا لێی هەستان و لەسەر کورسی دەسەڵات لایانبرد و بەیعەتیان بە عەبدوڵڵای کوڕی موعتەزدا و نازناوی (ڕازی)یان لێنا[٣].

---

١ـ الطبري: ج١٠ ص٨٧.

٢ـ هەمان سەرچاوە: ص١٣٩.

٣ـ الطبري: ج١٠ ص١٤١، المسعودي: مروج الذهب: ج٤ ص٢١٤.

هەندێ لەو سەرکردە تورکانەی هێشتا هۆگری و پشتیوانییان بۆ موقتەدر هەبو وەك موئنیسولخادم و موئنیسولخازن و غوریبی خاڵی موقتەدر، توانییان موقتەدر بگێڕنەوە بۆ سەر دەسەڵات و عەبدوڵڵای کوڕی موعتەزیان خستە بەندیخانە [1].

بارودۆخەکە وەك خۆی گەڕایەوە بۆ پشێوی و زێدەڕۆیی لە ماڵ و سامان لە لایەن دەربار و خزمەتگوزارانەوە و دەسەڵاتی ئافرەتانیش زیادیکرد، سوپا سکاڵای ئەو بارودۆخەیان هەبو و ترس و بیم لەنێوان خەلیفەو موئنیسولخادمدا دروست بو و بەکوشتنی خەلیفە لە(٢٨ی شەوالی ساڵی٣٢٠ك/ تشرینی دووەمی ساڵی٩٣٢ز)دا و بەیعەتدان بە موحەممەدی کوڕی موعتەزد بە خیلافەت کە نازناوی (قاهیر)یان لێنا، کۆتایی پێهات [2].

خیلافەتی کورتی قاهیر (٣٢٠ــ٣٢٢ك/٩٣٢ــ٩٣٤ز) لە خیلافەتەکی موقتەدیر چاکتر نەبو، بەڵکو ئاژاوە گێڕی سەربازان بەردەوام بو و جارێکی تر پایەی خیلافەت بو بە ئامانجێك بۆ (أزدراء) موئنیسولخادم هەوڵیدا لەگەڵ وەزیر ئیبن موقلەدا ڕێکبکەوێت تا لە دەسەڵاتی خەلیفە دەربچن، بەڵام قاهیر کە سەرکردە تورکەکانی بە دوژمنی دەوڵەتەکەی دەزانی، توانی ئەو سەرکردە تورکییە لە ناو ببات [3]. لەگەڵ هێز و توندی قاهیردا، بەڵام تورکەکان لە کۆتاییدا توانیان بیگرن و لەسەر خیلافەت لایانبرد و هەردوو چاویان هەڵکۆڵی، پێشتر هیچ خەلیفەیەك چاوی هەڵنەکۆڵرا بو، دواتر بەیعەتیان بە خەلیفە ڕازی دا (٣٢٢ــ٣٢٩ك/ ٩٣٤ــ٩٤٠ز) [4].

---

١ـ إبن عمراني: ص١٢١ــ ١٢٢.

٢ـ المسعودي: ج٤ ص ٢١٤، بۆ درێژەی ئەو ڕووداوانە بگەڕێرەوە بۆ: مسكويه: تجارب الأمم: ج١ ص٢٣٣ــ ٢٤١.

٣ـ السيوطي: تأريخ الخلفاء: ص٣٨٦.

٤ـ المسعودي: ج٤ ص٢٢١، ٢٣١، مسكويه: ج١ ص٢٨٦ــ ٢٩١، لەوێ درێژەیەکی چاکت دەست دەکەوێت.

## دەرکەوتنی نیزامی ئەمیری ئەمیران (٣٢٤ـ٣٣٤ك/٩٣٦ـ٩٤٦ز)

لە سەردەمی خەلیفە ڕازیدا گەشەسەندنێکی نوێ لە کاروباری دەسەڵاتدا ڕوویدا کاتێ هەوڵێکی تردرا تا خیلافەت ڕزگار بکرێت کە مەڵبەندی خیلافەت و وەزارەت و باری تورکەکانی لە خۆدەگرت، ئەم گەشەسەندنە بە دەرکەوتنی پایەی ئەمیری ئەمیران کۆتایی پێهات. ئەو کەسەی ئەو پایە وەردەگرێت دەسەڵاتی بەسەر بەشەکانی حوکمدا هەیە و سەلاحیاتی لە سەر باج و کارگێری هەیە و هەژموونی خۆی بەسەر خیلافەتدا دەچەسپێنێت تا ئاستێ خەلیفە تەنها هێمایەکە و بەس و سەلاحیاتی کرداری لە پەیڕەوی دەسەڵاتدا نەما و ململانێی نێوان خیلافەت و تورکەکان کە بەشێکی گەورەی سەردەمی عەبباسی دووەمی سەرقاڵکردبو، وەستا.

ئەم پایە لە ساڵی (٣٢٤ك/٩٣٦ن) دا لە سەر حیسابی پایەی وەزارەت دەرکەوت، ڕازی لەکارگێری کاروباری دەوڵەتەکەیدا پشتی بەهەندێ وەزیر بەست،کەلاواز بون و نەیاندەتوانی کاروباری وەزارەت بە چاکی ڕاپەڕێنن و ئەو قەڵەمڕەوەی هەیانبو لە دەستیاندا تا ئەوەی بەرەو ڕووی لێدان و دەستبەسەر داگرتن بونەوە. لە لایەکی تریشەوە بەهۆی ناکۆکی و پەرشوبلاوی نێوان خۆیان و ڕکەبەری لەسەر مەرکەزی دەستبەرداگرتن و بڕیاردان و بلاوبونەوەی حەسوودی و ڕژدی لە نێوان سەرکردەکانیاندا قەڵەمڕەوی تورکەکانیش پاشەکشەی کرد.

لە ئەنجامی ئەو بارودۆخە ناجێگیرانەدا خیلافەت هەستی بەلاوازی وەزیرەکان و دەستەوسانی تورکەکان و چۆڵەوانی خەزێنە کرد، بۆیە ڕوویکردە فەرمانڕەوایانی ئیمارەتە (میرنشینە) نزیکەکانی عێراق تا ڕزگاربون لەو بارەی گەیشتۆتە ئاستی مەترسی داڕمان پشتیان پێببەستێت. بۆیە خەلیفە ڕازی موحەممەدی کوڕی ڕائقی ئەمیری واسیت و بەسرەی بانگکرد و کاروبارەکانی دایە دەست و هەموو دەسەڵاتەکانی دەوڵەتی دایە دەست و نازناوی ئەمیری ئەمیرانی لێنا[1]، ئەو پایە

---

١ـ مسكويه: ج١ ص٣٥١ـ ٣٥٢، إبن عمراني: سەرچاوەی پێشوو ص١٢٨.

ئاماژە بە گواستنەوەی هەموو دەسەڵاتێکی خەلیفە بۆ سەرکردەیەك کە سیفەتی سەرکردایەتی مەدەنی و سەرکردایەتی سەربازی تێدابێت [1].

ئیبنولئەثیر وەسفی بارودۆخی دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی لە سەردەمی ڕازی دا دەکات و دەڵێت: (...خەلیفە تەنها بەغداد و دەوروبەری بەغدادی بۆ مابویەوە و دەسەڵاتی هەموو ناوچەکان لە دەست ئیبن ڕائیقدا بو و خەلیفە دەسەڵاتی نەبو، ناوچەکانی تریش، بەسرە لە دەست ئیبن ڕائیقدا بو، خوزستان لە دەست بەریدی، فارس لە دەستی عیمادودەولەی کوڕی بوەیهدا بو، کرمان لە دەستی ئەبوعەلی موحەممەدی کوڕی ئیلیاس، ڕەی و ئەسفەهان و ناوچەی شاخ لە دەستی ڕوکنودەولەی کوڕی بوەیهدا بو، (یەد) و (شمکیر)ی برای مرداویج لە سەر ململانێیان هەبو، موسل و دیاربەکر و موزر و ڕەبیعە لە دەست حەمدانیەکاندا بو، میسر و شام لە دەست موحەممەدی کوڕی کوڕی وغوج، مەغریب و ئەفریقیا لە دەست ئەبولقاسم قائیم بیئەمریللای کوڕی مەهدی عەلەویدا بو و نازناوی ئەمیری باوەڕدارانی لە خۆنابو، ئەندەلوسیش لە دەست عەبدوڕەحمانی کوڕی موحەممەدی ئومەوی دا بو کە نازناوی ناسری لێنرا بو، خوراسان و ئەودیو ڕووباریش لە دەست نەسری کوڕی ئەحمەدی سامانی و تەبەسەرستان و جورجان لە دەستی دەیلەمە و بەحرین و یەمامە لە دەست ئەبوتاهیری قەرمەتیدا بو) [2].

قەڵەمڕەوی ئیبن ڕائیق لە ساڵی (٣٢٦ك/٩٣٨ن)دا بە هۆی ئەوەی ئەمیرەکان ڕکەبەرییان لەگەڵ دەکرد لاواز بو، جا ئەبوعەبدوڵڵای بەریدی فەرمانڕەوای ئەهواز لەگەڵیدا جەنگا، یەکێك لە سەرکردەکانیشی لە دەسەڵاتی دەرچوو کە بە (بجکم) بانگ دەکرا و لە ساڵی (٣٢٧ك/٩٣٩ن)دا چوویە بەغداد و دەستی بەسەر کاروبار داگرت و ئەمیری ئەمیرانی وەرگرت ئیبن ڕائیقیش ڕای کرد بۆ وڵاتی شام [3]. بجکم

---

١ـ مسکویه: هتمان سترضاوة ص٣٥١، ئەم سەلاحیاتی ئەمیری ئەمیران دەژمێرێت. محمود الشریف: ص٣٦٨.

٢ـ إبن أثیر: ج٦ ص٢٥٤ـ ٢٥٥.

٣ـ مسکویه: ج١ ص٣٩٣ـ ٣٩٦، إبن عمرانی، ص١٣٠.

ماوەی سێ ساڵ لەو پایەدا مایەوە و باری گشتی گەیشتە ئاستێکی ترسناکی پشێوی و داڕمان [١]. لە ساڵی (٣٢٩ك/٩٤١ن)دا بجکم بە دەستی یەکێك لە تورکەکان کوژرا [٢].

نزیکەی چوار مانگ لە پێش کوژرانی بجکمدا خەلیفە ڕازی لە بەغداد لە تەمەنی سی و دوو ساڵیدا مرد، ماوەی خیلافەتەکەی نزیکەی دوو ساڵ بو [٣]. جا ناودارانی دەوڵەت و ئەندامانی بنەماڵەی عەبباسی ڕاوێژیان لە سەر ئەوە کرد کە کێ شیاوی خیلافەت بێت،ئینجا جەعفەری کوڕی موقتەدیریان بۆ پایەی خیلافەت کاندید کرد و لە بیستی مانگی ڕەبیعیولئەوەلی ساڵی ٣٢٩ك/مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ٩٤٠ن)دا بەیعەتیان پێدا و نازناوی (موتتەقی)یان لێنا [٤].

موتتەقی (٣٢٩ــ٣٣٣ك/٩٤٠ــ٩٤٤ن) تەنها گەمەیەك بو بە دەست ئەو سەرکردانەی لە سەر دەسەڵات ڕکەبەرییانە بە تایبەت ئەبوعەبدڵڵای بەریدی و ئیبن ڕائیق و حەمدانیەکان. لە سەردەمی ئەودا سەلاحیاتی پایەی ئەمیری ئەمیران گوازرایەوە بۆ دەستی بەریدی کە لە دوای کوژرانی بجکم دەرکەوت.بەڵام خەلیفە بەڕەسمی ئەو پایەی نەدایە دەست، ئەویش لەبەر هەڵوێستە هەڵگەڕاوەیی و کوودەتاییەکانی، بەڵکوو تەنها کردی بە وەزیر، [٥] بەڵام سەرکردایەتی سوپای لە پاڵ پایە مەدەنیەکەیدا هەبو، بەمە دەسەڵاتی ئەمیری ئەمیرانی هەبو.

ئەو نەیتوانی پێویستی و داواکارییە زیاد بوەکانی سەربازان بەدیبهێنێت، بۆیە کەوتە بەر پیلان و دەسکیسەیان و بارودۆخ لە بەغداد شێوا و ئەویش ناچار بو بەغداد بەجێبهێڵێت و گەڕایەوە بۆ بەسرە [٦] و ئیبن ڕائیق بۆ جاری دووەم پایەی

---

١ـ الصولی وەسفی باری گشتی بەغداد لە ماوەی دەسەڵاتی بجکم دا باس دەکات: أخبار الرضي بالله والمتقي بالله: ص١٠٦.

٢ـ مسكويه: ج٢ ص٩ــ ١٠، إبن العراني: ص١٣٣ــ ١٣٤.

٣ـ إبن الأثير: ج٦ ص٢٧٦.

٤ـ هەمان سەرچاوە: ص٢٢٧ــ ٢٧٨.

٥ـ مسكويه: ج٢ ص٢٣.

٦ـ إبن عمراني: ص١٣٤.

ئەمیری ئەمیرانی وەرگرتەوە[١]، لە دوای ئەوەی لە وڵاتی شامدا بو بانگکراو ئەویش لەگەڵ بەریدیدا ڕێکەوت و پایەی وەزارەتی پێدا[٢]، ماوەیەك بارەکە بەو جۆرە بو، پاشان ئەو دوانە ناکۆکی کەوتە نێوانیان و ئیبن ڕائیق بەریدی لە پایەکەی لابرد، ئەویش سوپاکانی خۆی کۆکردەوە و هێرشی کردە سەر بەغداد و خەیفە و ئیبن ڕائیق ناچار بو ڕابکەن و پەنایان بۆ لای حەمدانیەکان لە موسڵ برد و بەریدی دەستی گرت بەسەر ئەمیری ئەمیراندا و بۆ جاری دووەم چوویە بەغداد[٣].

بەڵام بەریدی و کۆمەڵەکەی لەبەر ئەوەی کەوتبونە تاڵان و بڕی نەیانتوانی خۆشەویستی خەڵك بۆ لای خۆیان ڕابکێشن، لە لایەکی ترەوە خەلیفە لە ساڵی(٣٣٠ك/٩٤٢ز) دا ناسردەولەی حەمدانی کردە ئەمیری ئەمیران و بە سوپایەکی چڕ و پڕەوە ناردی تا لەگەڵ بەریدیدا بجەنگێت، ئەویش ئەویش بەریدی لە بەغداد دەرکرد و خەلیفە لە هەمان ساڵدا گەڕایەوە بۆ بەغداد[٤]. لەو ڕووداوانەدا سەرکردەی تورکی توزون دەرکەوت و موتتەقی پۆلیسی بەغدادی دایە دەست، دواتر کردی بە ئەمیری ئەمیران[٥]، لەو کاتەدا حەمدانیەکان دەستیان بە سەر تواناکانی کاروباری بەغداد داگرتبو، بەڵام بەهۆی بەردەوامی ململانێ ناوخۆییەکانەوە باری گشتی باش نەبو[٦]، بۆیە ناچار بون بەغداد بەجێبهێڵن، بەتایبەت کە لە جەنگیان لەگەڵ توزوندا جەنگیان دۆڕاند، بەهاودەمی خەلیفە گەڕانەوە بۆ موسڵ[٧].

توزون بە بەهێزترین ئەو سەرکردانە دادەنرێت کە لە سەردەمی عەبباسی دووەمدا کاروباریان گرتبێتە دەست، ئەو پیاوە توانی لە بەرامبەر دوو ڕکەبەری

---

١ـ مسکویه: ج٢ ص٢٢.

٢ـ هەمان سەرچاوە: ص٢٣ـ ٢٥، إبن الأثیر: ج٦ ص٢٨٣ـ ٢٨٤.

٣ـ هەمان سەرچاوە: ص٢٥ـ ٢٧، ص٢٨٥.

٤ـ مسکویه: ص٢٨.

٥ـ هەمان سەرچاوە: ص٤٤.

٦ـ سەبارەت بە بارودۆخی بەغداد لەو ماوەیەدا بڕوانە: الصولي: ص ٢٣٤ـ ٢٣٧.

٧ـ السیوطي: ص٣٩٥ـ ٣٩٦.

بەهێزدا کە حەمدانییەکان و بەریدییەکان بون دەست بەسەر دەسەڵاتدا بگرێت، ترسی لە خەلیفە بۆ نزیکبونەوە لە ئەخشیدیەکان لە میسر هەبو، بۆیە فێڵی لێکرد تا جارێکی تر گەڕایەوە بۆ بەغداد، ئەویش بە ڕوخسار ملکەچی خۆی بۆ نیشاندا و بەنهێنیش هەندێ هاوەڵی خۆی ڕاسپارد و خەلیفەیان گرت و ناچاریان کرد وازبهێنێت، پاشان هەردوو چاویان هەڵکۆڵی، ئەمەش لە (مانگی سەفەری ساڵی ٣٣٣ك/مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ٩٤٤ن)دا بو، ماوەی بیست و پێنج ساڵیش کردیانە بەندیخانە تا لە ساڵی (٣٥٧/٩٦٨ن)دا مرد، تۆزون عەبدوڵڵای کوڕی موکتەفی وەك خەلیفە هەڵبژارد نازناوی موستەکفی لێنا [١].

خیلافەتی موستەکفی (٣٣٣ـ٣٣٤/٩٤٤ـ٩٤٦ن) زۆری نەخایاند ساڵێك و چوار مانگ فەرمانڕەوایی کرد و لەو ماوەیەدا دەسەڵات تەنها لە دەست تۆزوندا بو، پاشان ئیبن شێرزاد شوێنی گرتەوە و لە پایەی ئەمیری ئەمیراندا مایەوە تا موعیزودەولەی کوڕی بویە دەستی بەسەر بەغداد داگرت و پایەی ئەمیری ئەمیرانی هەڵوەشاندەوە [٢].

لە ڕاستیدا دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی سوودی لەو نیزامە وەرنەگرت کە ڕازی داینا بۆ ئەوەی خیلافەت سەرپێبخاتەوە، بەڵکو باری خیلافەتی خراپتر کرد، هەرکەسێ بڕوانێتە سەردەمی ڕازی و موتتەقی و موستەکفی دەبینێت زنجیرەیەك ناکۆکی نەبڕاوەی نێوان پیاوانی دەوڵەتی عەبباسی بوە کە هەریەکەیان ویستوویەتی بە تەنها دەسەڵات بۆ خۆی بێت و پایەی ئەمیری ئەمیران بگرێتە دەست [٣].

---

١ـ إبن عمراني: ص١٤١.

٢ـ مسكويه: ج٢ ص٨١ـ ٨٢، ٨٤ـ ٨٥.

٣ـ حسن: ج٣ ص٣٥.

## بزووتنەوەی زەنج[1] ( ٢٥٥ــ٢٧٠ك/٨٦٩ــ٨٨٣ز )

*** سروشت و ئامانجی بزووتنەوەکە:**

بێگومان بزووتنەوەی زەنج کە لە ساڵی ٢٥٥کۆچیدا سەریهەڵدا و دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی داتەپاند لە پێش ئەوەی لە ناو بچێت، پێویست بە وریایی دەکات و لێکۆڵەران بانگ دەکات تا لە ڕوانگەی لێکۆڵینەوە لە سروشت و ئانانج و پاڵنەرەکانی بەدەمەوە چووینەوە چارەسەری بکەن.

بۆ ئەوەی سروشتی بزووتنەوەکە بزنین، دەبێت ئەو دەستە و ڕەگەزانە بزانین کە پاڵپشتییان کرد یان تیایدا بەشدار بون.

لە ڕاستیدا کۆلەکەی بزووتنەوەکە لە سەرەتاوە هەندێ لە عەرەبە بەمەرگخواز مەهالبن و هەمەدانی و جگە لەوانیش لەخۆدەگرێت، ئەو دەستانەیش تیایدا بەشدارییان کرد، جۆراوجۆرن، زەنج، خەڵکی لادێکان، عەرەبە لاوازەکان، چەند خێڵێکی عەرەبی دژ بە دەسەڵات بون.

سەبارەت بەو کەسایەتییەی سەرکردایەتی ئەو کۆمەڵەی دەکرد، عەلی کوڕی موحەممەد بو کە لە بنەڕەتدا فارس بو[2]. لە ڕاستیدا ئەمەش کەسایەتییەکی جێ سەرنجە و لێکۆلەر لە ناسینی ڕەچەڵەکیدا تووشی سەختی و تاڕەحەتیەکی زۆر دەبێت، ئەمەش لەبەر گۆران و هەڵگەڕانەوە خێراکانی بەپێی ئەو بارەی پیایدا تێپەڕ دەبو، ئەو کەسێکی چاچنۆك و دنیا ویست و دوور لە زوهد بوە، چونکە لە تالان و بڕیدا بەشداری کردبو.

ژیانیشی نائاسایی و ناسروشتی بو، سەرەتا لە کۆشکدا وەك شاعیری خەلیفە لە سامەراء دەژیا، پاشان هەوڵیدا لە بەحرین دژ بە دەسەڵات بزووتنەوەیەك ئەنجامبدات بەڵکو بگاتە دەسەڵات بەڵام نەیتوانی ئامانجەکەی بە دیبهێنێت، بۆیە

---

١ـ زەنج و زینج نەوەیەکی سودانن، بەڵام زونج یەکێکە لە گوندەکانی نەیسابور. بڕوانە: الحموی، یاقوت: معجم البلدان: ج١ ص١٥٣

٢ـ لە گوندی (ورزنین)ی یەکێك لە گوندەکانی (ڕەی) نزیك تهرانی ئەمڕۆیە.

ڕێبازێکی نوێی گرتەبەر و وەك سەرکردەیەکی ئایینی و خۆ بە پێغەمبەر زان خۆی نیشاندا و بانگەشەی ئەوەی دەکرد ئەوەی عەلەویەکانە[1] بەو نیازەی سۆز و پاڵپشتی خەڵکی بۆ شیعە بەرهەم بێنێت، شوێنکەوتەکانی لای خۆیان ئەویان لە شوێنی پێغەمبەر دادەنا تا خەراجیان پێدەدا [2]. ژمارەیەکی زۆر ناو بەحرەین ڕقیان لێ بو، ئەمە پاڵی پێوەنا تا بەحرەین بەجێبهێڵێت و بەرەو بیابان بچێت تا دەشتەکیەکان بەلای خۆیدا ڕابکێشێت، ئەو لەوێ بانگەشەی ئەوەی دەکرد ڕەچەڵەکی شیعی هەیە و یەحیای کوڕی عومەری ئەبولحەسەنە، بۆیە هەندێ لە دەشتەکیەکان لە دەوری کۆبونەوە و ئەویش بۆ گێڕانەوی دەسەڵاتی بەحرەین بۆ خۆی ئەوانی بەهەند وەرگرت، بەڵام شکا و ڕایکرد بۆ بەسرە [3].

لەو ماوە کەمەی لە بەسرە بو لەسەر باری ناوخۆی سیاسی و کۆمەڵایەتی بەسرە وەستا چونکە کۆمەڵگەی بەسرە لە ناخۆیدا دابەش بو بو[4]، ئەو هەوڵیدا ئەو ناکۆکیانە لە بەرژەوەندی خۆیدا بقۆزێتەوە بەڵام سەرکەوتوو نەبو، لە هەمان کاتدا پێی وابو دەتوانێت ژانی ئەو کۆیلانەی لە بەشەکان ئیشیان دەکرد بۆ بەدیهێنانی خواستەکانی بەهەند وەربگرێت، بەڵام لەوێ دەرکراو چوو بۆ بەغداد [5].

لە بەغداد ڕەچەڵەکێکی نوێی عەلەوی لە خۆی ناوخۆی دایە پاڵ ئەحمەدی کوڕی عیسای کوڕی زەید[6]، پاشان بارگرژی پایتەختی خیلافەتی بەهەند وەرگرت و هەوڵیدا دەسەڵات وەربگرێت، بەڵام لەبەر ئەوەی تورکەکان دەستیان بەسەر

---

١ـ بانگەشەی ئەوەی دەکرد عەلی کوڕی موحەممەدی کوڕی فەزڵی کوڕی حەسەنی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسی کوڕی عەلی کوڕی ئەبوتالیبە.

٢ـ الطبري: ج٩ ص٤١٠.

٣ـ لە ناوچەیەك بە (ردم) ناسراوە شکستی خوارد، لە بارەی ئەو ڕووداوانەوە بڕوانە: الطبري: ج٩ ص٤١٢.

٤ـ ئەوك کات بەسرە بە دەست دابەشبون لە نێوان دوو دەستەی نەیار بیلالی و سەعدیدا دابەش بو بو، هەمان سەرچاوە: ص٤١١.

٥ـ هەمان سەرچاوە: ص٤١٢.

٦ـ هەمان سەرچاوە.

بارەکەدا زاڵ بو نەیتوانی ئەوە بکات، بۆیە لە ساڵی (٢٥٥ك/٨٦٩ن)دا گوڕایەوە بۆ بەسرە تا سەرکردایەتی بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕی بکات و بانگەشەی ئەوەی دەکرد خوای گەورە ناردوویەتی تاکۆیلەکان لەوسەختی و خراپییەی ژیانیان ئازاد و ڕزگار بکات. هەروەك بانگەشەی زانینی غەیب و پێغەمبەرایەتیشی دەکرد[١]. لە ڕاستیدا بیرۆکەی مەهدی چاوەڕوانکراو لە هەموو قۆناغەکانی ژیانی سیاسی دا لەگەڵ عەلی کوڕی موحەممەد دا بو، ئەویش بە زیرەکی قۆرخی کرد و بانگەشەی مەهدی بونی کرد، ئەمەش دەستدان بو لە خاڵێکی حەساسی لە قەڵەمڕەوی کۆمەڵێك لەو عەلەوییانەی جیابونەوە و هیوای دەرکەوتنی مەهدی ڕزگارکەریان دەکرد تا سەختیان لەسەر لاببات و لە سەختیەکانی ژیانیان ئازادیان بکات[٢]. زۆر جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە بنەڕەتێکی قووڵی هەیە لە سەر دراوەکانی ئەوەی دەنووسی و ناوی خۆی نا (مەهدی عەلی کوڕی موحەممەد)ی ڕزگارکەر.

عەلی کوڕی موحەممد لە قۆناغێکی ژیانیدا مەزهەبی خەواریجی نیشاندا، چونکە ئەمە وای دەکرد ڕێبازەکەی لەگەڵ خواستی هاوەڵە شوریەکانیدا بگونجێت، بۆیە لە پێناو دادپەروەری کۆمەڵایەتی و یەکسانیدا دەجەنگا [٣]. دروشمەکانیشی لە سەر ئاڵاکەی بە دوو ڕەنگی سەوز و سوور دەنووسی ڕەنگی عەلەویەکان و خەواریجەکان بون.

بیر و هزری عەلی کوڕی موحەممەد لە مەڕ خیلافەت لەگەڵ چەمکی شیعەگەراییدا نەیدەکرا، چونکە ئەوەیان جەختی لەسەر میراتگیری دەکردەوە، دەی خەواریجش پێیان وایە دەبێت بەشوورابێت،ئەمە وایکرد عەرەبەکانی بەستاء و بەسرە و ئەهواز واسیت و ناوچەکانی دەوروبەری لێی دووربکەونەوە، هەروەك قەرمەتیش ئامادە نەبو لەبەر چەند هۆکارێکی ئایینی پەیوەندی پێوەبکات. توند و

---

١ـ الطبري: ج٩ ص٤١٢.

٢ـ علي، أحمد: ثورة الزنج و قائدها علي بن محمد ص٥٤.

٣ـ لە سەر ئاڵاکەی ئایەتی (١١)ی سورەتی تەوبە نووسرا بو کە لای خەواریجەکان گرنگە، لەسەر دراویش نووسیبوی. بڕوانە: علبی: ص٨٥، Muir: the caliphate: p ٥٤٥

ڕەقیشی بەرامبەر دوژمنەکانی وایکرد بو ببێتە خەواریجێکی توندڕەو و زیادەڕەو، وێڕای ئەمە وەك کەسێکی دڵنەرم هەڵوێستی لەگەڵ دیلەکانی جەنگدا دەکرد و بەڵێنی بە شوێنکەوتەکانی دا دواتر ماڵ و کۆیلەیان پێدەدات، ئەمەش واتە ژیانی زەنجەکان لەو ئاستەوە بگۆڕێت بۆ کەسانێك کە کۆیلەیان هەبێت [١].

شتێکی ڕوونە ئەم پێکەوە نەکرانە و جیاوازییەی ناو بیر و باوەڕەکەی وای لێدەکات هیچ شێوەیەکی بیر و باوەڕی نەبێت و بیکاتە بزووتنەوەیەکی چەکداری دژ بە نیزام، تەنها ئەوە و بەس، هەروەك وا لە سەرکردەکەشی دەکات پیاوێکی مەرگخواز بێت لە پێناو گەیشتن بە دەسەڵات [٢].

بێگومان خواستە سیاسیەکانی عەلی کوڕی موحەممەد کە ئامانجی دەستگرتن بەسەر دەسەڵاتدا هەبو بە پاڵنەری ڕاستی بزووتنەوەکەی دادەنرێت، ئەمە وایکرد تا ئاستێکی زۆر بەرتەسك بێتەوە و لە دەستەیەك لە زەنجەکاندا پەنگ بخواتەوە و بەرەبەرە دەستەکانی تر تیایدا بەشدارییان کردبو لێی دووربکەونەوە [٣].

## * پاڵنەرەکانی بەدەمەوەچوونی:

چەند پاڵنەرێکی جیاواز ئەو کۆمەڵە جیاوازانەی پاڵپێوەدەنا تا لە دەوری عەلی کوڕی موحەممەد کۆببنەوە، لەوانە:

- هەڕەشە لە حوکەتی مەرکەزی بکەن تا لە بازنەی سەختی و ناڕەحەتی بچنەدەرێ.
- لە ڕێگەی تاڵان و بڕییەوە دەستکەوتیان دەستبکەوێت.
- ڕزگار بون لە ئیشی قورس یان ناخۆشی و ناڕەحەتی ژیان [٤].

پاڵنەری وەڵامدانەوەی بەرفراوانی بزووتنەوەکە لە لایەن کۆیلەکانەوە لە سێ

---

١ـ عمر، فاروق: التأريخ الأسلامي و فكر القرن العشرين: ص٣٣٥.

٢ـ هەمان سەرچاوە.

٣ـ عمر: ص٣٣٥.

٤ـ هەمان سەرچاوە: ص٣٢٨.

هۆکاردا خۆی مۆڵداوە: سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی.

لە ڕووی پاڵنەری سیاسەوە[١] لە پێش بزووتنەوەی زەنج و لەگەڵیشیدا قەڵەمڕەوێك هەبو کە تورکەکان بەسەر خیلافەتدا پەیڕەویانکرد و بەکرێگیراوی لە ناویاندا زۆر بو چالاکیان لە دەستنیشان کردنی ئەو پێناوانەدا پەنگی خواردەوە کەوادەکەن لە دوژمن و ڕکەبەرەکانیان بدەن و تەنها دەسەڵاتیان بۆ بمێنێتەوە[٢]. ئەمە بویە هۆی زۆربونی پیلانی سیاسی و کوودەتای سەربازی و خیلافەت تەواو پەکی کەوت و خەلیفەکان لاواز کەتن و کارگێڕییان لە دەست نەما. لە ئەنجامی ناجێگیری باری سیاسیدا، بەرهەڵستکاران بەتایبەت شیعە بەهێزبون و قەڵەمڕەوی عەلەوی زیادی کرد و لە ناو خەڵکدا ڕەگی داکوتا، ئاڕاستەی بزووتنەوەی بەرهەڵستکاری هەر لە سەرەتا سەدەی سێ کۆچیەوە زیادی دەکرد و بزووتنەوەی بەرهەڵستکارەکانی دەسەڵاتی مەرکەزی زۆر بون و بزووتنەوە جیاخوازیەکانیش زیادیان کرد، ئەمە بەڵگەی ئەمە بو کە هەڵوەشانەوە لە مەرکەزیەتی خیلافەتدا لە گەشە کردندایە. کەشی گشتی سیاسی بۆ کەسانی مەرگخواز لە بار بو تا دەسەڵات ببەنەوە. لە کاتێکدا جەنگی نێوان حوکمەتی مەرکەزی بەرهەڵستکاری عەلەوی لەوپەڕی توندیدا بو، هەروەها چەند فەرمانڕەوایەکیش لە چەند ویلایەتێکدا دەرکەوتن کە تەنانەت بە ناویش دانیان بە دەسەڵاتی خیلافەتدانەدەنا پەنای ئەو بەرهەڵستکارانەیان دەدا ئەمە لە پاڵ ململانێی شاراوەی نێوان دەربەگ و کۆیلەکان، ئەمانە دەیان توانی لە بزووتنەوەکەی عەلی کوڕی موحەممەددا کە نیازی گرتنە دەستی دەسەڵاتی هەبو هەناسەیەك هەڵبکێشن و هەوڵی خۆیان بدەن.

لە ڕووی پاڵنەری ئابوریشەوە[٣] دوو دیاردە بەدی دەکەین، دیاردەی باری دڵڕوماوی ئابوری، و دیاردەی پێکهاتەی چینایەتی کۆمەڵگەی عەبباسی.

سەبارەت بە دیاردەی یەکەم، کاروبار و بواری جێ سەرنجی نیوەی یەکەمی سەدەی سێیەمی کۆچی ئەوە بو کە دارایی دەوڵەت بەهۆی خەرجی زیادەی

---

١ـ علی: ص١٩٨ـ ٢٠١.

٢ـ عمر: ص٣٣٣.

٣ـ بگەڕێرەوە بۆ: علی: ص٨٩ـ ٩٩.

خەلیفە سەرکردە تورکەکان بەردەوام لە پاشەکشە و دواکەوتن دا بو. دیمەنی دواکەوتن و دارمانی دارایی دەوڵەت ئەوەیە کە نیزامی پەیوەندی یان زامنی زاڵ بێت [١]. ئەوەی زیاتر بارووددۆخی دارایی خراپتر کرد، ئەوە بو بەیتولمالی موسڵمانان لە خەزێنەی تایبەتی خەلیفە جیاکرایەوە و قەڵەمڕەوی تورکەکانیش لەگەڵ ئەوەی زیاتر دەبو دەستیان وەردەدایە بەیتولمال و خەلیفەکانیش خۆیان یەك لا کردبویەوە. بۆ گەشەدان بە سەرچاوەکانی خەزێنەی تایبەتی خۆیان سەبارەت بە دیاردەی دووەم [٢]، کۆمەڵگەی عەبباسی لە سەدەی سێیەمی کۆچیدا لە سێ چینی کۆمەڵایەتی پێکدەهات کە بریتین:

١ـ چینی ئیقتاعیەکان کە لە بنەماڵەی دەسەڵاتدار و سەرکردە تورك و وەزیرە دەوڵەمەندەکان و خاوەن پایەکان پێکدەهات ئەندامانی ئەو چینە زەوییان هەبو و وەك سەرچاوەیەك بۆ سەروەت و سامانیان پشتیان بە کشتوکاڵ دەبەست، بارووددۆخی ئابوریشیان بە ئاراستەی فروان بون و چڕوپڕی گەشەسەندنێکی گەورەی بەخۆیەوە دی، ئەمە پێویستی بە زیاد بونی ژماری کۆیلە هەبو تا لەو کێڵگانەدا ئیش بکەن بەتایبەت لە باشووری عێراقدا.

٢ـ چینی بازرگانەکان

٣ـ چینی ئیشکەری گشتی.

ناوەڕاستەکانی سەدەی سێیەمی کۆچی زیاد بونی رۆڵی ئیقاتی بەخۆیەوە دی [٣]، لە دەستدانی بەسرەیش کەزەنجەکان ئیشیان لە زەوی مردووکاندا دەکرد و دەبو چاکسازیان بکەن ئەمەش پێویستی بە پشت بەستنی زیاتر بەو کۆیلانە هەبو کە لە

---

١ـ لەوانە تاهیریەکان لەو کاتەدا خەراجی خوراسان و ناوچەکانی سەر بە ئەوێیان لەسەر بو.

٢ـ ئیسلام بە لایەنی کەمەوە بەشێوەی نەزەریش دابەش بوێکی زنجیرەیی کۆمەڵایەتی نیە تەنها لە چوار پێوەی ئەو ئەرکانەی خەڵك لە کۆمەڵگەدا بە جێدەگەێنن. هەروەك چەمکی چینایەتی لە سەر دەربڕینی مرۆڤ لە بنەڕەتێکی بەرز و چاکەوە نایەت کە مافە میرایەتیەکان بپارێزێت، بەڵکو ئەهلیەتی شەرعی پێوەری بنەڕەتی دەست نیشانکردنی چینەکانە. سعد، فهمی: عامة في بغداد في القرنين الثالث و الرابع للهجرة: ص١٢٤ـ ١٢٥.

٣ـ مسکویه: ج٢ ص٩٦.

ڕۆژهەڵاتی ئەفریقیا دەهاتن، بەوەی دەستی نایانی ئیشکەرن و بنیادێکی بەهێزیان هەیە کە بۆ کارکردن لەو جۆرە زەوییە خۆێییانەدا لە باران [١]. ئەمەش لەگەڵ زیاد بونیڕۆڵی بازرگانی دابو،بازرگانەکان بەنرخێکی گران بەها ئەو کۆیلانەیان دەکڕی و دەیان فرۆشتن بەو خاوەن زەوییانەی بەسرە کە لەو ناوچانەدا کۆیان دەکردنەوە.

لەگەڵ تێپەڕبونی سەردەمدا کەلێنی نێوان ئەوان و نێوانی چینی ئیقتاعی فراوان بو، نەگونجان و جیاوازی کۆمەڵایەتی گەیشتە کۆتا بازنەی خۆی، ئەمە پاڵنەرێك بو تا بچن بەدەم ئەو بانگەوازی شۆرشەی کە عەلی کوڕی موحەممەد ئەنجامی دا.

لە ڕووی پاڵنەری کۆمەڵایەتیەوە [٢] ئەو دەستە کۆیلانە لە باری ژیانێکی سەخت و خراپدا دەژیان و دەبو لە گەرمی ووشکی زەوییەکاندا ئیش بکەن و شۆرەکاتی زەوییەکان لاببەن و دواتر لەڕێگەی ئاژەلەوە خۆێیەکە بگوازنەوەو تا چارە بکرێت و بفرۆشێت، ئەمە لە بەرامبەر یەك ژەم ناندا کە لە جۆ و ئاردەساوەر و خورما پێکدەهات [٣] تەنها ئەوەندی بەشی برسی نەبون بکات، هەروەك لە چەند چادر نشینێکدا کە مەرجی گشتی تەندروستیان تێدا نەبو کۆدەکرانەوە بەمەیش بەرەو ڕووی نەخۆشی لە ناو بەردەبونەوە وەك بەرەو ڕووی فشاری چەند هۆکارێکی دەروونی سەخت دەبونەوە بە جۆرێك ئەوانە بێ هاوسەر بون یان خێزاندار بون و لە ماڵ و منداڵیان دوور بون ئەو بارە نائاساییە کۆمەڵایەتیانە ئەو کۆیلانەی هاندا تا بچن بەدەم بانگەوازەکەی عەلی کوڕی موحەممەدەوە کە بەڵێنی پێدان بەرەو ئازادی سەرکردایەتیان بکات و ماڵ و سامان و زەوییان پێبدات تا کۆتایی دڵسۆزیان بێت و جەختی لەسەر خراپی نارەحەتی ژیانیان دەرکردەوە هیوای داهاتوویەکی ڕازاوە و پڕشنگدار و ماڵ و خانووی حەسانەوەی پێدەدان تا بچنە ڕیزەکانیەوە.

---

١- ووشەی سپاخ بۆ چینەکی خۆێ بەکاردێت کە لە ئاوی کەنداوی عەرەبییەوە دەهات.

٢- بگەڕێرەوە بۆ: علبی: ص١٠٣- ١٠٤.

٣- الطبري: ج٩ ص٤١٣، ناوچەی شەتولعەرەبیش زەوییەکی ووشکەلان بو کە چەندین هەڵکەند کە بەرەو ڕووی سەروخواری هەڵکشان و داکشان دەبو ئەوە جیادەکردەوە. لەگەڵ تێپەڕبونی سەردەمدا چینێکی خۆێ زۆربەی زەوییەکانی داپۆشی وای کرد کشتوکاڵ لەوێدا نەکرێت بەو جۆرە پیاوانی کاری بەسری دەستی ئیشکەری زەنگیان بۆ لابردنی ئەو چینە خۆێیە بەکارهێنا.

پێکدادن لەگەڵ دەسەڵاتدا- کۆتاییپێهاتنی بزووتنەوەکە

زەنجەکان بەردەوام لە دەوری عەلی کوڕی موحەممەددا کۆدەبونەوە، وە تا ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان هات، عەلی وتارێکی پێشکەش کردن و نوێژی بۆ کردن و دووبارە باسی ئەو ستەم و ناڕەحەتییەی بۆ کردن کە تووشیان بوە و هیوا و ئاواتی جوانی پێبەخشن و شاری (موختارە) کە بنیادی نابو کردی بەبنکەی هەنگاونانی [1].

بەڵگەی ئەوەی کە ئەو سەرکردەیەکی لێهاتووە، ئەوەیە کە شاڵاوەکانی بەلێهاتوویيەکی زۆر خێرایی هەواڵگری هەبو هەمیشە هەواڵی بزاوتی سوپای خیلافتی لە لا بو. ئەو سیاسەتە جەنگیەیش گرتبوە بەر و لەسەر دانانی بۆسە وەستا بو، وای لێکرد بەسەر هێزەکانی خەلیفە زاڵ بێت. بۆ لە ساڵی (٢٥٧ك/٨٧١ز)دا چووە بەسرە و دانیشتوانی شارەکەشی سووتاند [2].

لەو کاتەدا خیلافەت تەواو سەرقاڵی جەنگی یەعقوبی کوڕی لەیث سەففار بو، ئەمە دەرفەتی بە عەلی کوڕی موحەممەد دا تا پەڵهاوێژی و فراوانخوازی و وێرانکاری بکات. جا لە ماوەی دە ساڵدا (٢٥٥-٢٦٥ك/٨٦٩-٨٧٩ز) دەستی بەشێکی فراوان داگرت کە لە نێوان ئەهواز و واسیت دا درێژ دەبویەوە وە هەڕەشەشی لە بەغداد دەکرد. لەو کاتە خەلیفە موعتەمەد ئەبوئەحمەد موفەق تەلعەی برای خۆی ڕاسپارد تا لەگەڵ زەنجەکاندا بجەنگێ ئەو سەرکردەیەش خۆی سەرکردایەتی چالاکیە سەربازیەکانی گرتە دەست و چی ئیمکانیاتی سیاسی و ئابوری و سەربازی هەبو لە پێناو سەرکەوتندا بەکاریهێنا، ئینجا بۆ لاوازکردنی توانای زەنجەکان گەمارۆی ئابوری خستە سەریان و شمەك و فریاگوزاریەکانی سوتاندن و ڕێگەی نەدا ئەو فریاگوزاری و دەستگرۆیەیان پێ بگات کە دەشتەکییەکان پێشکەشیان دەکردن بەمە برسێتی دای گرتن و هێزیان داڕما و ژمارەیەکی زۆریان خۆیان بەدەست دا، لە ڕووی پێکدادانی سەربازیشەوە، موفەق

---

١- الطبري: ج٩ ص٤١٤- ٤١٥: حسن: ج٣ ص٢١١، موختارە کە دەکەوێتە سەر تۆکەندی ڕووباری ئەبولخسیب لە باشووری ڕۆژهەڵاتی بەسرە.

٢- اليعقوبي: ج٢ ص٤٧٤، الطبري: هەمان سەرچاوە ص٤٧١- ٤٧٢.

توانی لە ئەهواز دەریان بکات و دوووریان بخاتەوە و شاری موختارەیان بگرێت، پاشان یەك لە دوای یەك تووشی شکستی دەکردن و شارەکانی تریانی دەگرت تا لە ساڵی (٢٧٠ك/٨٨٣ز)دا بە تەواوەتی بە سەریاندا سەرکەوت و لە کاتی جەنگەکاندا عەلی کوڕی محەممەد کوژرا و هەرچی شوێنکەوتەی مابوونەوە خۆیان بە دەستەوەدا[1].

بە دامرکاندنەوەی شۆرشەکە پەردەی سەر ئەو بزووتنەوەیە کە جێپێی خیلافەتی عەبباسی لەق کردبو هەڵدرایەوە و هەوڵ و ماڵ و سامان گیان بەخشیەکی زۆری ویست و زیاتر لە چوارده ساڵی خایاند (٢٥٥ـ٢٧٠ك/٨٦٩ـ٨٨٣ز).

## پێوانەکردنی بزووتنەوەی زەنج:

لە ڕستیدا بزووتنەوەی زەنج لە واقعی ئازار و چەوساندنەوەی کۆمەڵایەتی و ئابوری نێو وشکانی و دەشتاییەکانی بەسرەوە هەڵقوڵا، سەرەتاکەیشی سەرکەوتوو بو و ئامانج و کردارەکانی تێکەڵاوی یەك بون. بەڵام ئەو دیدە پەشێوەییەی گرتەبەر کاتێ لەو پەڕی بەرنگاربونەوەیدا بو، ئەمە بویە هۆی ئەوەی دید و مۆرکە کۆمەڵایەتیەکانی کەم بکەن، ئەو دیدە هەژار بونی بزووتنەوەکەی بەچەند بەرنامەیەکی شۆرشگێری تا بتوانێ خواست و ئامانجی ئەنجامدەرانی نیشان بدات و بەدیبهێنێت پەیوەندی نێوان سەرکردە و شوێنکەوتوان ڕوونبکاتەوە زیاتر کرد، هەروەك تێبینی ئەوە دەکرێت کە ئەندامانی ئەو بزووتنەوەیە ئامانجیان تۆلەسەندنەوە بوە نەوەك چاکسازی، ئامانجیان کودەتای کۆمەڵایەتی بوە نەوەك سەرپێچ خستنەوە، سەرکردەکەیشی نەیتوانی خۆی لە باس و خواسی بیرۆکەی ڕێبەرایەتی قورەیشی ڕزگار بکات، وێرای ئەوەی هەوڵ و نەخشە شۆرشگێرییەکەی ناوچەیی و سنووردار بو و ئامانجی گشتگیر نەبو، لێرەوە دەزانین عەلی کوڕی

---

[1] ـ الطبري: ج٩ ص٦٣١ـ ٦١٤ـ ٦١٥.

موحەممەد لە بە دەست خستنی چەند پارچەیەکی گەورەی کۆمەڵگەی عێراقیدا وەك جوتیاران و گەورە خاوەن مۆڵك و بازرگان و پیشەگەران و تەنانەت قەرمەتیەکاندا سەرکەوتوو نەبوە، بەڵام تەنها کۆیلە لاوازەکان هەبون هەرچەندە ژمارەیان زۆر بوە.

لەلایەکی ترەوە، خێرایی ڕووداوەکان و نەخشەی عەبباسیەکان بۆ لە ناو بردنی بزووتنەوەکە دەرفەتی بە سەرکردەکەی نەدا تا ڕیزەکانی هێزەکانی ڕێکبخات و بتوانێت کۆمەڵگەیەکی سەقامگیری خاوەن نیزامی تایبەت بنیاد بنێت، بۆیە ئاساییە ئەو بزووتنەوەیە مۆرکە مرۆیی و شۆرشگێرییەکەی خۆی لە دەست بدات تا بەرەو کۆتایی پێهاتنی حەتمی ببات، بەڵام ئەو بنکە شۆرشگێرییەی کە هەڵوەشایەوە و پەرشوبڵاوبویەوە توانی پاڵپشتێکی بنەڕەتی ئەوپاڵپشتانە پیکبهێنێت کە دواتر پاڵی بە بزووتنەوەی قەرمەتیوەنا تا دەربکەون[1].

**د ـ پەیوەندی لەگەڵ تاڵیبیەکاندا:**

* زەیدی: سەردەمی عەبباسی دووەم پڕبو لە چەندین بزووتنەوەی سیاسی و ئایینی و کە لە مێژووی ئەو سەردەمە و سەردەمەکانی دواتریشدا کاریگەری قووڵیان هەبو، جا شیعەکان چەند بزووتنەوەیەکیان دەست پێکرد کە بویە هۆی جیابونەوەی بەشێکی زۆری بەشەکانی دەوڵەت و بڵاوبونەوەی ڕێبازی شیعی، بە تایبەت ئیسماعیلیە و قەرمەتیەکان، هەوڵی ئیسماعیلیەکان بو بە بنەڕەت بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی فاتیمی لە وڵاتی مەغریب لە پاڵ دامەزراندنی دەوڵەتی عەلەوی زەیدی لە تەبەرستاندا.

لە سەردەمی متەوەکیلدا فشاری زۆر خرایە سەر شیعە بەگشتی، ئەو خەلیفەیە کەوتیبوویە ژێر کاریگەری ڕاو بۆچوونەکانی عبدوڵڵای کوڕی خاقانی وەزیری کە زۆر ڕقی لەو دەستە موسڵمانانە بو[2]، (مەبەستی شیعەکانە).

---

١ــ سەبارەت بە هۆکارەکانی شکستهێنانی بزووتنەوەی زەنج بگەڕێرەوە بۆ: علبی: ص١٤٥ــ ١٦٧.

٢ـ الأصفهاني: ص٤٧٨، ٤٩٠.

زەیدییەکان لە سەردەمی موستەعیندا چەند بزووتنەوەیەکی دژ بە دەسەڵاتی مەرکەزییان ئەنجامدا، دیارترینیان دەرچوونی یەحیای کوڕی عومەری کوڕی یەحیای کوڕی حوسەینی کوڕی زەید بو لە کوفە، ئەم لە دەسەڵات دەرچوونەی پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە چاککردنی بارە ئابورییەکانیەوە هەیە.[١]

یەحیا ژمارەیەك لە دەشتەکیەکان و کۆمەڵێك لە دانیشتوانی کووفەی لە دەوری خۆی کۆکردەوە و لە دوای هێرشکردنە سەر کووفە چوویە ناوی و تیایدا بانگەوازی بۆ ڕەزامەندی ئالوبەیتی موحەممەدﷺ دەکرد[٢]. بەڵام بزووتنەوەکەی سەرکەوتنی بۆ بەدەست نەهێنا و سەرکردەی عەبباسی حوسەینی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی موسعەب لەگەڵیدا پێکیدادا و بە سەریدا سەرکەوت و لە جەنگەکەدا یەحیا کوژرا [٣].

ئەو بزووتنەوە زەیدیەی ترکە شوێنەوارێکی بەجێهێشت، دەرچوونی حەسەنی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئیسماعیل بو لە ناوچەکانی تەبەرستان لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٢٥٠ك/ مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ٨٤٦ز)دا، هەڵوێستی خراپی والییە عەبباسیەکان لەو ناوچەیە دا هۆکاری هەرە دیاری دەرچوونی بو، ئەمە پاڵ بە دانیشتوانەوە نا تا بچنە کۆشی تالیبیەکان و بەیعتیان پێدا، هەروەك گەورەکانی دیلەم بەیعەتیان پێدا، ئەویش نازناوی (بانگەوازەکەی خەڵك بۆ حەق) یان (بانگەوازی گەورە)ی لە خۆی نا، لە ماوەی سێ ساڵدا توانی دەست بەسەر هەموو تەبەرستان و بەشێکی گرنگی دیلەم و ڕەی دابگرێت، تالیبیەکانیش لە حیجاز و شام و عێراقەوە کە هەواڵی ئەویان بیست بەرەو لای چوون و شانۆشکۆی ئەویش زیادیکرد.[٤]

*ئیسماعیلیە: لەو کاتەی بزووتنەوەی زەنج ئامادە سازی هەبو، بانگەوازی ئسماعیلی دەرکەوت کە مێژووی سەرهەڵدانی لەسەر شانۆی سیاسی دەگەڕێتەوە بۆ

---

١ـ إبن الأثير: ج٥ ص٣١٤.

٢ـ الأصفهاني: ص ٥٠٦.

٣ـ هەمان سەرچاوە: ص٥٠٧، ٥٠٩، إبن الأثير: ج٥ ص٣١٢.

٤ـ إقبال عباس: تأريخ إيران بعد الأسلام: ص٢٠ـ ٢١.

کۆتاییەکانی سەردەمی دەوڵەتی خیلافەتی ئومەوی کاتێك ژمارەیەکی زۆری زەیدیەکان دایانە پاڵ دەستەی ئیمامەوە لە پشتیوانانی جەعفەری سادق، لە دوای مردنی جەعفەر شیعەی ئیمامی بون بە دوو بەشەوە، چونکە لە بارەی چۆنیەتی دەست نیشانکردنی مافی میراتی دیاریکردنی ئیمامدا کە ئیمامیەی موسەوی بوون ڕاجیاوازییان هەبو، دواتر ناوی (دوانزە ئیمامی) لێنرا. شوێنکەوتووەکانی ئەمە بڕوایان بە پێشەوایەتی مووسای کازمی کوڕی جەعفەری سادق هەبو کە لای ئەوان پێشەوای حەوتەمە، ئیمامیەی ئیسماعیلیەیش بڕوایان بە پێشەوایەتی ئیسماعیلی کوڕی جەعفەری سادق هەبو کە گەورە کوڕی باوکی بو، لەگەڵ ئەوەی لە کاتی ژیانی باوکیدا مرد، بەڵام شوێنکەوتووەکانی پێشەوایەتیان گواستەوە بۆ موحەممەد مەستووری کوڕی کە لای ئەوان پێشەوای حەوتە. دواتر ناوی سەبعیە لەو دەستەی نرا تا لە دوانزە ئیمامەکان جیابکرێنەوە.[1]

لە ناودارترین پێشەوایانی ئیسماعیلی کە لە بڵاوکردنەوەی مەزهەبەکەدا ئیشیان دەکرد و سەرکردایەتی بانگەوازەکەیان دەکرد، مەیمونی قەداع[2] بو کە بنەڕەتەکانی

---

١ـ ئەو دابەش بونەی لە دوای مردنی سادق ڕوویدا بە گەورەترین دابەشبونی ناو ڕیزەکانی شیعە دادەنرێت، نەك تەنها لەبەر ئەوەی دەستەی ئیسماعیلیە تا ئەمرۆیش شوێنکەوتەی هەیە، بەڵکوو لەبەر ئەوەی توانی دەوڵەتێك دابمەزرێنێت کە لە گەورەترین دەوڵەتۆکەکانی سەردەمی عەبباسی دووەم بو، مەبەستم پێی دەوڵەتی فاتیمیە، مەترسی ئەو دابەش بونە تەنها بۆ ناکۆکی لەسەر ئیمامەت لە دوای جەعفەری سادق نیە، بەڵکوو دەرکەوتنی دەستەی ئیسماعیلیە بۆ چەندین هۆکار دەگەڕێتەوە کە تەنها بە تۆمەتبارکردنی ئیسماعیل بە مەی خواردنەوەیان مردنی لە ژیانی باوکی تەواو نابێت، ناکرێ دەرکەوتنی ئسماعیلیە لەگەڵ دامەوراندنی دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسیدا کە لە ژێر بانگەوازی شیابونی ئالوبەیت بۆ خیلافەت دامەزرا، جیابکەینەوە، پاشان عەبباسیەکان توانیان بەبێ تالیبیەکان دەسەڵات بگرنە دەستی خۆیان، سادق کە هاوسەردەمی ئەو گۆرانە بو و هەموو هیوایەکی تالیبیەکان بو پەنای بۆ دوورکەوتنەوە لە نەیارە سیاسیەکان دەبرد، ئیسماعیلیە پەیوەندییەکی بەتینی بەو نێوەندە توندڕەوانەوە هەبو کە دەستەیەکیان بە ناوی ئەوەوە داهێنا، جەعفەری سادق ئەوی ئەوی لە خۆی دوورخستبویەوە، بڕوانە: مسجي، أجمد محمود: نظرية الأمامه لدى الشيعة الأثنين عشرية: ص٣٨٠ـ ٣٨٣.

٢ـ مەیمەن قەداعی کوڕی دیسان: کەسێکی فارس بو، مەزهەبی فرە خودایی هەبو خۆی بە موسڵمان نیشان دەدا.

مەزهەبی ئیسماعیلی دانا و ڕێگەی بۆ عەبدوڵڵای کوڕی خۆش کرد کە لە سلمیە لە دەوروبەری حەمات لە وڵاتی شامدا نیشتە جێبون، بانگخوازەکانی لە ناوچە بارگرژی و پشێوەیەکاندا بڵاوبونەوە تا بێزاری هەندێ لەو خەڵکە لە کارگێری عەبباسی بەهەند وەربگرن بانگەوازەکە لە سێ یەکی کۆتایی سەدەی نۆیەمی زاینی لە وڵاتی یەمەن و عێرقدا ڕێکخرا [1].

لە ڕاستیدا بانگەواز کردن بۆ ئەو مەزهەبە لە دوای مردنی حەسەنی عەسکەری کە پێشەوای یانزەیەمی پێشەواکانی شیعەی دوانزە ئیمامیە لە ساڵی (٢٦٠ك/٨٧٤ز)دا بڵابویەوە [2].

ئیسماعیلیەکان لە لایەن دەسەڵاتەوە بەرەو ڕووی چەوسانەوە بونەوە و ناچار بون پەنا بۆ چەند نیشنگەیەکی دوور و سەخت ببەن کە عەبباسیەکان نەیان دەتوانی وێرانیان بکەن و بیان بڕن. هەروە بانگەوازەکەیان بە نهێنی بڵاوکردەوە هەوڵیان دا شوێنکەوتووان ڕابکێشن و لە سلمیەوە بەرەو هەموو بەشەکانی تری ئیسلامی چوون بەڵام بزووتنەوەی ئیسماعیلی کە لەم ماوەیەدا پشتی بە کاری سەربازی بەست ڕێی ئەوەی لێ نەگرت تا پەیڕەوی کاری سیاسی بکات هەر کات دەرفەتی بۆ بگونجایە بیرە نهێنیەکانی لە سەخت و بەرتەسکی دەوڵەتدا بڵاودەکردەوە.

* قەرمەتیەکان: بانگەوازی ئیسماعیلی لە هەموو چینەکانی کۆمەڵگەدا ئاڕاستە کرا، بەڵام لە وەڵامدانەوەکە جیاواز بو. لە کاتێکدا فارسەکان لەو بانگەوازەدا ڕقی خۆیان بۆ عەرەب نیشان دەدا. بەم جۆرە بانگەوازی ئیسماعیلی بو بزووتنەوەیەکی گەورەی شۆڕشگێری کە چەند ئاڕاستەیەکی جیای لە خۆدەگرت. گرنگترین و دیارترینیان بریتیە لە:

- ئاڕاستەی کۆمەڵایەتی بۆ بەرپاکردنی دادپەروەری کۆمەڵایەتی.
- ئاڕاستەی شیعی کە ڕێبازی شیعی ئامانجی باڵای بو.

---

١ـ كاهين: كلوت: تأريخ الشعوب الأسلامية، ص١٧٨.

٢ـ الخضري: الدولة العباسية: ص٣٠٠.

ـ ئاڕاستەی ڕەگەزی فارسی کە سەرخەرەکانی گرنگی بە دیهێنانی ڕێبازی مەزدەکییانە درك پێدەکرد.

بەڵام یەك ئامانج ئەم ئاڕاستانەی کۆدەکردەوە کە ئەویش خەونی خیلافەت بو جیاوازی ئامانجەکان بو. جیاوازی ئامانجەکان بویە هۆی ئەوەی خواستە جۆر بە جۆرەکان بە شێوەیەکی تەواو یەکانگیر نەبن، ئەمە ڕاڤەی هۆکاری گەشەسەندنی چەند قۆناغێکی ئەو بانگەوازە دەکات کە مۆرکێکی جیایان تەنانەت ناکۆکیش لە خۆبگرێت. لە مەزهەبی ئیسماعیلیەوە دوو هێزی گەورە دەرکەوتن کە هەڕەشەیان لە دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی دەکەن. یەکێکیان بزووتنەوەی قەرمەتی بو کە باری عەبباسیەکانی شێواند و لە ناوماڵی خۆیاندا بویە مایەی هەڕەشە لێکردنیان، ئەوەی تریش دەوڵەتی عەبیدی بون کە لە سلمیەوە کەوتە ڕێ و لە وڵاتی مەغریب دامەزرا[1].

بوتنەوەی قەرمەتی لە نیوەی دووەمی سەدەی سێ کۆچیدا دەرکەوت و درێژە پێدەری بانگەوازی ئیسماعیلی بو لەگەڵ ئەو بارە سەختانەی کە لە پەیوەندی نێوان بزووتنەوەی دایك (ئیسماعیلیە) و بزووتنەوە تازەکەدا (قەرمەتی) تێپەڕبو و گەیشتە ئاستی ڕوو بەڕووبونەوەی چەکداری، کاتێ دەگەڕێنەوە بۆ سەرچاوەکانی ئیسماعیلی، دەبینین وەك دەستەیەك کە لە سەرکردایەتیەکەی هەڵگەڕابێتەوە و لێ جیاببێتەوە سەیری قەرمەتیەکان دەکات[2].

بزووتنەوەکە لە سوادی عێراق لە ساڵی (٢٦١ك/٨٧٥ز) لە سەردەمی خەلیفە موعتەمەدا سەری هەڵدا[3]، دواتر گوازرایەوە بۆ وڵاتی شام و بەحرین و یەمەن ئەمەش لە چەند بارێکی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتیدا کە لە ژێر سایەی هەمان

---

١ـ دەستەی سبیعیە دەبنە دوو بەش: یەکێکیان لە موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلیدا وەستاوە و چاوەڕێ دەکات وەك مەهدی بگەڕێتەوە، ئەمانە قەرمەتیەکانن، ئەوی تر دان بە زنجیرەیەکی پەیوەستی پێشەواکان لە وەچەی ئیسماعیلیەوە دەکەن. ئەمانە ئەو ئیسماعیلیانەن دەوڵەتی فاتیمیان دامەزراند. عمر: ص٢٩٨ـ ٢٩٩.

٢ـ زکاء، سهيل: الجامع في أخبار القرمطة: ج١ ص١٠٩.

٣ـ العش، يوسف: تأريخ عصر الخلافة العباسية: ص١٥٥.

باردا بزووتنەوەی زەنج دامەزرا. لە ڕاستیدا ئاڕاستەی کۆمەڵایەتی - ئابوری بەسەر ئاڕاستەی ئایینیەکەیدا زاڵبوو لەگەڵ ئەوەی بانگخوازەکانی لە ڕا و بۆچوونە ئایینیە پەیوەستەکان بە شەریعەتی ئیسلامیدا زیادەڕەو و توندڕەو بون [١].

حەمدانی کوڕی ئەشعەث کە بە قەرمەت ناسراوە، خەڵکی کوفەیە، بە یەکێك لە بانگخوازە یەکەمینە قەرمەتیەکان دادەنرێت. بانگەوازەکەی لە سەر پاشماوەی بزووتنەوەی زەنج دامەزرا و لە ڕیزەکانی ئەو دەشتەکیانەی چاویان لە دەست کەوت بو و لای جوتیارانی ناوچەی سواد و چینە هەژارەکان ڕەواج و بایەخێکی گەورەی پەیدا کرد و وەك دانە پاڵی ئەو بەشوێنەوتووەکانی دواتر (قەرمەتیکان) [٢].

دواتر وا ڕوویدا کە بە هۆی ئەو ناکۆکیەی لە نێوان سەرکردایەتیەکەی و سەرکردایەتی ئیسماعیلیدا ڕوویدا. بزووتنەوەکە لە عێراق زیانمەند بو سەرکردایەتیەکەی کەوتە دەست زەکرەوەیهی کوڕی مەهرەوەیهی فارسی کە یەکێك لە خوێندکارەکانی حەمدان. ئەو چالاکی خۆی گواستەوە بۆ وڵاتی شام و تا بیابانی سەماوە پەلی هاوێشت دوو گورگەکانیشی (یەحیای کوڕی زەکرەوەیهی ناسراو بە ساحیبوناقە و حوسەینی کوڕی زەکرەوەیهی ناسراو بە ذی شامە یان ساحیبوخاڵ) یەك لە دوای یەك ئەرکی بڵاوکردنەوەی بانگەوازەکەیان گرتە ئەستۆ هەرکامیاننازناوی ئەمیری باوەڕدارانی وەرگرت.ئەو دوانە هێرشیان بردە سەر شار و گوندەکان و دارایی ترس و نالەباریان لە وڵاتی شام دانایەوە لە پێش ئەوەی لە ساڵانی (٢٩٠ـ٢٩١ك/ ٩٠٣ـ٩٠٤ز) دا لە ناوبرێن[٣].

زەکرەوەیش بۆ تۆڵەسەندنەوەی کوڕەکانی هەستا، بەڵام ئەویش لەساڵی (٢٩٤ك/٩٠٧ز)دا کوژرا[٤] و بەکوژرانی ئەویش قەرمەتیەکان لەوڵاتی شامدا کۆتاییان پێهات.

---

١ـ بانگەوازی ئیسماعیلی پشتی بە بیری باتینی بەست بەو واتایەی هەموو دیارێك ناخ و نادیارێکی هەیە جا ئایەتەکانی قەرئان بە ڕوخسار واتایەك دەدەن وە لە ناخەوە واتایەکی تر دەدەن کە تەواو پێچەوانەی واتای ڕوخسارەکەین.

٢ـ الطبري: ج١٠ ص٢٥.

٣ـ هەمان سەرچاوە: ص٩٩ـ١٠٠، ١٠٨ـ١١١.

٤ـ هەمان سەرچاوە: ص١٣٠ـ١٣٤.

بزووتنەوەی قەرەمەتی لە بەحرین دەدرێتە پاڵ ئەبوسەعیدی جەننابی فارسی و ئەبوتاهیری کوڕی ئەبوسەعید هەژموونی کرداری بەسەر(هەجرو ئیحساء و قەتیف و هەموو بەحریندا) سەپاند و دەوڵەتێکی سەربەخۆی دامەزراند کە موئمینیە پایتەختی بو لە ساڵی (٣٠١ك/٩١٤ز)دا ئەبوسەعید کوژرا و ئەبوتاهیر سولەیمانی کوڕی سەرۆکایەتی بانگەوازەکەی گرتە دەست و بە شێوازێکی زۆر مەترسیدار سیاسەتێکی توندڕەوانە و کوشت و بڕی گرتەبەر. بەسرە و کوفە بەدەست شاڵاوە دڕندەییەکانیەوە دەیانناڵاند، هەروەك شاڵاوی دەبردە سەر کاروانی حاجیان و لە ساڵی (٣١٧ك/٩٢٩ز) دا هێرشی بردە سەر مەککە و ماڵ و سامانی حاجیانی تاڵان کرد و لە کەعبەدا کوشتاری لێ کردن و بەردە ڕەشەی کەعبەیشی برد و لە (هەجەر) بۆ چەند ساڵێك دەستی بە سەر داگرت [1].

لەگەڵ ئەوەی ئەم کارە هێرشێکی گەورە بو بۆ سەر هەستی موسڵمانان ئەهلی سوننە کە نەیاریان بون و ئیسماعیلی و عەبیدییە هاوپەیمانەکانیشی ئیدانەی ئەو کارەنەیان کرد.

دوو هۆکار لێرەدا پاڵیان بە قەرەمەتیەکانەوە نا وە تا ئەو شێوە ئایینی و ئابوریە بگرنەبەر.

لە بواری ئاینیەوە ئەوانەی ئەو بزووتنەوەیان بەڕێوە دەبرد بەو پێیەی دەستەیەکی باڵای باتینیان، هەوڵیان دا بیر و باوەڕێکی نوێ دابهێنن کە لە نێوان ئیسلام و بیر و باوەڕ کۆنەکاندا بوەستێت و بە سەر هەردووکیاندا زاڵ بێت. ئەوان وەك ئایینێك دانیان بە ئیسلامدا نەدەنا لەگەڵ ئەوەی بە ڕووخسار ئیسلامیان نیشان دەدا، بەڵکوو بیرووباوەڕی حلول و ئەناسوخ و پیرۆزی پێشەواکانیان هێنایە ناو ئیسلامەوە [2].

لە بواری ئابورییەوە قەرمەتیەکان دەیانویست حەج بوەستێنن و هێرش بکەنە

---

١ـ قەرەمەتیەکان لە ساڵ ی ٣٣٩ کۆچی و دوای ئەوەی بیست و دوو ساڵ بەردە ڕەشیان لە دەست دابو، ئینجا بەردە ڕەشی کەعبەیان گێڕایەوە بۆ مەککە.

٢ـ عمر: ص٣١٢.

سەر کاروانە بازرگانیەکان بەو پێیەی سوودیماددیان لێبەرهەم دەهات، هەروەك ئەو شالاوانەی دەیانبردنە سەر بەسرە بە ئامانجی ئەوە بو ئاژاوە و ناسەقامگیری تێدا بنێنەوە تا بازرگانی ئەویٚ بگوازرێتەوە بۆ بەندەرەکانی کەنداو کە ئەوان دەستیان بەسەر داگرتبو، دوای ئەوەی ئەوەی خەلیفە داوایەکی تامیری بەر پەرچ دایەوە تا واز لە ئەهواز و بەسرە بهێنێت، وێڕای هەژموونی بە سەر بازرگانی دەریایی هیند و پیشەسازی خوزستاندا [1].

هەرچۆرنێك بێت، بزووتنەوەی قەرمەتی لە دوای مردنی ئەبوتاهیر لە ساڵی (٣٣٢ك/٩٤٢ز) بە هۆی ململانیٚ لە سەر دەسەلات دەسەلاتی خۆی لە بەحرین لە دەستدا، لەگەڵ ئەوەی دەوڵەتی قەرمەتی لە نێوەندی چەند تەیارێکی دوژمنکریدا تا ساڵی (٤٦٩ك/١٠٧٦ز) بەردەوام بو کە ئەمەش دەمارگیری توند ڕەوانەی ئایینی لیٚ بەرهەم هێنان.

---

١ـ هەمان سەرچاوە: ص٣٠٧ـ ٣٠٨.

# دامەزراندنی دەوڵەتی عەبیدی فاتیمی

حوسەینی کوڕی حوشەب بانگخوازی ئیسماعیلیەکان لە یەمەن لە ساڵی (٢٨٨ك/٩٠١ز)دا ئەبوعەبدوڵڵای شیعی نارد بۆ وڵاتی مەغریب تا لەو وڵاتەدا و لە دوای مردنی دوو بانگخوازی ئیسماعیلی لەوێ کە حەلوانی و ئەبوسوفیان بون، بانگخوازەکە بڵاوبکاتەوە.

ئەبوعەبدوڵڵا سەرکەتوانە توانی کۆمەڵێك لە حاجیەکانی کەتامە بەلای خۆیدا ڕابکێشێت و لەگەڵیاندا چوو بۆ وڵاتی مەغریب و لە ناو خەڵکدا بانگەوازەکەی بڵاوکردەوە و شوێنکەوتوانێکی زۆر لە دەوریدا کۆبونەوە و بەهێز بو و لە ساڵی (٢٩٦ك/٩٠٩ز)دا دەستی بەسەر قەیرەواندا گرت و دەوڵەتی ئەغالیبەی لە ناو برد.

پاشان هەواڵی بۆ عوبەیدوڵڵای مەهدی لە سلمیە نارد و داوای لێکرد تا بێت بۆ ئەفریقیا تا کاروبارەکەی بداتە دەست.

عوبەیدوڵڵایش پێشوازی بانگەوازەکەی کرد و سلمیەی بە جێهێشت و بەرە و مەغریب کەوتەڕێ و لە ساڵی (٢٩٧ك/٩١٠ز)دا گەیشتە ئەوێ و بەیعەتی خیلافەتی پێدا و نازناوی مەهدی ئەمیری باوەڕدارانیان لێنا، بەمەیش ئەو بنەڕەتە دانرا کە دەوڵەتی خیلافەتی عەبیدی لەسەر دامەزرا [1]

---

١- سەبارەت بە ڕەچەڵەکی خەلیفە فاتیمیەکان بڕوانە: عنان، محمد عبدالله: الحاكم بأمرالله و أسرار الدعوة الفاطمية، ص٤٧ـ ٧٥. سەبارەت بە دامەزراندنی دەوڵەتی فاتیمی دەکرێت بگەڕێنەوە بۆ کتێبی تأريخ الدولة الفاطميةی دکتۆر حسن إبراهيم حسن ص١ـ ٥٠

# بەشی هەشتەم

# بارودۆخی ناوخۆیی دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی

## یەکەم: پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەتە جیابوەکانی ڕۆژهەلات

دەوڵەتی تاهیری (٢٠٥ــ٢٠٩ك/٨٧٠ــ٨٧٣ز)

ناوی ئەمیرە تاهیرییەکان و ماوەی میراتی هەر یەکەیان:

١ــ تاهیری کوڕی حوسەینی کوڕی موسعەب ٢٠٥ــ٢٠٧ك/٨٢٠ــ٨٢٢ز

٢ــ تەڵعەتی کوڕی تاهیر ٢٠٧ــ٢١٣ك/٨٢٢ــ٨٢٨ز

٣ــ عەبدوڵلای کوڕی تاهیر٢١٣ــ٢٣٠ك/٨٢٨ــ٨٤٤ز

٤ــ تاهیری کوڕی عەبدوڵلا٢٣٠ــ٢٤٨ك/٨٤٤ــ٨٦٢ز

٥ــ موحەممەدی کوڕی تاهیر ٢٤٨ــ٢٥٩ك/٨٦٢ــ٨٧٣ز

دەوڵەتی تاهیری بە ویستی خیلافەت دامەزرا و تاهیری کوڕی حوسەینی یەکێ لە سەرکردەکانی مەئموون کە لە ساڵی (۲۰٥ك/۸۲۰ز)دا کردی بە والی خوراسان و هەموو ناوچەکانی ڕۆژهەلاتی لە بەغدادەوە دایە دەست [١]، دایمەزراند. لە داخوازی هۆگری و پشتیوانیدا زۆری جەختی لێنەکردەوە.

تاهیر نەیسابوری کرد بە بنکەی خۆی و هەر لە سەرەتاوە دیدی جیابونەوە دایگرت و لە ساڵی (۲۰۷ك/۸۲۲ز)دا مەئموونی لە خیلافەتدا لابرد و نزا بۆ کردنی نەهێشت، پاشانیش جلی ڕەشی لابرد، بەوەیش جیابونەوەی خۆی لە بەغداد ڕاگەیاند[٢]، بەڵام دوای ئەوە تاهیر لە کتوپڕێکدا مرد، گومان لە سەر خەلیفە دانراوە کە ئەو ژەهرخواردی کردبێت [٣]. لەگەڵ ئەوەی مەئموون لە ڕووی چاوچنۆکیەکانی تاهیردا وەستا بەڵام تەڵعەی کوڕی وەك والی خوراسان هێشتەوە [٤].

تاهیرییە جێگیرەکانی تاهیر لە لایەن خۆیانەوە لە سەر ئەوە سووربون کە سیاسەتی هاوکاری لەگەڵ خیلافەتدا درێژە پێبدەن و دڵنیان بە دەسەلاتی خیلافەتدانا. ئەم سیاسەتەیش لەمانە دەردەکەوێت:

- تەڵعە دژ بە خەواریجەکان لە سیستان جەنگی کرد.

- عەبدوڵڵای کوڕی تاهیر ئاژاوەی دەرەکی لە میسر لەناو برد و بزووتنەوەی تالیبی دژ بە نیزامی خیلافەتی لە خوراسان لە ناو برد، هەروەك بۆ لەناو بردن بزووتنەوەی مازیار لە تەبەرستان یارمەتی خیلافەتی دا.

---

١ـ الطبري: ج٨ ص٥٧٧.تاهیرییەکان حوکمڕانی خوراسان و ناوچەکانی ڕۆژهەلات و باکووری خوراسانیان تا سەر سنووری هیندی و سنووری تورکەکانیان لە دەست بو.

٢ـ اليعقوبي: ج٣ ص٤١٣.

٣ـ هەمان سەرچاوە.

٤ـ الطبري: ج٨ ص٥٩٩. دەسەلاتی تاهیریەکان درێژبویەوە و هەرێمی هوراتی لە باشوور و کەناراوی باشووری ڕژهەلاتی دەریایی قەزوینی لە ڕۆژئاوا و بەرزاییەکانی دۆڵی ڕووباری جەیحوونی لە خوارووی شاخەکانی هیند و کوش لە ڕۆژهەلات لە خۆگرت دەسەلاتیان هەموو وڵاتی ئەو دیو ڕووباری گرتەوە.

ـ عەبباسیەکانیش ڕێزی ئەو خزمەتانەیان گرت و تاهیریەکانیان لە خۆیان نزیک کردەوە و لە ملمڵانیێ دژ بە سەففاریەکان دایانە پاڵ ئەوان.

ـ لە سەردەمی ئەوان دا خوراسان لە ئاسایش و خۆشگوزەرانی و گەشەسەندن دا بو، هانی کشتوکاڵیان دا و ڕەی یان ڕێکخست. گرنگیان بە فێرکاری دا تا ئەوەی لە سەردەمی ئەوان دا نەیسابور بو بە مەڵبەندێکی ڕۆشنبری ئیسلامی.

لە ڕووی پەیوەندی دەرکیەوە ویلایەتەکانی ڕۆژهەلاتیان لە دەست درێژی تورکەکان پاراست و سنووری وڵاتیان فراوان کرد و دەسەڵاتی موسڵمانانیان بە لە ناوبردنی لە ڕیێ دەرچووان چەسپاند، بەڵام لە بەردەم زۆربون و دەرکەوتنی بزووتنەوە تالیبیەکاندا دەستەوەسان وەستان تا لە ژێر گورزی سەففارییەکاندا ڕووخان.

# دەوڵەتی سەففاری (٢٥٤-٢٩٨ك/٨٦٧-٩١١ن)

**ناوی ئەمیرە سەففارییەکان و ماوەی میرایەتی هەریەکێکیان:**

**١- ئەبویووسف یەعقووبی کوڕی لەیث ٢٥٤-٢٦٥ك/٨٦٧-٨٧٨ز**

**٢- عەمری کوڕی لەیث٢٦٥ -٢٨٧ك/٨٧٨-٩٠٠ز**

**٣- ئەبولحەسەن تاهیری کوڕی موحەممەدی کوڕی عومەری کوڕی لەیث ٢٨٧-٢٩٦ك/٩٠٠-٩٠٨ز**

**٤- لەیثی کوڕی عەلی کوڕی لەیث ٢٩٦-٢٩٨ك/٩٠٨-٩١١ز**

**٥- ئەبوعەلی موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی لەیث٢٩٨ك/٩١١ز**

ئەم دەوڵەتە درێژبونەوەی سیاسی ئەو بزووتنەوە جیاخوازیانە دەنوێنێت کە لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی لە بەشێکی جوگرافی ئێراندا کە بەشی باشوورە سەر هەڵدا و یەعقوبی کوڕی لەیثی سەففاری[1]، لاوازی خیلافەتی عەبباسی بەهۆی سەرقاڵبونی بە جەنگی دژ بە زەنجی بەهەند وەرگرت و دایمەزراند. جا دەستی بە سەر هەرێمەکانی باشووری ئێراندا گرت و وڵاتی فارسی دایە پاڵ خۆی و بەرەو خوراسان کەوتە فراوانخوازی لە دوای ئەوەی لە ساڵی (٢٥٩ك/٨٧٣ن)دا دەوڵەتی تاهیریان لە ناوبرد بەمە شانوشکۆی زیادکرد و دەستی گرت بەسەر سجستان لەو پەڕی ڕۆژهەڵاتی ئێرانی باشووری و (دۆلی کاپول و سەند و مەکران)دا[2]. پاشان نامەی بۆ خەلیفە نووسی و باسی باری ڕۆژهەڵاتی بۆ کرد. دەسەڵاتەکەی چەند تایبەتمەندییەکی زاڵی لەو سەردەمەدا هەبو، ئەو لەو ناوچانەی لە ژێر دەسەڵاتی دابون ئاسایش و ئاشتی بە دی هێنا، بۆیە سوپایش پەیوەستی بو و خەڵکیش پاڵپشت و یاریدەدەری بون.

---

١- نازناوی سەففاری وەرگرت چونکە ئیشی مزگەری قاپ و قاچاخی مسی دەکرد.

٢- اليعوبي: ج٢ ص٤٥٩-٤٦٠، إبن الأثير: ج٥ ص٣٢٧-٣٢٨، ٣٦٣.

خەلیفە لە هەڵسوکەوت و فراوانخوازیەکانی یەعقوب ناڕازی بو و پێوابو دەوڵەتی تاهیری ئەو بنکە بو کە خیلافەت لە ڕۆژهەلات پشتی پێدەبەست، لە ناوبردنیشی دەبێتە هۆی هەڕەشەی ڕاستەوخۆ بۆ خیلافەت و مەترسی بۆ سەر بونی عەبباسی لە ویلایەتەکانی ڕۆژهەلاتدا. بۆیە خەلیفە موعتەمەد بە خێرایی و بە توندی بەرپەچی زیاد بونی قەڵەمڕەویی یەعقوبی دایەوە و لە بەردەم حاجیەکانی خوراسان و ڕەی و تەبەرستان و جورجان دا نەفرینی لیّ کرد[١].

ئەو هەڵوێستەی خەلیفە تورەبونی یەعقوبی لێکەوتەوە، ئەویش هەڕەشەی لە دەسەلاتی مەرکەزی کرد و بەرەو فارس پێشڕەوی کرد و داگیری کرد. ئینجا بەرەو عێراق درێژەی پێشڕەوییەکەی دا تا گەیشتە ئەهواز و نوێنەری نارد بۆلای خەلیفەو داوای لێکرد تا ویلایەتەکانی ڕۆژهەلات و پۆلیسی بەغداد و سامەڕائی بداتەدەست و لە بەردەم حاجیەکاندا نەفرینەکەی پوچەڵ بکاتەوە[٢].

خیلافەت زانی ناتوانێت لە ڕووی کشانی سەففاریدا بوەستێت بۆیە بڕیاری ئاگر بەستی دا یەعقوبیش وەلامی داواکەی دایەوە[٣]. لەو کاتەدا خیلافەت لەگەڵ زەنجەکاندا لە پێکدادان بو.

لە ڕستیدا خیلافەت تەنها بە ڕێژەی پێویستی سەر پێکەوتنەوە و هەڵقوستنەوەیەکی تر بڕیاری ئاگربەستی دا تا ئەو هەڵە بۆ لە ناوبردنی هێزی سەففاریەکان بقۆزێتەوە، لە پاڵ ئەویشدا دەسەلاتێکی هەواداری لە هەرێمی ئەو دیو ڕووبار بە سەرکردایەتی نەسری کوڕی ئەحەممەدی سامانی دامەزراند، بەمەیش لە پشتەوە هەڕەشەی لە دوڵەتی سەففاری کرد.یەعقوب هەستی بە سیاسەتی دوژمنکارانەی خەلیفە بەرامبەر بە ئەو کرد و بڕیاریدا سنوورێکی کۆتایی بۆ ئەو حاڵە دابنێت، ئەویش بە دەستگرتن بەسەر بەغداد و ملکەچ کردنی خیلافەت بۆ دەسەلاتی ڕاستەوخۆی خۆی.

---

١ـ إبن خلكان: ج٦ ص٤١٢.

٢ـ الطبري: ج٩ ص٥١٤، إبن خلكان: ج٦ ص٤١٣.

٣ـ هەمان سەرچاوە: ص٥١٦.

جارێکی تر خیلافەت دەستەوەسان وەستا و خواستی ئاگربەستی هەبو تا ئاگر کات بەدەست بخات، بۆیە هەواڵی بۆ یەعقوب نارد تا ناوچەی فارس و خوراسان و کرمان و ڕەی و ئەسفەهان لەگەڵ پۆلسی بەغداد و سامەڕاء بداتە دەست یەعقوب، بەڵام یەعقوب نەخۆش بو، بەرپەرچی پلانەکانی خەلیفە کاری نەکردە سەر ڕووداوەکانی دواتر و دوای ئەوە لە ساڵی (٢٦٥ك/٨٧٨ز)[١] و لە دوای ئەوەی چاوچنۆکی خۆی بەرامبەر بە خەلیفە عەبباسی بۆ جیابونەوەی تەواو لە دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی تێپەڕاند، کۆچی دوایی کرد.

عەمر بە هەڵبژاردنی سەربازانی یەعقوب شوێنی یەعقووبی برای گرتەوە[٢]، ئەو لێهاتوویی سیاسی هەبو، بۆیە لە ململانێی لەگەڵ خیلافەتدا پەنای بۆ شێوەیەکی تر بەست و سیاسەتی نەرم ونیانی و ئاگربەستی گرتەبەر و هەموو بارێکی گۆڕانی بارودۆخی لەبەر چاوگرت، بۆیە نامەی بۆ خەلیفە موعتەمەد نووسی و گوێڕایەڵی خۆی بۆ خەلیفە ڕاگەیاند، موفەقیش نامەی بۆ نووسی کەچی ناوچەی ژێر دەستی یەعقووبی برای هەیە بدرێتە دەست ئەو[٣]. پاشان کەوتە بەهێزکردنی مەڵبەندی خۆی و چەسپاندنی دەسەڵاتی لە ناو خۆدا، بۆیە سوپایەکی تایبەتی لە مەمالیکە تورکەکان بۆ پاسەوانی خۆی دامەزراند[٤] و زۆرێکیان پێشکەش بە سەرکردەکانی کرد و بە ماڵ و سامان چاوبەسی کردن تا بەنهێنی ئەو هەواڵانەی بۆ بهێنن کە بە ئاشکرا ناتوانێت ئەو هەواڵانەی پێبگات.[٥]

هێندەی نەبرد پەیوەندی باشی لەگەڵ خیلافەتی عەبباسیدا تێکچوو و خراپ بو، چونکە موعتەمەد ترسی لە چاچنۆکی ودیدی جیاخوازی عەمر هەبو، هەروەها بزووتنەوەی زەنجیشی لە ناوبرد بو، بۆیە دەستی کراوە بو تا بەرامبەر بزووتنەوە

---

١ـ إبن الأثير: ج٦ ص٢١.

٢ـ إبن خلكان: ج٦ ص٤١٩.

٣ـ إبن الأثير: ج٦ ص٢٢.

٤ـ هەر بە منداڵی دەیکڕین و لە سەر کارە سەربازیەکان پەروەردەی دەکردن و ڕای دەهێنان.

٥ـ الطبري: ج١٠ ص٧.

جیاخوازییەکان هەڵوێست بنوێنێت، بۆیە بڕیارێکی دەرکرد کە بەو پێیەی عەمری لە دەسەڵاتەکەی لە کارخست و ئەمەشی لای حاجیەکانی خوراسان ڕاگەیاند و لە بەرچاویاندا نەفرینی لێکرد و موحەممەدی کوڕی تاهیری کە خەلیفە لە دیلی ئازادیکرد لەسەر خوراسان دانا. پاشان بە سەرکردایەتی موفەق سوپایەکی بۆ ئەو ناوچە نارد تا لەگەڵیدا بجەنگێت ئەویش ناچاریکرد تا بگەڕێتەوە بۆ سجستان، بەڵام نەیتوانی دەستبەسەر کرمان و سجستاندا بگرێت و بەشوێنی خۆیدا گەڕایەوە[1].

کاتێ موعتەزەد لە ساڵی (٢٧٩ك/٨٩٢ز)دا خیلافەتی گرتە دەست، عەمر بەپەلە هەوڵیدا خەلیفە ڕازیبکات، بۆیە هۆگری و پشتیوانی خۆی بۆ خەلیفە نیشاندا و دیاری بۆ نارد و داوای ویلایەتی خوراسانی لێکرد، خەلیفەیش داواکەی وەرگرت و موحەممەدی کوڕی تاهیری لەسەر خوراسان لابرد[2]. پاشان داوای لە خەلیفە کرد تا وڵاتی ئەو دیو ڕووباریشی بداتە دەست بەبێ ئەوەی ئەو سەختییانە لە بەرچاو بگرێت کە ڕێی لێدەگرن لێرەدا خەلیفە دەرفەتی بە دیکرد تا هێزی زیادبوی سەففاریەکان لە ناوببات، بۆیە ویستی عەمر لەگەڵ هێزی سامانیدا پێکدا بدات. بۆیە داواکەی قبوڵکرد تا وڵاتی ئەو دیو ڕووباری پێبدات، خەلیفە دەیویست ئەو دوو هێزە پێکدا بدەن تا دەسەڵاتی ئەو هەرێمەی بۆ بمێنێتەوە، دەی پێشبینیەکەی خەلیفە ڕاست بو و لە ساڵی (٢٨٧ك/٩٠٠ز) دا سامانی و سەفاریەکان پێکیاندادا و بەسەر سەففاریەکاندا سەرکەوتن و عەمر بەدیلگیرا و نێردرا بۆ لای خەلیفە و خەلیفەیش کردیە بەندیخانە و لە ساڵی (٢٨٩ك/٩٠٢ز)دا عەمر لە بەندیخانە دا مرد[3].

خیلافەت بۆ بڵاوکردنەوەی دەسەڵاتی کرداری خۆی بەسەر ویلایەتەکانی ئیسماعیلی سامانی توانی لە ساڵی (٢٩٨ك/٩١١ز) دا دەست بەسەر سجستاندا

---

١ـ هەمان سەرچاوە: ص١٣، إبن الأثير: ج٦ ص٦٢.

٢ـ هەمان سەرچاوە: ص٤٩ ـ٥٠، إبن خلكان: ج٦ ص٤٢٤ـ٤٢٥.

٣ـ هەمان ئەو دوو سەرچاوە: ص٧٦، ص٤٢٦.

بگرێت[1].

دواتر دەوڵەتی سەففاری لە دوای ئەو ماوە کورتەی دەسەڵاتی لەگەڵ بەهێزی سوپاکانی و بەرفراوانی ناوچەکانی ژێردەستی و کارگێری باشی سەرکردەکانیدا ڕووخا. هۆکاری سەرەکی ڕووخان و ئاوابونیشی هەڕەشە کردنی بو لە خیلافەتی عەبباسی و هەڵوێستی دوژمنکارانەی سەففاری بو بەرامبەر خیلافەت و ئەو هەوڵە بەردەوامانەی بۆ لەناو بردنی خیلافەت دەیخستەگەڕ.

---

١ـ الطبري: هەمان سەرچاوە، ص١٤٣ـ١٤٤.

# دەوڵەتی سامانی (٢٦١ـ٣٩٨ك/٨٧٤ـ٩٩٩ز)

## ناوی ئەمیرە سامانیەکان و ماوەی میرایەتی هەریەکەیان:

١ــ نەسری کوڕی ئەحمەد: نەسری یەکەم: ٢٦١ــ٢٧٩ك/٨٧٤ــ٩٨٢ز.

٢ــ ئیسماعیلی کوڕی ئەحمەد: ٢٧٩ــ٢٩٥ك/٩٨٢ــ٩٠٧ز.

٣ــ ئەحمەدی کوڕی ئیسماعیلی: ٢٩٥ــ٣٠١ك/٩٠٧ــ٩١٣ز.

٤ــ نەسری کوڕی ئەحمەد: نەسری دووەم: ٣٠١ــ٣٣١ك/٩١٣ــ٩٤٢ز.

٥ــ نوحی کوڕی نەسر: نوحی یەکەم: ٣٣١ــ٣٤٣ك/٩٤٢ــ٩٥٤ز.

٦ــ عەبدولمەلیکی کوڕی نوح: عەبدولمەلیکی یەکەم: ٣٤٣ــ٣٥٠ك/٩٥٤ــ٩٦١ز.

٧ــ مەنسووری کوڕی نووح: مەنسووری یەکەم: ٣٥٠ــ٣٦٦ك/٩٦١ــ٩٧٦ز.

٨ــ نووحی کوڕی مەنسوور: نوحی دووەم: ٣٦٦ــ٣٨٧ك/٩٧٦ــ٩٩٧ز.

٩ــ مەنسووری کوڕی نووح: مەنسووری دووەم: ٣٨٧ــ٣٨٩ك/٩٩٧ــ٩٩٩ز.

١٠ــ عەبدولمەلیکی کوڕی نووح: عەبدولمەلیکی دووەم: ٣٨٩ك/٩٩٩ز.

سامانیەکان دەدرێنە پاڵ بنەماڵەیەکی ناوداری فارسی کە ئایینی زەردەشتییان هەبو، دواتر سامان خوداهی باپیرەیان موسڵمان بو کەیەکێ بو لە خانەدانەکانی شاری بەڵخ لە سەردەمی خەلیفەی ئومەوی هیشامی کوڕی عەبدولمەلیکدا. ئینجا دایە پاڵ بانگەوازی عەبباسی لە خوراسان و لە ناو ڕیزەکانی ئەبوموسلیمدا ئیشی دەکرد[١]. سامان کوڕێکی هەبو کە بە ئەسعەد ناودەبرا و وەك نواندنی بە ناوی ئەسەدی کوڕی عەبدوڵلای قەسریی والی ئومەویەکان لە سەر خوراسان کە لە سەر دەستی ئەو موسڵمان بو ئەو ناوەی لێنا[٢].

١ـ إقبال: ص١٣٣.

٢ـ ذبیح الله، صفا: تأریخ أدبیات در إیران، ج١ ص٢٠٤.

دەوڵەتی سامانی لە هەرێمی ئەو دیو ڕووباردا دامەزرا و تا ئێران پەلیهاویشت و دەسەڵاتی بەسەر خوراساندا بڵاوکردەوە، هەروەك تەبەرستان و ڕەی و ناوچەی شاخ و سجستانی دایە پاڵ دەسەڵاتەکەی. کەوتە پەیڕەوکردنی دیدی جیاخوازی فارسی بەشێوەیەك زیاتر لە ڕوانگەی زیندووکردنەوەی زمان و ڕوشنبیری فارسیەوە خۆی دەنواند[١].

کوڕەکانی ئەسەد کە نووح و ئەحمەد و یەحیا و ئیلیاس بون لە دانانی سنوورێك بۆ بزووتنەوەکەی ڕافیعی کوڕی کوڕی لەیثی کوڕی نەسری کوڕی سەیار لە سەردەمی خەلیفە مەئموونـدا ڕۆلێکی بەرچاویان بینی. مەئمونیش دەستگرۆیی کردن و لە شانۆشکۆی بەرزکردنەوە و وەك والی لەسەر گرنگترین شارەکانی وڵاتی ئەو دیو ڕووبار داینان[٢].

ئەو برایانە توانییان بە یارمەتی تاهیریەکان لە شاڵاوەکانی تورکە بتپەرستەکان بۆ سەرناوچەکانی سەر سنوور بکەن، هەروەك لەو ململانێیەی لەگەڵ سەففاریکاندا کەوتە نێوانیان بەشدارییان کرد و یارمەتییان دان و پشتیان دەگرتن، ئەمەوای لە تاهیریەکان کرد بەشێوەیەکی بەردەوام لەسەر ناوچەکانیان بیانهێڵنەوە.

کاتێ دەوڵەتی تاهیری لە ساڵی (٢٥٩ك/٨٧٣ن) لە ناوچوو، سامانیەکان هەرێمی ئەو دیو ڕووباریان گرتە دەست و ڕاستەوخۆ بە ناوی خەلیفەوە حوکمڕانییان دەکرد، خەلیفەیش دانی بە هەوڵ و دڵسۆزییاندا ناو ئەو هەرێمەی لە هەرێمی خوراسان جیاکردەوە و لەوێ سەقامگیری کردن. ئامانجی ئەوە بو لەلایەکەوە دەستگرۆییان بکات و لەلایەکی ترەوە هێزێکی هەواداری خۆی لە پشت ناوچەی ژێردەستی سەففاریەکاندا بە دیبهێنێت تا لە کاتی پێویستیدا سوودی لێوەربگرێت.

سامانیەکان لە ماوەی ژیانی سیاسییاندا سووربون لەسەر ئەوەی گوێڕایەلی خیلافەتی عەبباسی بن و هۆگرییان بە دەستبهێنن. لە ڕاستیدا ئامانجیان فراوانخوازی دەرەکی بو و خۆیان لە چوونە ناو ململانێی ناوخۆیی لەگەڵ دەوڵەتی

---

١ـ Brown: literary hist. of Persia, I,pp ٣٥٦, ٣٦٩,٣٩٩.

٢ـ إبن الأثير: ج٦ ص٤.

ئیسلامیەکانی تر بەدوور بگرن، بەمەیش بونە تەواوکەری سروشتی ئەو ئەرکەی تاهیریەکان دەستیان پێکرد تا ئاسایش و نیزام بپارێزن. بەمە قەڵەمڕەوی جیهانی ئیسلامییان لەو دیو سنووری ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ناوەڕاستی ئاسیا درێژکردەوە. لە فتوحاتەکانیاندا جەختیان لەسەر تورکستان لە ڕۆژهەڵاتی ڕووباری جەیحون دەکردەوە و لە وڵاتە بتپەرستەکاندا ژیاری ئیسلامییان بڵاوکردەوە لە سەر دەستی ئەوان ژمارەیەکی زۆری تورکە بتپەرستەکان هاتنە ناو ئیسلام، بەمەیش ڕەگەزێکی نوێیان هێنایە ناو جیهانی ئیسلامی کە دواتر لە داهاتوودا لە ژیانی ئیسلامیدا ڕۆڵێکی کارا دەبینن.

لەلایەن خۆیەوە خیلافەت لە ناو سامانیەکاندا چەند والیەکی دڵسۆزی بەدیدەکرد، بەڵام لە ناوخۆی وڵاتدا سەربەخۆیی و دەسەڵاتی تەواویان هەبوو، خیلافەت بۆ چەسپاندنی دەسەڵاتی لە ڕۆژهەڵات پشتی بەوان دەبەست و بۆ لێدانی دەرچوان لە دەسەڵاتی خیلافەت ئەوان دەستی لێدەری خیلافەت بون، لەوانە، نەسری دووەم ـ کە لە سەردەمی ئەودا هێزی سامانییەکان گەیشتە ئەو پەڕ ـ چەند بزووتنەوەیەکی وشەسکێری کوڕی زەییار و ماکانی کوڕی کالی و چەندێکی تری لە دەسەڵات دەرچووی سەرکوتکرد. لە ئەنجامی سەرکەوتنی بەسەریاندا ئەبهور و قەزوین و قوم و هەمەدان و نەهاوەند و دەینەوەر و بەلخ و حەلوانیدایەپاڵ خۆی [1].

لەبەر ئەوەی دراوسێ موسڵمانەکانی سامانەکانی دژ بە عەبباسیەکان بون، بۆیە سامانیەکان پەیوەندی دوژمنکارانەیان بەرامبەر بە دراوسێ موسڵمانەکانیان هەبو، بە ناچاری چوونە ملمڵانێیەك لەگەڵ سەففاریەکاندا و دەوڵەتەکەیان لە ناوبردن و لەگەڵ تالیبیەکانیشدا پێکیاندادا. جا ئیسماعیلی کوڕی ئەحمەدی سامانی لە ساڵی (٢٨٧ك/٩٠٠ز)دا موحەممەدی کوڕی زەیدی عەلەوی ئەمیری تەبەرستانی لەناو برد لە دوای ئەوەی ئەو ئەمیرە چاوی بڕیبویە وڵاتی خوراسان [2].

---

١ـ إقبال: ص١٤٦.

٢ـ إبن الأثير: ج٦ ص٩٦ـ ٩٧.

لە ڕاستیدا بانگەوازی شیعی لە خوراسان کۆتایی پێنەهات و تالیبییەکان سۆزی زۆرێك لە دانیشتوانی خوراسانیان بۆ لای خۆیان ڕاکێشا بو، بە تایبەت لە دوای دمەزرانی دەوڵەتی خیلافەتی عەبیدی لە مەغریب کە بانگخوازە عەبیدیەکان دەهاتنە ئەو ناوچە تا لە بەشەکانیدا بانگەوازەکە بڵاوبکەنەوە و توانییان ئەمیر نەسری دووەمی کوڕی ئەحمەد بەلای خۆیاندا ڕابکێشن [١].

ئەمیر لە لایەن سەرکردەکانی پاسەوانی تورکی و دەربارەوە بەرەو ڕووی بزووتنەوەیەکی بەرهەڵستکاری ئەو ئاڕاستەیە بونەوە و بۆ لە ناوبردنی پیلانیان لە دژ گێڕا، بەڵام سەرکەوتوو نەبون، لە لایەکی تریشەوە سۆزداری سامانی لەگەڵ ئاڕاستەی ئیسماعیلیدا قۆناغ بە قۆناغ بو، چونکە دوای مردنی نەسر نووحی کوڕی لە پەرچە کردارێکی توندا مەزهەبی ئیسماعیلی لە ناوبرد [٢].

دەوڵەتی سامانی سەد و بیست و هەشت ساڵ تەمەنی کرد و ئەگەر بنەماڵەی سامانی بەرەو ڕووی چەند کێشەیەکی ناوخۆیی و چەند فشارێکی دەرەکی نەبوایەتەوە کە بویە هۆی ئاوا بونی، ئەوا تەمەنێکی زیاتری دەکرد.

جا لە ڕووی کێشەی ناوخۆییەوە ململانێی خێزانی لە نێوان ئەندامانی بنەماڵەی سامانیدا هەڵگیرسا و بویە هۆی سەرهەڵدانی ئاژاوە و ڕاپەڕین، هەروەك سەرکردەکان و کاربەدەستانی هەرێمەکان لە دەسەڵاتیان دەرچوون و پشتیان بە بویهیەکان بەست [٣].

لە ڕووی فشاری دەرەکیشەوە دەوڵەتی سامانی بەرەو ڕووی فشارێکی زۆری دەیلەم و تالیبی و بوەیهیەکان و خانە تورك و غەزنەویەکان بویەوە کە بویە هۆی لاواز بونی و چاوتێبڕینی لە لایەن دراوسێکانیەوە تا ئەوەی لە کۆتاییدا دەسەڵاتەکەی لە نێوان دوو هێزدا دابەشبو، هێزی غەزنەویەکان و هێزی خانە تورکەکان [٤].

---

١ـ إقبال: ص١٤٣.

٢ـ هەمان سەرچاوە: ص١٤٤.

٣ـ سەبارەت بەململانێی ناوخۆی بنەماڵەی سامانی بگەڕێرەوە بۆ: باتولد: ص ٢٧١ـ ٢٧٣.

٤ـ سەبارەت بە دارمانی دەوڵەتی سامانی بڕوانە: إقبال: ص١٦٢.

هێنـدە مـاوە بڵـێین سـامانیەکان ڕۆڵێکـی دیـاری ژیـاری و سیاسـییان بـینی و سەردەمەکەیان تایبەتمەندی ڕاپەڕینێکی زانستی و ئەدەبی بـاڵای هەیـە کـە وایکـرد بوخارای پایتەختیان لـە گـرنگترین مەڵبەنـدی زانـستیە ئیـسلامیەکان بێـت، هـەوڵی زیندووکردنەوەی ڕۆشنبیری و ئەدەبی فارسیشیان دا کە بەرەبەرە لە سەدەی سێی کۆچیەوە لە بوژانەوەدا بو و لە سەردەمی ئەواندا نووسین بـە زمـانی فارسـی لـەپاڵ زمانی عەرەبیدا دەرکەوت.

کتێبخانەی ئەمیر نووحی کوڕی نەسـر ناسـراو بـو، ئـیبن خەلـەکان لـە بارەیـەوە دەڵێت:(بێوێنە بو، لەهەموو بوار و هونەرێکدا کتێبی ناوداری بە دەستی خەڵکەوە و کەسانی ترەوە تیادابو کە لە شوێنی تردا شتی وا نەبو و ناویشی نەبیسترابو نەوەك ئەوەی بیزانن) [١].

سەردەمی سامانی ڕاپەڕینێکی پیشەسازیش بەخۆیـەوە دی کـە لـە پیـشەسازی گڵێنە و پەڕە و فەرش و ڕاخەر و چنراوی ئاوریشمدا خۆی دەنواند.

لـە لایـەن سیاسـیەوە، سـامانیەکان بـەرگرییان لـە ناوچـە سەرسـنووریەکانی ڕۆژهـەڵات کـرد و قەڵـەمڕەوی ئیـسلامیان بـەرەو وڵاتـی تـورك درێـژکردەوە و یـەك ڕۆژیش لە شوێنکەوتەیی خیلافەتی عەبباسـی لـە بەغـداد دەرنەچـوون و خۆیـان بـە ئـامێری بـەکارهاتووی گوێڕایـەڵی پـەیڕەوکاری فرمانـەکانی خەلیفـە عەبباسـیەکان دەزانـی مـاوەی دەسـەڵاتیان بـە سـەردەمی زێـڕینی مێـژووی ئیـسلامی لـە ئاسـیای ناوەڕستدا دادەنرێت.

دووەم: پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەتە جیابوەکانی میسر و وڵاتی شام

---

١ إبن خلكان: ج١ ص١٥٢ـ ١٥٣.

# دەوڵەتی تۆڵۆنی (٢٥٤-٢٩٢ك/٨٦٨-٩٠٥ز

## ناوی ئەمیرە تۆڵۆنیەکان و ماوەی میرایەتی هەریەکەیان:

**١ـ ئەحمەدی کوڕی تۆڵۆن٢٥٤ـ٢٧٠ك/٨٦٨ـ٨٨٤ز.**

**٢ـ خامارەوەیهی کوڕی ئەحمەد٢٧٠ـ٢٨٢ك/٨٨٤ـ٨٩٥ز.**

**٣ـ ئەبولعەساکیر جەیشی کوڕی خەمارەوەیهی ٢٨٢ـ٢٨٣ك/٨٩٥ـ٨٩٦ز.**

**٤ـ شەیبانی کوڕی ئەحمەد ٢٩٢ك/٩٠٥**

## دامەزراندنی دەوڵەتی تۆڵۆنی

ئەحمەدی کوڕی تۆڵۆن کە لە مالیکە تۆرەکان بو، دەوڵەتی تۆڵۆنی دامەزراند. ئەحمەد لە ساڵی (٢١٤ك/٨٢٩ز) لە دایك بو. باوکی ناوی تۆڵۆن بو لە ساڵی (٢٠٠ك/٨١٦ز) لە لایەن بەرپرچی بوخارا نوحی کوڕی ئەسەدەوە پێشکەش بە خەلیفە مەئموون کرا، لە ساڵی (٢٣٠ك/٨٤٥ز) دا باوکی مرد. ئەحمەد لە بارێکی ئایینیدا پێگەیشت ئەو تاوان و کارە خراپانەی تورکەکان ئەنجامیان دەدا ئەم بە ئابڕووچوونی دەزانی، خێر و بەخششی زۆری هەبو، لە ناو هاوڵاتیاندا بەخشندە و بەڕێز و دادپەروەر بو. ژیانی یەکەمی سیاسی و سەربازی خۆی لەسەر سنوورەکانی تەرسووسدا بەسەر برد کە گرنگترین سەر سنوورە ئیسلامیەکان بو. لە نزیکەوە شارازەیی لە سەر وڵاتی شامیش هەبو. پێدەچێت ئەو ڕۆژانەی یەکەمی ژیانی پاڵنەر بوبن بۆ خواستەکانی داهاتووی و نیازە سیاسیەکانی. هەر لە سەرەتاوە لە پایتەختی خیلافەتدا لە ڕیزی تورکەکان سوودمەند بو. هەروەك سەرباز و سەرکردەکانیشیان کە هاوڕێی باوکی بون پاڵپشتیان دەکرد و متمانەی خەلیفە متەوەکیلی بەدەست هێنا. خەلیفە متەوەکیل لە دوای مردنی باوکی چی کارووباری باوکی بو دایە دەستی ئەحمەدی کوڕی، هەروەك متمانەی خەلیفە موستەعینیشی

بە دەست هێنا [١]. لە دوای مردنی باوکی، دایکی لەگەڵ ئەمیری بایکباکی تورکیدا کە خەلیفە موعتەز لە ساڵی (٢٥٤ك/٨٦٨ز)دا کردی بە والی میسر هاوسەرگیری کرد. ئەویش ئەحمەدی نارد بۆ میسر تا لە جیاتی ئەو و بە نوێنەرایەتی ئەو دەسەڵاتی میسری لە دەست دابێت، بەڵام ویلایەتی تەواوی لە دەست بو، بەڵکوو پەیوەندی لەگەڵدا بو، فستاتی پایتەختی میسریشی لە دەست بو، بەڵام کاتێ هاتە میسر چەند نیاز و هەوڵێکی بەرفراوانی سیاسی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرت [٢].

باری سیاسی و بارودۆخی دارماوی ئابوری یارمەتیان دا تا لە میسردا جێپێی خۆی بچەسپێنێت، وا ڕوویدا لە ساڵی (٢٥٦ك/٨٧٠ز)دا بایکباك کوژرا، بەمە ویلایەتی میسر درایە دەست بارجوخ کە پەیوەندی باش و ژن و ژنخوازی لەگەڵ ئەحمەدی کوڕی تۆلۆندا هەبو، بارجوخیش ئەحمەدی لە شوێنی خۆیدا هێشتەوە و دەسەڵاتیشی زیاد کرد بەوەی هەموو میسری دایە دەست [٣] جگە لە خەراج کە لە دەست ڕکەبەرەکەیدا ئەحمەدی کوڕی مودەبرا دا بو کە بە کەسێکی ژیان خراپ و ناباش ناسرا بو، ئەمە پاڵی بە ئەحمەدی تۆلۆنەوە نا تا داوا لە خەلیفە موهتەدی بکات تا لە سەر خەراجی میسر لاییبات و بیداتە دەست ئەو. خەلیفەیش داواکەی وەرگرت و کاروباری سەرسنووره شامیەکانی لە ئەنجامی بارگرژی بارودۆخیدا دایە دەست [٤].

کاتێ بارجوخ لە ساڵی (٢٥٩ك/٨٧٣ز) دا مرد، ئەحمەدی کوڕی تۆلۆن لە لایەن خەلیفەوە ڕاستەوخۆ بو بە فەرمانڕەوای شەرعی میسر [٥]، ئەویش هەموو کاروباری میسری گرتە دەست و ئەسکەندەریە و بەرقەیش چوونە ژێر دەسەڵاتی و ئەمیرەکانی کور ملکەچی و گوێڕایەڵی خۆبان پێشکەشکرد [٦]. بەمە ئیبن تۆلۆن

---

١ـ البلوي: سيرة إبن طولون: ص٤٠.

٢ـ إبن الأثير: ج٥ ٣٢٩.

٣ـ هەمان سەرچاوە.

٤ـ إبن سعيد المغربي: المغرب في حلى المغرب و المشرق في حلى المشرق: ج١ القسم الخاص بمصر ص٧٩،الكندي:ص٢١٧،إبن تغرى بردي:النجوم الزاهرة في ملوك مصر و القاهرة، ج٣ ص٧.

٥ـ إبن الأثير: ج٥ ص٣٦٧.

٦ـ إبن تغري برذي: ج٣ ص٧.

هەموو کاروباری کارگێڕی و دادوەری و سەربازی و دارایی میسری گرتە دەست و دەستی بە تاڵ و کراوە بو و لە هەڵسوکەتدا ئازادی وەرگرت، پاشان کەوتە دەستپێکردنی چەند کارێکی بنیادی کە دەربڕی ئاستی گرنگیدانی زۆری ئەو بو بەو شارە و لەو ڕوانگەوە نیازی دامەزراندنی دەوڵەتێکی تایبەت بە خۆی هەبو کە لە خەلیفە جیابێت، بەردەوام بە گرنگییەوە هەوڵیدەدا فستات پێشبخات تارکەبەری بەغدادی مەڵبەندی خیلافەتی پێبکات [1]. بۆ ئەمەش لەوپەڕی باکووری ڕۆژهەڵاتەوە لە ساڵی (٢٥٧ك/٨٧١ز)دا ناوچە و ئاوایەکی نوێی بۆ دامەزراند کە ماڵ بازاڕ و حەمام و دیوانەکانی حکوومەتی لە خۆدەگرت و لەوێ پارچە زەوی دا بە سەربازەکانی بۆیە ئەو ناوچە بە (قطاع) پارچە زەوی ناونرا. تیایدا مزگەوتێکیشی بنیادنا کە بە ناوی خۆیەوە ناسراوە و تا ئەمڕۆیش ماوە، لە پاڵ مزگەوتەکەیشدا دارولئیمارەی بنیادنا [2]. هەروەك بۆ چارەسەری نەخۆشەکان نەخۆشخانەیەکی دامەزراند و دەرمانخانەیەکیشی پێوەپەیوەست کرد.

ئیبن تۆلۆن لە ڕوانگەی گەشەدان بە سەرچاوەکانی سامان و زیادکردنی داهاتی مەیدانەکانی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی و پیشەسازی و بازرگانیەوە بەرەی ناخۆیی توند و تۆلکردەوە و جۆگەی ئاودانی چاککرد و ئەستێڵی نوێی لێدا، بەستە وێران بوەکانیشی چاککردەوە و پەیڕەوکاری ئەو کەسانەیشی ڕاوەستاند کە لە باج سەندن لە جوتیاراندا کاریان دەکرد. هۆشیاری بە کارمەندان دا سەبارەت بە وەرگرتنی دیاری و ماڵ و سامانی یارمەتیدان و دەستگرۆیی. بەمە باری کشتوکاڵی میسر چاك بوو بازرگانی چالاك بوو بزووتنەوەی پیشەسازی ڕووی لە زیادبون کرد و ستەم لە سەر شانی خەڵك لابرا و خۆشی و کامەرانی هەموو وڵاتی گرتەوە و ئیبن تۆلۆن خۆشەویستی میسریەکانی بە دەستهێنا.

لە ئەنجامی ئەو چاکسازییانەدا ئیبن تۆلۆن ماڵ و سامانێکی زۆری بۆ کۆبویەوە کە لە دامەزراندنی سوپایەکی بەهێزدا کە هۆگری و پشتیوانی بۆی هەبێت و لە بەدیهێنانی پرۆژەکانی و بەرگریلێکردنیدا هاوکاری دا.

---

١ـ زيود،محمد أحمد: العلاقات بين الشام و مصر في العهدين الطولوني و الأخشيدي: ص ٢٦.

٢ـ لين بول: سسيرة القاهرة: ص٨٢.

بەم جۆرە ئیبن تۆلۆن دەرفەتی بۆ لوا تا دەوڵەتێکی جیاخوازی لە میسر دابمەزرێنێت، بەڵام بە هەندێ دیاردەی شێوەییەوە بەردەوام پەیوەستی خیلافەت بو، لەو دیاردانە:

- لە وتاردا نزای بۆ خەلیفە دەکرد.
- ناوی خەلیفە لە سەر دراو دەنەخشێنرا.
- بڕێك لە خەراجی بۆ دارولخەلیفە دەنارد [١].

## پەیوەندی ئەحمەدی کوڕی تۆڵۆن بە خیلافەتەوە

ئەو گرفتە گەورەی بەرەو ڕووی ئەحمەدی تۆڵۆن بویەوە و خەریك بو دەستکەوت و هیواکانی لەناوببات، پەیوەندی بو لەگەڵ موفەق ئەبوئەحمەدی باوکی خەلیفە ئەحمەد موعتەزەددا کە دەستی بەسەر کاروباری گشتی دارولخەلیفە دا گرتبو و بە ئامانجی ڕاپەڕاندنی دەسەڵاتی مەرکەزی و بەهێزکردنی دەسەڵاتی بەسەر ویلایەتەکاندا و لەناو ئەوانیشدا میسر، سەرکردایەتی بزووتنەوەیەکی چاکسازی دەکرد.

بۆیە بەگرنگیەوە هەوڵیدا دەوڵەتی تۆڵۆنی کە لە کارگێڕی مەرکەزی جیابو بویەوە لەناوببات، چونکە دەوڵەتی تۆڵۆنی سەربەخۆیی دەسەڵاتی میسری لەدەست بو و دەیویست بەرەو وڵاتی شامیش بڕوات، بەمە بەڕوونی هەردوولا ڕقیان لە ڕووی یەکتردا نواند. موفەق بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکەی لە دووبارنەدا هەڵوێستی دەنواند:

یەکەم: هەوڵیدا لە ڕێگەی ئەماجوری فەرمانڕەوای وڵاتی شامەوە کە لە چاوچنۆکیەکانی ئەحمەد و خواستی فراوانخوازی لە سەرحسابی ئەو دەترسا، ئیبن تۆلۆن لەسەر میسر لاببات، لەگەڵ ئەوەی خەلیفە موعتەمەد سۆزی بۆ ئیبن تۆڵۆن هەبو چەند دۆستایەتی و بەرژەوەندیەکی هاوبەش پێکەوەی دەبەستنەوە، بەڵام

---

١ـ العبادي: ص١٢٩.

ناچار بو ئەحمەد بانگ بکات بۆ بەغداد و لە میسر دووری بخاتەوە و بیخاتە ژێر چاودێری ڕاستەوخۆی دەسەڵاتەوە[١] و ئیبن مودەبری گێڕایەوە بۆ سەر خەراجی میسر[٢].

ئەماجور نەیتوانی لە ڕووی تۆلۆنیەکاندا بوەستێت و بە شوێن خۆیدا بەرەو وڵاتی شام گەڕایەوە. موسای کوڕی بەغایش کە موفەق ڕاسپارد تا لە دوای شکستی ئەماجور تۆلۆنیەکان ملکەچ بکات، سەرکەوتوو نەبو و شکستی خوارد[٣]. خەلیفە زیاتر لەمە لەگەڵ موفەقدا نەچوو، بەتایبەت کە ڕووداوە سیاسی و سەربازیەکان سەرنەکەوتووی و شکستی ئەو سەرکردانەیان سەلماند کە لە شوێنی ئەحمەدی کوڕی تۆلۆندا دانرا بون تا دەست بەسەر بارودۆخەکاندا بگرن، ئەمە پاڵیپێوەنا تا لەساڵی (٢٦٢ك/٨٧٦ن)دا ئەحمەدی کوڕی تۆلۆن بگێڕێتەوە سەر دەسەڵاتی میسر[٤].

دووەم: موفەق هەوڵیدا ئیبن تۆلۆن لە ناوچەی سەر سنوورە شامیەکان دوور بخاتەوە، بۆ ئەمە تۆلۆنیەکانی بەوە تۆمەتبار کرد کە لە پاراستنی ناوچەکە لە هەڵمەتەکانی دوژمناندا کەمتەرخەمییان نواندووە، بۆیە بڕیار درا تا لە دەرەوەی بنەماڵەی تۆلۆنیدا والی دابنێن[٥]. بەڵام لەبەر ئەوەی تورکەکان دەسەڵاتیان زاڵبو و نەیاندەتوانی بارەکە ئارام بکەنەوە، بۆیە بارەکە نەچسپا، دانیشتوانی ناوچە سەرسنووریەکان هەستیان بەو بۆشاییە سەربازییە و بارگرژییە سیاسیە کرد، ئەمە پاڵی بە دانیشتوانی (لوئلوئە) وەنا تا قەڵاکە بدەن بەدەست بیزەنتیەکانەوە[٦].

خەلیفە بەمە بێزار بو و وای پێباش بو دووبارە ناوچەکە بداتەوە دەست ئەحمەدی کوڕی تۆلۆن[٧]. بەم جۆرە هەوڵەکانی مۆفەق بۆ لەناوبردنی تۆلۆنیەکان

---

١ـ البلوي: ص٥٧.
٢ـ اليعقوبي: ج٢ ص٤٧٤ـ ٤٧٥.
٣ـ إبن الأثير: ج٦ ص١٣.
٤ـ البلوي: ص٥٧، إبن الأثير: ج٦ ص١٣.
٥ـ الطبري: ج٩ ص٥٣٢، إبن الأثير: ج٦ ص١ـ ١٥.
٦ـ إبن سعيد: هەمان سەرچاوە: ص٩١، إبن الأثير: هەمان سەرچاوە.
٧ـ إبن الأثير: ج٦ ص١٥.

سەریان نەگرت و ئیبن تۆلۆن لە ڕەسمی سیاسی وڵاتی شاندا بو بە گرنگترین کاربەدەست و بە هۆی پەیوەندی باشی لەگەڵ خەلیفە و ململانێی لەگەڵ مۆفەقدا توانی وڵاتی شام وێڕای سەر سنووره شامیەکان لە لایەن خەلیفەوە بگرێتە دەست[1].

لە ساڵی (٢٦٤ك/٨٧٧ز)ەوە ئیبن تۆڵۆن بەرەو ناوچەکە کەوتە ڕێ تا بیگرێتە دەست و دەستیگرت بەسەر فەلەستین و دیمەشق و حیمس و حەما و حەلەب و ئەنتاکیە و مسیسە و ئەذنە و تەرسووس و (رقە) دا کە کردی بە مەڵبەندی دەسەڵاتی خۆی تا لە بەغدادەوە نزیك بێت تا ئەوەی ناوچەکانی قەڵەمڕەوی بە تەواوی گەیشتنە سنووری عێراق[2].

بەڵام مۆفەق دانەمرکایەوە و بەردەوام ڕقەبەری و دژایەتی ئیبن تۆلۆنی دەکرد، ئەمجارەیان شێوەیەکی نوێی هەڵسوکەوتی بەکارهێنا کە جەختی لەسەر نانەوەی ئاژاوە و فیتنە لە ناو دەزگاکانی تۆڵۆندا دەکردەوە. لەو بوارەیشدا مەودایەکی دووری بڕی و ئیبن تۆلۆنی پشێو و ڕاڕا کرد.

جا لە ساڵی (٢٦٥ك/٨٧٨ز)دا عەبباسی کوڕی لێی هەڵگەڕایەوە،[3] هەروەك لە ساڵی (٢٦٨ك/٨٨١ز)دا لوئلوئی غوڵامیشی کە فەرمانڕەوای حیمس و حەلەب و قنسرین و دیارموزر و سەرسنووره شامیەکان بو لە دەسەڵاتی[4] دەرچوو لە نێوەندی ئەو ململانێیانەدا، ئیبن تۆڵۆن بۆ ڕێگریکردنی پیلانی مۆفەق شێوەیەکی سیاسی گرتەبەر و دۆستایەتی خۆی و خەلیفە موعتەمەدی قۆستەوە و لە ساڵی (٢٦٩ك/٨٨٢ز)دا داوای لە خەلیفە کرد تا بێت بۆ میسر و لەوێ دابنیشێت تا لە دەستڕۆیی مۆفەقی برای ڕزگاری بێت و بەڵێنی پاراستن و سەرخستنی پێدا لە هەمانکاتدا ناوی مۆفەقی وەك جێگیر لە وتاردا لابرد و ناوی بە هەموو جۆرێك

---

١ـ هەمان سەرچاوە: ص١٨.

٢ـ هەمان سەرچاوە.

٣ـ الطبري: ج٩ ٥٤٥.

٤ـ إبن الأثير: ج٦ ص١٨، إبن خلدون: العبر... المعروف بتأريخ إبن خلدون: ج٣ ص٢٣١.

سرپیەوە بەو بەڵگەیەی لە دەسەڵاتی خۆی زیاتر چووە و سەلاحیاتی خۆی تێپەڕاندووە [١].

خەلیفە چوو بەدەم داواکەی ئیبن تۆلۆنەوە و هەوڵیدا بچێت بۆ میسر، بەڵام وڵاتی مۆفەق پیلانەکەی ئاشکرا کرد و خەلیفەی گێڕایەوە بۆ سامەڕاء [٢]، لە هەمان کاتدا ئیبن تۆلۆن پێشڕەوی کارێکی سەربازی کرد و دەرفەتی سەرقاڵی مۆفەقی بە جەنگی دژ بەزەنجی قۆستەوە و دەسەڵاتی خۆی بەسەر وڵاتی شام و سەرسنوورەکاندا گێڕایەوە و دواتریش بەرەو شام چوو و لە مەککە لەگەڵ هێزەکانی مۆفەقدا پێکیاندادا [٣].

مۆفەق بەرپەرچی هەڵوێستی نەیارەکەی دایەوە و نزا بۆ کردنی قەدەغەکرد و لە سەرمینبەرەکانی نەفرینی لێکرد و بەخراپەکاران ناوی هێنا و لەسەر میسر و شام لایبرد و ئیسحاقی کوڕی کنداجی لە شوێنیدا دانا [٤].

بەوە جۆرە تۆلۆن چەند دەسەڵاتێکی فراوانی بە خۆی بەخشی کە واقیعی ماوەکەی نیشان دەدا و مەودای دەسەڵاتی تورکی نیشاندەدا کە لەگەڵ هێزی سەربازییاندا دەگونجا. ململانێی نێوان ئەو دوانە بویە هۆی لاواز بونی هەریەك لە عێراق و میسر و هەردووکیان لە بەرنگار بونەوەی بوارەکانی تر لە مەیدانی ناوخۆیی و دەرکیدا دەستەوسان وەستان.

لە ڕاستیدا هێزی ئیبن تۆلۆن دایە دواوە و هێزەکەی لە مەککە شکستی خوارد و لە مەسجیدولحەرام نەفرینی لێکرا [٥]، هەروەك لە ژێر فشاری بزووتنەوە هەڵگەڕاوەکاندا لە ناوچە سەرسنوورییەکان پاشەکشی کرد مۆفەقیش لە لایەن خۆیەوە لە بەردەم درێژەدان بەو ململانێیە خۆی بە دەستەوسان دەزانی، لەبەر

---

١ـ الطبري: ج٩ ص٦٢٠ـ ٦٢١، إبن الأثير: ج٦ ص٤٩.

٢ـ الكندي: ص٢٢٥ـ ٢٢٩.

٣ـ إبن الأثير: ج٦ ص٤٩.

٤ـ إبن خلدون: ج٣ ص٦٩٥.

٥ـ الكندي: ص٢٢٩.

ئەوەی هێزەکانی ماندوو بو بون، لە هەمان کاتدا دەیزانی ئەم کارەی لە بەرژەوەندی هێزی ئیسلامیدانیە، بەڵکو لەبەر بەرژەوەندی دوو ئاراستە نەیار و ململانێکارەکەیە، بۆیە هەردوولا بڕیاری لێکتێگەیشتنیان دا.

بە ئامانجی ئاشتەوایی هەردوولا دانوستانیان دەست پێکرد، بەڵام مەرگ ڕێی بە ئیبن تۆلۆن گرت و لە سەرەتاکانی مانگی ذیلقەعدە و لە پێش ئەوەی کۆتایی پێبێت مرد. ئەمە ئەمەش لە ساڵی (٢٧٠ك/٨٤٠) دا بو [١].

## پەیوەندی خەمارەوەیە بە خیلافەتی عەبباسیەوە

لە دوای مردنی ئیبن تۆلۆن سەربازان بەیعەتیان بە خەمارەوەیهی کوڕی دا [٢]. ئەویش ئەرکی بەرگری کردن لەو دەوڵەتەی بۆماوەیەکە باوکی لە میسر دایمەزراند بو و دەبو، دەست بە وڵاتی شامەوە بگرێت بەتایبەت کە خیلافەتی عەبباسی بەردەوام دژ بە تۆلۆنیەکان بو، ئەمیرە تورکە ڕکەبەکانیش چاویان بڕیبویە دەسەڵاتی میسر و شام.

یەکەم ئیش کە خەمارەوەیە کردی ڕێکخستنی کاروباری شام بو، ئەمەش لەبەر گرنگی شام لە پاڵپشتی کردنی دەسەڵاتی لە میسردا، بۆیەك سەرکردایەتی گرنگترین شار و ناوچەکانی دایە دەست بە هێزترین و چاکترین سەرکردەکانی، هەروەك زۆربەی سوپاکەی لە ناوچەی حەلەب بەجێهێشت و هێزێکی سەربازیش نارد کە لە(شیزر) سەنگەری گرت [٣]. لەهەمان کاتدا پەیوەندی بە خیلافەتی عەبباسیەوە کرد تا لەو ناوچانەی بەدەستیەتی دان بە دەسەڵاتیدا بنێت،لە بەرامبەر ئەوەی نزا بۆ خیلافەت بکات و گوێڕایەڵی بێت،بەڵام مۆفەق داواکەی بەرپەرچدایەوە،ئەمەش وایکرد ململانێ و پێکدادانی نێوان هەردوولا بەردەوام بێت [٤].

---

١ـ هەمان سەرچاوە، البلوي: ص٣٠٥، إبن الأثير: ج٦ ص٥٥ـ ٥٦.

٢ـ إبن الأثير: ج٦ ص٥٦.

٣ـ إبن خلدون: ج٣ ص٦٩٩، إبن الأثير: ج٦ ص٥٦، إبن العديم: زبدة الحلب من تأريخ حلب: ج١ ص٨٠.

٤ـ إبن خلدون: ج٣ ص٦٩٩.

موفەق توانی لە هاوپەیمانێتیەتی نەیارە تۆلۆنیەکان و هەندێ سەرکردەی تۆلۆنی کە لێیان هەڵگەڕابونەوە سوپا کۆبکاتەوە و گەرمیان بکات بۆ جەنگ، پاشان بۆ پاڵپشتی ئەم هاوپەیمانێتیە سوپایەکی عەبباسی بەسەرکردایەتی ئەبولعەبباسی کوڕی نارد و هەموویان بەرەو وڵاتی شام چوون.

هێزی هاوپەیمانی چەند سەرکەوتنێکی گەورەی بەدیهێنا لە بەرامبەر کشانەوەی تۆلۆنیەکان لە(ڕقە)و عەواسیەکان (سەر سنوورەکان)و چوونە حەلەب و ئەنتاکیە و دیمەشقیان گرت و فەلەستینیانیان بڕی و گەیشتنە سەر سنووری میسر و چاویان لەسەر میسر بو.

لە ئەنجامی سەرکەوتنەدا، خەمارەوەیە خۆی چوو تا پێشڕەوی هێزە هاوپەیمانیەکان بوەستێتنێت، بەتایبەت لە دوای ئەوەی ئەو هێزەی کە بەسەرکردایەتی واسطی نارد بوی تا ڕێ بە هاوپەیمانان بگرێت دابویە پاڵ هاوپەیمانان، خەمارەوەیە لە ساڵی (٢٧١ك/٨٨٤ز) و لە سەر ڕووباری ئەبوفوترس لە باشووری فەلەستین لە شوێنێك کە بە (تەواحین) ناسراوە لەگەڵ ئەبولعەباسدا پێکگەیشتن و تیایدا خەنارەوەیە شکستی خوارد و بەرەو میسر ڕایکرد، بەڵام سەقامگیری سەعدی سەرکردەی دەرفەتێکی تری سەرکەوتنی پێدا کاتێ هەڵمەتێکی بردە سەر هێزەکانی هاوپەیمانی و بەسەریاندا سەرکەوت و ئەبولعەبباس ڕایکرد و سەرکردەکانیشی کوژران [١]. بە تەواوەتی تۆڵەنیەکان لە وڵاتی شامدا دەسەڵاتیان سەقامگیر بو، خەمارەوەیە لە جەزیرە و موسڵدا درێژەی بەفراوانخوازی خۆی دا تا سنووری دەوڵەتی گێڕایەوە بۆ ئەوەی کە لە ڕۆژانی باوکیدا هەبو کە لە برقەوە بۆ فورات و لە ئاسیای بچووکەوە تا وڵاتی (نوبە) دەبو، دەسەڵاتەکەی ناوچەی ئەرمینیایشی دەگرتەوە [٢]. دەوڵەتی تۆلۆنی بو بە هێزێك کە شیاوی ئەو پایە خۆی بو، لەگەڵ ئەو سەرکەوتنانەی خەمارەوەیە بە دەستی هێنا، کەچی دەستی بۆ ئاشتی درێژ کرد و داوای ڕێککەوتنی کرد [٣]. بەمەیش قۆناغێکی

---

١ـ الطبري: ج١٠ ص٨.

٢ـ محمود، حسن أحمد: حضلرة مصر في العصر الطولوني: ص١١٥.

٣ـ الكندي: ص٢٣٧، إبن تغري بردي: ج٣ ص٥١.

نوێی لە مێژووی پەیوەندیەکانی نێوان تۆلۆنی و خیلافەتی عەبباسیدا کرایەوە. مۆفەق لە لایەن خۆیەوە هەستی بە پێویستی ئاشتی و تەبایی نێوان هەردوولا کرد. خەلیفەیش دەسەلاتی میسر و وڵاتی شامی بە میرات بۆ خۆی و منداڵەکانیشی لە دوای خۆی تا سی (٣٠) ساڵ دا بە خامەرەوەیە بە مەرجێك ئیتر لە سەر مینبەرەکان نەفرین لە مۆفەق نەکات و لە پاڵ ناوی خەلیفەدا نزا بۆ ئەویش بکات[1].

باروددۆخ یارمەتی خەمارەوەیهی دا تا لە دوای مردنی مۆفەق لە ساڵی (٢٧٨ك/٨٩١ز) و خەلیفە موعتەمەد لە ساڵی (٢٧٩ك/٨٩٢ز) دا پەیوەندی خۆی لەگەڵ دارولخەلیفە دا بەهێز بکات، کاتێ موعتەزەد چوویە سەر خیلافەت[2]. بەهۆی ژن و ژنخوازیشەوە پاڵپشتی ئەو پەیوەندییانەی کرد کاتێ خەلیفە قەترونەدای کچی خەمارەوەیهی بە هاوسەر گرت[3]. بەمەیش خێزانی تۆلۆنی قەڵەمڕەوی دەستکەوت. هەروەك خیلافەتیش هاوپەیمانێکی بەهێزی دەستکەوت کە لە پاڵیدا ڕابوەستێت و بە ماددی و سەربازی یاریدەدەری بێت.

---

١ـ هەمان سەرچاوە: ص٥٠ـ ٥١.

٢ـ الطبري: ج١٠ ص٢٠ـ ٢١، ٢٩ـ ٣٠.

٣ـ هەمان سەرچاوە: ص٣٠.

# کۆتایی دەوڵەتی تۆلۆنی

لە ساڵی (٢٨٢ك/٨٩٦ن) دا خەمارەوەیە لەسەر دەستی هەندێ خزمەتگوزاری لە دیمەشق کوژرا،[١] بەمردنی باری دەوڵەتی تۆلۆنی شێوا و دوای ئەوە بە درێژایی دە ساڵی کۆتایی تەمەنی بەرەو داڕمان دەچوو، ئەمەش لە بەر ئەوەی سەربازەکانی کەوتنە دەست تێوەردان و ئەمیرە تۆلۆنیەکانیش لە نێوان خۆیاندا ڕکەبەرییان بو، هەرکە ئەبولعەساکیر جەیشی کوڕی خەمارەوەیە هاتە سەر دەسەڵات، یەکسەر هارونی برای لایبرد پێش ئەوەی نۆ مانگ بەسەر دەسەڵاتیدا بڕوات، دواتر دەرکەوت هاروونیش بۆ دەسەڵات و حوکمڕانی ناشێت[٢].

لەو کاتەدا دوو هێز دەرکەوتن کە لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە هەڕەشەیان لە میسر دەکرد. یەکێکیان هێزی قەرمەتیەکان بو کە سوپاکانی کەوتنە نانەوەی خراپەکاری لە وڵاتی شامدا تا دەستیان بەسەر باشووری شامدا گرت، دووەمیش هێزی عەبیدیەکان بو کە لە مەغریب دامەزرا.

هاروون نەیدەتوانی بەرنگاری ئەو دوو هێزە ببێتەوە و نەیتوانی قەرمەتیەکان لەناو ببات. ئیتر شتێکی دڵنیا بو کە تۆلۆنیەکان ئەو ڕەگەزی هێزەیان لەناو برد کە ئەحمەدی کوڕی تۆلۆن و خەمارەوەیهی کوڕی هەبو و ئەوانیتر بون بە گەمە و یاری بە دەست سەربازانەوە و هیچ بڕوبیانوویەك بۆ مانەوەی دەوڵەتەکەیان نەمایەوە.

خیلافەت عەبباسی هۆشیاری لە لاوازی تۆلۆنیەکان وەرگرت، ئەمە پاڵپێوەنا تا سەر لەنوێ هەوڵی گێڕانەوەی وڵاتی شام و میسر بۆ دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی خۆی بدات. جا خەلیفە موعتەود توانی ناوچەی سەر سنووری و وڵاتی شام لە دەسەڵاتی تۆلۆنی دابڕنێت[٣].

---

١ـ إبن تغري بردي: ج٣ ص٨٨ـ ٨٩.

٢ـ هەمان سەرچاوە.

٣ـ سەبارەت بە ڕووداوەکانی سەر سنوور و کاریگەری لە سەر دەسەڵاتی تۆلۆنی بگەڕێرەوە بۆ: زێود: ص ١٤٠ـ ١٤٧، سەبارەت بە ڕووداوەکانی وڵاتی شام و کاریگەری لە سەر دەسەڵاتی تۆلۆنی بڕوانە: هەمان سەرچاوە: ص١٤٦ـ ١٥٢.

خەلیفە موکتەفیش لەساڵی (۲۹۲ک/۹۰٥ن) دا هێرشکردە سەر میسر، هێزە تۆڵۆنیەکان نەیانتوانی لە بەردەم سوپای عەبباسیدا بوەستێت کە چوویە شاری (قەتائیع) وێرانیکرد، جگە لە مزگەوتە کە نەبێت بەمەیش دەسەڵاتی تۆڵۆنی کۆتایی پێهات و ئەو وڵاتە گەڕایەوە بۆ دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی خیلافەت[۱].

---

۱- إبن تغري بردي: ج۳ ص۱۳٤ـ ۱٤۰.

# دەوڵەتی ئەخشیدی

## ناوی ئەمیرە ئەخشدیەکان و ماوەی میرایەتی و هەریەکەیان:

١ـ موحەمەد ئەخشیدی کوڕی تغج ٣٢٣ـ٣٣٤ك/٩٣٥ـ٩٤٦ز.

٢ـ ئەبولقاسم ئەنووجوری کوڕی ئەخشید ٣٣٤ـ٣٤٩ك/٩٤٦ـ٩٦٠ز.

٣ـ ئەبولحەسەن عەلی کوڕی ئەخشید ٣٤٩ـ٣٥٥ك/٩٦٠ـ٩٦٦ز.

٤ـ ئەبولمیسك کافوور٣٥٥ـ٣٥٧ك/٩٦٦ـ٩٦٧ز.

٥ـ ئەبولفەواریس ئەحمەدی کوڕی عەلی ٣٥٧ـ٣٥٨ك/٩٦٧ـ٩٦٩ز.

# دامەزراندنی دەوڵەتی ئەخشیدی

میسر گەڕایەوە بۆ کۆشی خیلافەتی عەبباسی و ڕاستەوخۆ لە ڕێگەی چەند والیەکەوە کە خۆی دەست نیشانی دەکردن فەرمانڕەوایی میسر دەکرد. بەڵام جارێکی تر لە سەردەمی موقتەدیر دا خیلافەت تووشی لاوازی بو و لە پاراستنی دەسەڵاتی لە ویلایەتەکاندا و لەناویشیاندا میسر دەستەوسان وەستا. بەمەیش ڕکەبەری نێوان والیەکان و بەرپرسانی خەراج دەستی پێکردەوە و بویە هۆی دارمانی باری ناوخۆیی لەگەڵ ئەمەدا مەترسیەکی دەرەکی دەرکەوت کە خۆی لە هەوڵی عەبیدیەکان بۆ هێرشبردنە سەر میسر دەنواند، بارەکە بونی فەرمانڕەوایەکی بەهێزی دەویست کە بۆشاییەکە پڕ بکاتەوە ڕێگە لەو مەترسییانە بگرێت و میسر بکاتە دەوڵەتێکی بەربەست لە بەردەم کشانی فاتیمی بە ئاراستەی ڕۆژهەلات، جا خەلیفە ڕازی لە سالی (٣٢٣ك/٩٣٥ز) دا موحەممەدی کوڕی تغجی کوڕی جفی[1] لەسەر میسر دانا و ئەو ئەرکەی پێسپارد[2].

## پەیوەندی ئەخشیدییەکان بە خیلافەتی عەبباسیەوە

موحەممەدی کوڕی تغج لە سەرەتا و گرنگی بە هێزکردنی مەڵبەندی خۆی لەناوخۆوەدا و سوپایەکی لەسەر پاشکۆی سوپای تۆلۆنی دامەزراند، سیاسەتێکی ئابوری هاوشێوەی سیاسەتەکەی ئیبن تۆلۆنیشی لە بەرنامە و کاریدا گرتە بەر و گەشەسەندنی ئابوری وڵاتی بەدیهێنا و خۆشەویستی میسرییەکانی بە دەستهێنا. توانی ڕێگە لەو شاڵاوە عەبیدییانەیش بگرێت کە لە نێوان ساڵانی (٣١٢_٣٢٤ك/٩٢٤_٩٣٦ز)دا کرانە سەر میسر، لە هەمان کاتدا پەیوەندی باشی

---

١ـ جەڤ باپیری یەکێك لەئەفسەرە تورکەکان بو کە خیلافەت زۆر گرنگی پێوەدان، توغجی و باوکی ئەو کات دەرکەوت کە خزمەتی ئەحمەدی کوڕی تۆلۆنی دەکرد، بنەڕەتی ئەم خێزانە لە فەرغانەیە.

٢ـ إبن تغري بردي: ج٣ ص٢٥١.

خۆی لەگەڵ خیلافەتی عەبباسیدا پاراست،خەلیفەیش وڵاتی شامیشی دایە دەست و نازناوی (ئەخشیدا)ی لێنا و لە سەرمینبەرەکانی شام و میسر لە ساڵی (٣٢٧ك/٩٣٩ز)دا نزای بۆکرا. لەو کاتەدا بەهۆی ململانێ لە پێناو وەرگرتنی پایەی ئەمیری ئەمیران خیلافەتی عەبباسی چەند گەشەسەندنێکی خێرای بەخۆیەوە دی. بجکم لە ساڵی (٣٤٦ك/٩٣٨ز) و لە دوای ئەوەی بەسەر ئیبن ڕاقدا سەرکەوت کە چاوی بڕیبویە میسر و شام تا بەو دوانە قەرەبوی زیانەکانی بکاتەوە، پایەی ئەمیری ئەمیرانی وەرگرت و توانی وابکات خەلیفە ڕازی لەسەر حەلەب و ناوچەکانی سەر بە حەلەب دایبنێت [١].

خەلیفە لە دانانیدا ئامانجی ئەوە بو بەرژەوەندی عەبباسیەکان بەدیبێت کە لەسەر چاندنی تۆوی ناکۆکی نێوان والیەکان دەوەستا، دەربڕی خواستی خیلافەتیش بو بەوەی ڕێگەنەدات لە شام و میسردا قەڵەمڕەوێك دابمەزرێت کە هەڕەشە لە بەرژەوەندیەکانی خیلافەت بکات. لەگەڵ هەڵوێستی جوانی ئیبن تغج دا کە خزمەتی بە بەرژەوەندیەکانی عەبباسی دەکرد، کەچی خیلافەت لە بونی ئەخشیدیەکان لەو ناوچە نزیکانەی عێراقدا دڵنیا نەبو [٢]. بە دوورنیە خیلافەتی عەبباسی ڕائیقی ئاڕاستەی وڵاتی شام کردبێت تا ڕکەبەری ئەخشید بکات و سنوور بۆ دەسەڵات و قەڵەمڕەوی ئەخشید دابنێت [٣].

هەرکە ئیبن ڕائیق خواستە فراوانخوازیەکانی خۆی نەشاردەوە و بەرەو وڵاتی شام پێشڕەوی کردو دەستی بەسەر حیمس و دیمەشقدا گرت و دواتر چوو بۆڕملە و ئینجا عەریش تا هەوڵبدات بچێتە ناو میسر. لێرەدا لە ساڵی (٣٢٨ك/ ٩٤٠ز) لەگەڵ هێزە ئەخشیدیەکاندا پێکیدادا، بەڵام شکستی خوارد و توانی ڕزگاری ببێت [٤]. ئەخشید لەگەڵ ئەوەی سەرکەوتنی بەدەست هێنا، ویستی بەرژەوەندی گشتی

---

١- إبن العديم: زبدة الحلب: ج١ ص٩٩.

٢- زيّود: العلاقات بين الشام و مصر في العهدين الطولوني و الأخشيدي: ص٢٩٣.

٣- كرد علي، محمد: خطط الشام ج١ ص١٨٤_ ١٨٥.

*٤- إبن الأثير: ج٦ ص٢٧٣_ ٢٧٤.*

موسڵمانان بەسەر بەرژەوندی تایبەتی خۆیدا زاڵ بکات و باری داڕماوی خیلافەتی عەبباسی و هەڕەشەی بەردەوامی دەوڵەتەکەی لە لایەن دەوڵەتی عەبیدیەوە لەبەر چاوگرت، ئیبن ڕائیقیش لە لایەن خۆیەوە هەستی بەوە کرد کە بارەکە وا دەخوازێت بە هۆشدا بێتەوە و ڕێککەوتن ببەستێت.

ڕێککەوتن لە نێوان هەردوو لادا بەسترا، بەو پێیە دەبو ئەخشید ناوچەکانی باکووری ڕەملە لە شام بۆ ئیبن ڕائیق بەجێبهێڵێت و بەڵێنی پێدا ساڵانە لە جیاتی ڕەملە بڕی سەد و چل هەزار دیناری پێبدات [١].

دوای دوو ساڵ لە بەستنی پەیماننامەکە ئیبن ڕائیق لە ساڵی (٣٣٠ك/٩٤٢ن) دا لە سەر دەستی ناسیرودەولەی حەمدانی کوژرا [٢]. ئەخشید ئەم دەرفەتی قۆستەوە و بەبێ بەرگرییەك دەستیگرت بەسەر وڵاتی شامدا و بەرەو باکووری پێشڕەویکرد تا گەیشتە سنووری دەوڵەتی حەمدانی، هەروەك مەککە و مەدینەیش چوونە ژێر دەسەڵاتیەوە [٣] و بو بە یەکێ لە گەورەترین هێزەکانی جیهانی ئیسلامی، خەلیفە موتتەقیش ناچاربو تا ویلایەتی موسڵی بۆ بمێنێتەوەو لەسەر وڵاتی شامیش داینا و دانی بە دەسەڵاتیدانا [٤].

دراوسێیەتی دەوڵەتی ئەخشیدی و دەوڵەتی حەمدانی کە چاوی بڕیبویە وڵاتی شام بویە هۆی پێکدادانی ناکۆکی نێوانیان، جا سەیفودەولە لە ساڵی (٣٣٣ك/٩٤٥ن)دا سەرکردایەتی هەڵمەتێکی سەربازی بۆ سەر حەلەب و دیمەشق کرد و خۆی بۆ جەنگی میسریش ئامادە دەکرد، ئەمە پاڵی بە ئەخشیدەوە نا تا خۆی بچێت بۆ وڵاتی شام تا پێشڕەوی حەمدانی بوەستێت [٥].

لەئەنجامی پێکدادانی نێوان هەردوو لا لە قنسرین سەیفودەولە شکستی خواردو ئەخشید چوویە حەلەب و دیمەشق گێڕایەوە، بەڵام دووبارە بەرژەوندی گشتی

---

١ـ إبن تغري بردي: ج٣ ص٢٥٣.

٢ـ مسكويه: ج٢ ص٢٧ـ ٢٨.

٣ـ إبن الأثير: ج٦ ص٢٨٤.

٤ـ هەمان سەرچاوە.

٥ـ إبن الأثير: ج٦ ص٣١٢.

موسڵمانانی لە بەرژەوەندی تایبەتی خۆی لاگرنگتر بو، بۆیە لەگەڵ سەیفودەولەدا ڕێککەوتنی بەست و بەو پێیە دەستی لە حەلەب و باکووری شام هەڵگرت [١].

ئەخشید هەستی بە گرنگی بونی هێزێکی ئیسلامی لە باکووری شام وەك هێزی حەمدانیەکان بۆ ڕێگریکردنی شاڵاوی بیزەنتیەکان بۆ سەر ناوچە ئیسلامیەکان کرد بو، وێڕای ئەوەی ئەخشیدیەکان لە میسر لە ژێر فشارێکی گەورەی دەرەکیدا بون لەلایەن عەبیدیەکانەوە، هەروەك بەرەنگاری هەندێ بزووتنەوەی گێرە شێوێنی وەك بزووتنەوەی غەلبون لە ناوچەی ئەشموونیەکان دەبویەوە [٢]. لە لایەکی ترەوە خیلافەتی عەبباسی نیازی بەرامبەر ئەخشیدیەکان چاك نەبو، بەڵکوو والی دەنارد بۆ وڵاتی شام تا لەوێ هەڕەشە لە قەڵەمڕەوی ئەخشیدی بکەن، بۆیە ئەخشید دەستی بۆ ئاشتی و ڕێککەوتن درێژکرد.

هەروەك چۆن پێشتر ئیبن تولۆن هەوڵیدا مەڵبەندی خیلافەتی عەبباسی بگوازێتەوە بۆ میسر، بە هەمان شێوە ئەخشیدیش لە ساڵی (٣٣٢ك/٩٤٤ن)دا ئەو هەوڵەی دووبارە کردەوە، ئەمەش کاتێك ئەمیرە تورەکەکان نەیاندەهێشت خەلیفە موتتەقی ڕۆڵی هەبێت و حەمدانیەکانیش ئامادە نەبون یارمەتی بدەن، بۆیە خەلیفە ناچار بو پەنا بۆ ئەخشیدییەکان ببات، بەڵام خەلیفە ئامادە نەبو پایتەختی خۆی بەجێبهێڵێت و داواکەی ئەخشیدی بەر پەرچدایەوە [٣]. لەگەڵ ئەوەی ئەخشید لەو کارەیدا سەرکەوتوو نەبو، بەڵام تواتی وا بکات کە خەلیفە دان بە میراتگری میسر بۆ خۆی و نەوەکانی دوای خۆیدا بنێت، هەروەك لە سەر وڵاتی شامیش هێشتیەوە. ئەم دانانەیش لە ساڵی (٣٣٣ك/٩٤٤ن) لە سەردەمی خەلیفە موستەکفیدا نوێ بویەوە و ئەخشید لە هەموو بەشەکانی ویلایەتەکەیدا لە سەر مینبەرەکان کەوتنە نزا کردن بۆ خەلیفەی عەبباسی [٤]. لە ساڵی (٣٣٤ك/٩٤٥ن)دا ئەخشید مرد [١]،

---

١- إبن تغري بردي: ج٣ ص٢٥٥.

٢- الكندي: ص٢٩٦.

٣- الأنطاكي: يحيى بن سعيد: تأريخ الأنطاكي: ص٤٦، إبن تغري بردي: ج٣ ص٢٥٤.

٤- هەمان ئەو دوو سەرچاوەیە.

وەسیەتی کرد تا دوو کوڕە بچووکەکەی(ئەنوجور و عەلی)دەسەڵات بگرنە دەست و کافووری حەبەشی سەرپەرشتیاریان بێت، کافوور وەك وەسی بیست و دوو ساڵ فەرمانڕەوایی میسری کرد تا هەریەك لە ئەنوجور و عەلی لە ساڵانی(٣٤٩ك/٩٦٠ز) و (٣٥٥ك/٩٦٦ز)دا مردن، کافوور دەسەڵاتی گرتە دەست و خیلافەتی عەبباسیش وەك فەرمانڕەوای میسر دانی پێدانا [٢].

کافوور لە ماوەی وەسیەتی دەسەڵاتدا توانی یەکپێزی دەوڵەت بپارێزێت و دژ بە مەترسی حەمدانیەکان لە باکوور و ئەو قەرمەتیانەی شاڵاویان دەبردە سەر باکووری وڵاتی شام و ئەمیرەکانی نەوبە لە باشوور بەرگری لە دەوڵەتەکە بکات، هەروەك بەرەو ڕووی کشانی عەبیدی بەرەو میسر وەستا.

بەڵام عەبیدیەکان بەردەوام شاڵاویان دەهێنایە سەر ئەو وڵاتە، هەروەك بانگخوازەکانیان توانییان لە ناو کۆمەڵگەی میسریدا بانگەوازەکە بڵاوبکەنەوە. خەلیفە موعیزی عەبیدی کافووری بانگکرد تابچێتە ناو دەسەڵاتیەوە، بەڵام کافوور بەلێزانی و ژیری خۆی توانی بە درێژایی سەردەمی دەسەڵاتی شاڵاوی عەبیدی بۆ سەر میسر دوا بخات.

دواتر وا ڕوویدا کە لە دوای مردنی کافوور لە ساڵی (٣٥٧ك/٩٦٨ز) بە هۆی کەمی تەمەنی نەوەکەی و ئەبولخەواریس ئەحمەدی جێگیری و نەبونی کەسایەتیەکی بەهێز لە ناو پیاوانی کۆشکدا کە بتوانێت ئەو بۆشاییە پڕ بکاتەوە کە ئەو بەجێی هێشتبو، لەبەر ئەوە بارودۆخەکان لە میسردا پێکیاندادا.

خەلیفە موعیزی عەبیدی هەستی بە باری خراپی سیاسی و ئابوری میسر کرد و بەهەندی وەرگرت و لە ساڵی (٣٥٨ك/٩٦٩ز) دا دەستی بەسەر وڵاتدا گرت [٣].

---

١- إبن الأثير: ج٦ ص٣١٨.

٢- إبن تغري بردي: ج٤ ص٢.

٣- إبن تغري بردي: ج٤ ص١٨، ٢٤ـ ٢٥.

لە ڕاستیدا قەڵەمڕەوی ئەخشیدی لە دوای مردنی کافورر بەرەو ئاوابون دەچوو، بونی هێزێك کە ئەو بۆشاییە پڕبکاتەوە کە هێزی ئەخشیدی بەجێی هیشتبو بویە پێویستی , پاشان عەبیدیەکان چوونە میسر و شام، ئەمە سەرەتای قۆناغێکی نوێی پەیوەندی مێژوویی نێوان خیلافەتی عەبباسی و عەبیدی بو.

# بەشی نۆیەم

# بارودۆخی دەرەکی دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی

## پەیوەندی لەگەڵ بیزەنتیەکاندا.

بیزەنتیەکان باری خراپی سیاسی ناو دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسییان لەسەردەمی عەبباسی دووەمدا بەهەند وەرگرت تا شالاو ببەنە سەر ویلایەتە ئیسلامیەکان، جەنگی نێوان موسڵمانان و بیزەنتیەکان لەسەردەمی متەوەکیلەوە پەیوەندی بە ململانێی ناوخۆیی نێوان دەسەلاتی بیزەنتی و بەیلەسیەکانەوە هەبو کە بەهۆی ململانێ لەسەر پەرستنی وێنە پیرۆزەکان ململانێیان هەبو.[1] بەو پێیەی بەیلەسیەکان لەسەر دەستی دەسەلاتە بیزەنتیەکانی هەواداری پەرستنی وێنە پیرۆزەکان تووشی چەوساندنەوە دەبونەوە، بۆیە پەنایان بردە بەر پارێزگاری ئەمیری مەلتیە عومەری کوڕی عەبدوڵلای ئەقتەع[2].

لەسێ شاری سەرەکی سەر سنوری ئەرمینیا لەناوچەی شاخاوی (سیواس) دا سەقامگیر بون و شاری)فریق(یان کرد بە پایتەختی خۆیان و)قریباص(ی سەرکردەیان لەو شارەدا نیشتەجێ بو، ئەمان دژ بە بیزەنتیەکان یارمەتی موسڵمانانیان دەدا[3]. هەردوو سەرکردەی ئیسلامی عومەری کوڕی عەبدوڵلای

---

١- مەزهەبی بەیلەسی لەهەموو بەشەکانی ئاسیای بچووك لە فریجیاوە تا ئەرمینیا بلاو بویەوە و شوێنکەوتووانی ئەو مەزهەبە لەگەڵ ئەباتیرە نا ئایقۆنیەکاندا (واتە ئەوانەی دژ بە پەرستنی وێنە پیرۆزەکان بون هەر لە ڕۆژانی قوستەنتینی پێنجەم لە سەدەی هەشتەمی زاینبدا)هاریکاریانکرد بەلام بەپەلە هەر لەکاتی سەرکەوتنی دیدی پالپشتی ئەیقۆنەکان و لەسەردەمی ئیمپراتۆر ئیوفیلی یەکەم و میخائیلی سێیەمی کوڕیەوە دەست بە چەوسانەوەیان کرا. بڕوانە: العرینی / الدولة البیزنطیة: ص ٣٠٠.

٢- فازیلێیڤ: العرب والروم / ص ٢٠٣

٣- Ostrorsky: op.cit. p ١٩٧

ئەقتەعی ئەمیری مەڵتیە و عەلی کوڕی یەحیای ئەمیری تەرسووس لەو قۆناغەدا پێشڕەوی جەنگیان گرتە ئەستۆ، یارمەتی و هاریکاری نێوان هەردوولا[1]، بۆیە هۆی سنووردارکردنی پێشڕەوی بیزەنتیەکان بەڕووی زەویە ئیسلامیەکاندا، لە کاتێکدا لای بیزەنتیەکان ئیمپراتۆر میخائیلی سێیەم و هەردوو سەرکردە بارداس و بترۆناس وەك دوژمنانێکی بەهێز دەرکەوتن و ئەرکی هێرشکردنە سەر موسڵمانانیان گرتە ئەستۆی خۆیان.

جا لەساڵی(٢٤١) ك/٨٥٥ز(دا بیزەنتیەکان شاڵاویان بردە سەر عەین زربە و چی تێدا بو بە دیلیانگرت و لەو ساڵەدا گۆڕینەوەی دیل لەنێوان هەردوولا ئەنجامدرا[2].

لەساڵی(٢٤١ ك / ٨٥٦ز)دا بیزەنتیەکان شاڵاویان بردە سەر زەویەکانی باکوری عێراق و هێرشیان بردە سەر سمیسات و ئامەد و تفریق و دەهەزار موسڵمانیان بەدیلگرت و دواتر گەڕانەوە بۆناو خاکی بیزەنتی، هێزەکانی هاوپەیمانی[3] ڕاوە دوویان نان و ئیمپراتۆر میخائیلی سێیەم زۆر بەسەختی ڕزگاری بو.[4]

ئەو شاڵاوە چاکە بەسەرەتای ماوەیەکی پێکدادانی بەردەوامی نێوان هەردوو لادادەنرێت، جا ئەمیری مەڵتیەو ئەمیری تەرسووس وەك بەرپەرچدانەوەی شاڵاوی بیزەنتیەکان بۆسەر باکووری عێراق، هێرشیانکردە سەر زەویە بیزەنتیەکان هەروەك خەلیفە متەوەکیل لە ساڵی (٢٤٤ك / ٨٥٨ز) دا سوپایەکی ناردو سوپاکە چوویە ناو خاکی بیزەنتی و توانی چەند قەڵایەك فەتح بکات کە گرنگترینیان قەڵای (سمالو) بو[5].

بارودۆخی سەر سنور بەردەوام نا ئاساسی بو و هەردوولا جەنگی پارتیزانیان ئەنجامدەداو موسڵمانان بەسەرکردایەتی عومەری کوڕی عەبدوڵڵای ئەقتەع

---

١ موسڵمانەکان و بەیلەسیەکان.

٢ـ الطبری: ج٩ / ص ٢٠٢.

٣ ـ ئەمیری مەڵتیە و ئەمیری تەرسووس و سەرکردەی بەیلەسەکان.

٤ ـ Bury: hist of eastern roman empire , p.٢٧٩

٥ـ الطبری: ج٩ / ص ٢١٠.

لەساڵی(٢٤٧ك/ ٨٦١ز) لە توقات شکستێکی سەختیان تووشی ئیمپڕاتۆری بیزەنتی کرد و لە ئەنجامدا ڕووچوونە ناو قوڵایی زەویە بیزەنتیەکان و سەرسنورەکانی ئەرمنیان یان وێرانکرد و سامسون یان فەتح کرد کە گەورەترین بەندەری قبادوقیا بو لەسەر دەریای ڕەش.[١]

لە ئەنجامی ئەم رووچوونە ناو ئاسیای بچووك کە بەسەرەتای ئاماژەی مەترسیەکی سەخت بۆسەر ئیمپڕاتۆریەت دادەنرا، ئیمپڕاتۆر کەوتە وەڵامدانەوەی و سوپایەکی گەورەی ئامادەکرد کە دەگەیشتە پەنجا هەزار جەنگاوەر و بەسەرکردایەتی بتروناس بۆ ڕێگریکردنی موسڵمانان ئامادەیکرد، بە تێڕوانین بۆ جیاوازی ژمارەیی نێوان دوو هێزەکە، پایەکانی جەنگی عومەری کوڕی عەبدوڵلا ئامۆژگاری عومەریان کرد تا لەناوچەکە پاشەکشە بکات و لەگەڵ ئەو دوژمنەدا پێکدانەدات کە ژمارەی سەربازانی زۆر زۆرە، بەڵام عومەر بەرپەرچی ئەو ئامۆژگارییەی دایەوە و بڕیاری پێکدادانی لەگەڵ سوپای بیزەنتیدا پێ باشتر بو.

هەردوو سوپا لە بوزون لەنێوان دەریاچەی تاتا و رووباری هالیس پێککەیشتن و بتروناس بە پێی نەخشەیەکی بەهێزی سەربازی گەمارۆی سوپای ئیسلامی داو لەهەموو لاکانەوە چواردەوری گرت، عومەر هەوڵی دا لەو نێوەندەدا ڕێگەیەك بکاتەوە و ڕێگە سەربازیەکان بشکێنێت، بەڵام ئەو کارەی بۆنەکرا و پاش جەنگێکی پاڵەوانانە لەمەیدانی جەنگەکەدا کوژرا[٢] .

لەساڵی دواتر دا عەلی کوڕی یەحیای ئەمیری تەرسووسیش کوژرا، ئەمەش جەنگی میافارقین لەسەرووی فوراتدا بو، ئەو چوو بو تا تۆڵەی عومەری کوڕی عەبدوڵلا بسێنێتەوە.[٣] کوژرانی ئەو دوو سەرکردەیە کاریگەریەکی زۆری لەسەر بزواندنی ڕۆحی جیهادی لەدڵی موسڵماناندا هەبو، بۆیە جەماوەر لە بەغداد و سامەرا چەند ڕاپەڕینێکی جەماوەرییان ئەنجامدا و هاوار لە مزگەوت و جادە و

---

١ ـ Bury: op.cit. p ٢٨٢

٢ـ ڤازیلێیڤ: ص ٢٢٢ – ٢٢٣.

٣ ـ الطبری ج ٩ / ص ٢٦١.

کۆڵانەکاندا بۆ ڕاگەیاندنی جیهاد بەرز بویەوە.[١] لەگەڵ ئەوەی بیزەنتیەکان سەرکەوتن، بەڵام ناوچەکانی سەرسنوور توشی گۆڕانێکی گەورە نەبون، موسڵمانان چەندین قەڵایان دایە پاڵ خەڵکی خۆیان و جێ پێی خۆیان لە قبادوقیا لە ڕۆژهەڵاتی رووباری هالیس دا چەسپاند[٢].

دوای ئەوە بەهۆی نالەباری و تێکهەڵوەشانی دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی لە ئەنجامی دەستگرتنی تورکەکان بەسەر تواناکانی خیلافەت و دامەزراندنی دەوڵەتە جیا خوازیەکان، کشانی ئیسلامی بەرتەسکبویەوە دوای ئەوەیش کاریگەری خۆی لە یەکخستنی سیاسی موسڵمانان لەژێر دەسەڵاتێکی مەرکەزیدا لەدەستدا، لەلایەن خۆیەوە دەوڵەتی بیزەنتی سەردەمێکی نوێی هێز و فراوانخوازی لەسەردەمی بنەماڵەی مەقدۆنیدا بۆ ڕەخسا، بنەماڵەی مەقدۆنی لەنێوان سالانی )٢٥٣ـــ٤٤٨ك / ٨٦٧ـ١٠٥٦ز (دا فەرمانڕەوایی لەدەستدا بو.

ئیمپڕاتۆر باسلی یەکەم دارماوی دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی بەهەند وەرگرت و چالاکی سەربازی خۆی دەستپێکردو قەڵای لوئلوئەی داگیرکرد کە دەکەوتە ڕۆژئاوای شاخەکانی تۆرۆس، پاشان ڕێڕەوە شاخیەکانی داگیر کرد، هەوڵیدا بەیلەسیەکانیش لەناو ببات و لەساڵی(٢٥٨ك/ ٨٧٢ز(لەنێوان سیواس و مەلتیە لەگەڵیاندا پێکیدادا و سەرکەوتنێکی یەکلایی بەسەریاندا بەدیهێناو قەڵاو مەڵبەندیان کە (تفريق) بو وێرانیکرد و خریسوخیروسی سەرکردەیانی کوشت.[٣] لە ئەنجامی ئەم سەرکەوتنەدا بیزەنتیەکان درێژەیان بەکشانیان بەرەو ڕۆژهەڵات دا و لەساڵی دواتردا باسیل بە ئاراستەی هەرێمی فورات چوو و سمیسات و زەبتەرەی داگیر کرد، بەڵام لە مەڵتیە تووشی شکستێکی سەخت بو.[٤]

لەگەڵ ئەوەی بەو سەرکەوتنە جوزئیەوە وەستا، بەڵام توانی دەست بەسەر رووبەرێکی فراوانی وادابگرێت کە لوئلوئە و هەرچی ناوچەی نێوان قەیسرەیە لە

---

١ ـ هەمان سەرچاوە: ص ٢٦٢ ـ ٢٦٣

٢ـBury: op.cit. p ٢٨٥

٣٢١١ـOstrorsky: op.cit. p

٤ ـI bid

باکوری ڕۆژئاوای هەیە تا لەمەرعەش لە باشووری ڕۆژهەڵاتدا بگرێت، ئەم ئیشەی بە سەرەتای قۆناغێکی نوێی ئەو کشان و پێشڕەوییە ڕێکخراوەی دادەنرێت کە ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی لەبەشەکانی ڕۆژهەڵاتدا پێی هەستا.[١] ئەحمەدی کوڕی تۆڵۆن کە کارگێڕی سەر سنورە شامیەکانی لەدەستدا بو، ئەرکی بەرگریکردن لە ناوچە ئیسلامیەکانی گرتە ئەستۆی خۆی و لە قۆناغێکی ململانێکەدا مەترسی بۆسەر بیزەنتیەکان دروستکرد تا لەساڵی (٢٦٥ك/ ٨٧٨ن)دا ئاگر بەستیان لەگەڵدا کرد.[٢] بەڵام دەستە و یەخە و پێکدا هەڵچڕژان لە نێوان هەردوولادا بەشێوەی چەند شاڵاوێکی هەردوولا بەردەوام بو، ئەو ناکۆکیەی لەناو کۆشکی بیزەنتیدا بەهۆی کێشەی زەیجاتی ئیمپراتۆر لیۆی شەشەمەوە ململانێ لەگەڵ موسڵمانانی سەختکرد.[٣] جا لە چواردە ساڵی یەکەمی دەسەڵاتی لیۆی شەشەمدا بیزەنتیەکان بەرەو ڕووی چەند شکست بونەوە لە کیلیکیا و ڕۆژئاوایەوە ئەمە دەرفەتی بۆ موسڵمانان ڕەخساند تا بەدرێژایی کەناراوە بکشێن و بچنە ناو ئاسیای بچووک[٤] سەرکردە نقفور فوکاس کە ئیمپراتۆر بە پەلە بانگیکرد نەیتوانی هەڵمەتە ئیسلامیەکان بوەستێنێت لەگەڵ ئەوەی لەساڵی (٢٨٧ك/٩٠٠ن) لە ئەدەنە سەرکەوتنی بەدەست هێنا[٥].

هەرلایەکیان بەردەوام دەرفەتی لەباری دەقۆستەوە تا هێرش بباتە سەر خاکی ئەوی تر، سەرقاڵبونی خیلافەت بە جەنگی زەنج و قەرمەتیەکانەوە دەرفەتی بۆ بیزەنتیەکان ڕەخساند تا لە ساڵی ٢٩١)ك / ٩٠٤ن)دا شاڵاو ببەنە سەر ناوچە سنوریەکان و لەشارەکانی سەر سنوری شامیدا ئاژاوە و خراپەکاریان نایەوە، موسڵمانانیش بەرەو ڕوویان وەستان و ئەنتاکیەیان فەتحکرد و لەساڵی (٢٩٤ك /

١ـ رمضان: ص ٢٢٣.
٢ـ الطبري: ج٩ / ص ٥٤٥.
٣ـ Camb med hist: I vp ١٤٠
٤ ـI bid
٥ ـ الطبري: ج ١٠ / ص ٧٥ـ ٧٦.

٩٠٧ن) دا گەیشتنە قوستەنتنیە و وێرانیانکرد، بۆیە ئیمپڕاتۆر ناچار بو داوای ڕێکەوتن و ئالوگۆری دیل لەگەڵ موسڵماناندا بکات.[١]

لە ساڵی (٣٠٣ك / ٩١٥ن) دا بیزەنتیەکان لە شۆڕشەکەی حوسەینی کوڕی حەمدانەوە دژ بە بویهیەکان دەرفەتی شاڵاو بردنە سەرسنورەکانی جەزیرە یان وەرگرت و هێرشیان بردە سەر قەڵای مەنسوور و هەموویان بەدیلگرتن و تەرسووس کەوتنە کوشت و بڕی موسڵمانان و لە مەرعەشیش خراپە و وێرانکاریان نایەوە[٢]. لەساڵی دواتردا موسڵمانان بەرپەرچیان دانەوە و بەسەرکردایەتی موئنیسولخادم هێرشیان بردە سەر مەڵتیە وچەند قەڵایەکیان فەتحکرد و بیزەنتیەکان لەساڵی (٣٠٥ك/ ٩١٧ن) دا ناچاربون داوای ئاگر بەست بکەن[٣].

بیزەنتیەکان لەسەر لاوازی خیلافەت لەسەردەمی موقتەدیردا وەستان کە موقتەدیر نەیتوانی یارمەتی سەربازی و چەك بەسەر سنورەکان بگەیەنێت ئیمپڕاتۆر قوستەنتینی حەوتەم وەرگرتی و داوای لەخەڵکی سەرسنوور کر تا سەرانەی پێبدەن و ئەگەر ئەوە نەکەن هەڕەشەی لێکردن.[٤] بەم هۆیەوە بیزەنتیەکان لەساڵی (٣١٤ك/ ٩٢٦ن)دا چوونە ممەڵتیەو لەدوای ئەوەی خەڵکەکەی ڕایانکرد بۆ بەغداد و پەنایان بۆ خیلافەت برد[٥].

دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی لەسەردەمی ئەمیری ئەمیراندا (٣٢٤ـ٣٣٤ك / ٩٣٦ـ٩٤٦ن) بارو حاڵی لەوە باشتر نەبو، بیزەنتەیش لە مەترسی بو بولخاری رزگاری بو بو، بۆیە کەوتە جێبەجێ کردنی نەخشەیەکی هێرش بەری بۆ سەر ڕۆژهەڵات، سەرکردەی ناسراو یوحەننا کورکواس چلامی جێبەجێکردنەکەی گرتە دەست و پێکدادانەکان جەختیان لەسەر ئەرمینیا و سەرووی جەزیرە دەکردەوە[٦].

---

١ـ إبن الأثير: ج ٦ / ص ١٠٩ـ ١١١

٢ـ هەمان سەرچاوە: ص ١٥٢

٣ـ إبن الأثير: ج ٦ ص ١٥٨ ـ ١٥٩

٤ ـ مسكوية: تجارب الأمم: ج ١ / ص ١٤٦.

٥ ـ إبن الأثير: ج ٦ / ص ١٨٢ — ١٨٥.

٦- Ostrorsky: op.cit. p٢٤٤

یەکەم سەرکەوتنێك یوحەننا کورکواس بەدەستیهێنا، دەستگرتنی بو بە سەر مەلّتیەدا کە بەردەوام ئامانجی هەولّە یەك لەدوای یەکەکانی بیزەنتی بو بەو پێیەی پێگەیەکی گرنگی ستراتیژی هەبو، بەلاّم کورکواس کەسایەتی سەیفو دەولەی حەمدانی کە ئەو کات سەرکردایەتی جیهادی ئیسلامی روون بەسەر سەرکردەی بیزەنتی لەناوچەی بەرزاییەکانی جەزیرە و لەنێوان قەلاّی زیاد و قەلاّی سەلامدا بەدەست بهێنێت[1]، پاشان هێرشیکردە سەر ئەرمینیا و ژمارەیەك لە ئەرمەنەکان ناچاربون دان بەدەسەلاّتیدا بنێن، لەئەرمینیای بیزەنتیدا خۆی نواند و لەساڵی (۳۲۹ك/ ۹٤۱ز) دا بەرەکانی دەوروبەری کولونیای وێرانکرد.ئامانجی سەیفودەولە ئەوە بو رێگە بە بیزەنتە نەدات دەسەلاّتی خۆی بەسەر ئەرمینیا دا بسەپێنێت و ئەو زەوی و خاکانە بگێرێتەوە لە هەرێمی جەزیرە لە موسڵمانانی سەند بو[2].

لەبەرئەوەی چەند ململانێیەکی ناوخۆیی لەدارولخیلافەدا روویدا و بویە هۆی پێکدادانی نێوان حەمدانی و ئەخشیدیەکان، ئەمە رێگەی بەسەیفودەولە نەدا تا لەجەنگی دژ بە بیزەنتەدا بەردەوام بێت، کورکواس ئەو بارەی قۆستەوە و دەستی بەجەنگ کرد و لەساڵی ۳۳۰)ك/ ۹٤۲ز(دا هێرشی بردە سەر حەلەب و لەساڵی دواتردا دەستیگرت بەسەر میافارقین و ئامەد و داراو نسیبین و چوویە ئەرزن و گەمارۆی رەهای داو لەساڵی ۳۳۲)ك/ ۹٤٤ز(دا) رەئسولعەین(ی سوتاند.[3]

بەهۆی هەولّی کورکواسەوە درێژبونەوەی خاکی بیزەنتی بەرەو رۆژهەلاّت زیادیکرد و بیزەنتە لە ئاسیای بچووکدا پایەو شانوشکۆی پەیدا کرد، ئەمە رێگەی بۆ ئەو هێرشە فراوانە ئاسانکرد کە دواتر ئیمپراتۆر نقفور فوکاس و یوحەننا زمسکیس پێی هەڵسان.

کاتێك باری دوژمنایەتی نێوان حەمدانەکان و ئەخشیدیەکان کۆتایی پێهات، سەیفودەولە دەستی کرایەوە تا رێگە لە بیزەنتیەکان بگرێت و بۆ جەنگی بیزەنتیەکان دەستی بەتاڵبو.

---

۱ ـ arand , m: histore dela dynasite de hamdanides de jaziraet de syrie I p ۷٤۳

۲ـ العرینی: ص ٤٠٥

۳ـ الأنطاکی / یحیی بن سعید: تاریخ الأنطاکی / ص ٤١ ـ ٤٤.

# سەردەمی عەبباسی سێیەم

## سەردەمی قەڵەمڕەوی بوەیهی فارسی

## ( ٣٣٤ــ٤٤٧ ك / ٩٤٦ــ١٠٥٥ز)

### خەلیفەکانی سەردەمی عەبباسی سێیەم و ماوەی خیلافەتی هەریەکەیان :

ــ ئەبولقاسم عەبدوڵڵا موستەکفی ٣٣٤ــ ٣٣٣ ك/ ٩٤٦ – ٩٤٤ز.

ــ ئەبولقاسم فەزڵ موتیع ٣٣٤ــ٣٦٣ك / ٩٤٦ــ٩٧٤ز

ــ ئەبوبەکر عەبدلکەریم تائیع٣٨١ــ ٣٦٣ك/٩٩١ – ٩٧٤ز.

ــ ئەبولعەباس ئەحمەد قادر٤٢٢ــ ٣٨١ / ١٠٣١ــ ٩٩١ز.

ــ ئەبوجەعفەر عەبدوڵڵا قائیم ٤٦٧ــ ٤٢٢ك /١٠٧٥ــ ١٠٣١ز.

### ناوی ئەمیرە بوەیهیەکان و ماوەی میرایەتی هەریەکەیان[١] :

### أ. لە فارس:

١.عیمادو دەولە ئەبولحەسەن عەلی کوڕی بوەیە ٣٢٠ــ٣٣٨ك/ ٩٣٢ــ٩٤٦ز

٢.عەزد و دەولە ئەبوشوجاع خەسرەو ٣٣٨ــ ٣٧٢ك/ ٩٤٦ــ ٩٨٢ز

٣.شەرەفودەولە ئەبولفەرواریس شێرزاد ٣٧٩ــ ٣٧٢ك /٩٨٩ــ ٩٨٢ز

٤.سماسمودەولە ئەبوکالیجار مەرزەبان ٣٨٨ــ ٣٧٩ك / ٩٩٨ــ ٩٨٩ز

٥.بەهائو دەولە ئەبونەسر٤٠٣ــ ٣٨٨ ك / ١٠١٢ــ ٩٩٨ز

---

١ـ بروانة: تاريخ ايران بعد الإسلام، عباس إقبال: ص ٩٣ — ٩٥

٦.سوڵتانودەولە ئەبوشوجاع ٤١٥ـــ ٤٠٣ك / ١٠٢٤ـــ ١٠١٢ز

٧.عەزدو دەولە ئەبوكاليجار مەرزەبان٤٤٠ـــ ٤١٥ك / ١٠٤٨ـــ ١٠٢٤ز

٨.مەليك ڕەحيم ئەبونەسر خەسرەو فەيرووز ٤٤٧ـــ ٤٤٠ك / ١٠٥٥ـــ ١٠٤٨ز

## ب. لە عێراق و ئەهواز و كرمان:

١.موعيز و دەولە ئەبولحوسەين ئەحمەد ٣٥٦ـــ ٣٢٠ك/ ٩٦٧ـــ ٩٣٢ز

٢.عيزو دەولە بەختيار٣٦٧ـــ ٣٥٦ك/ ٩٧٧ـــ ٩٦٧ز

٣.عەزدو دەولە ئەبوشوجاع خەسرەو٣٧٢ـــ ٣٦٧ك/ ٩٨٢ـــ ٩٧٧ز

٤.شەرەفودەولە ئەبولفەواريس شێرزاد٣٧٩ـــ ٣٧٢ك/ ٩٨٩ـــ ٩٨٢ز

٥.بەهائودەولە ئەبونەسر ٤٠٣ـــ ٣٧٩ك/ ١٠١٢ـــ ٩٨٩ز

٦.سوڵتانو دەولە ئەبوشوجاع ٤١٢ـــ ٤٠٣ك/ ١٠٢١ـــ ١٠١٢ز

٧.موشريفو دەولە ئەبوعەلی ٤١٦ـــ ٤١٢ك/ ١٠٢٥ـــ ١٠٢١ز

٨.ئەبوتاهير جەلالو دەولە ٤٣٥ـــ ٤١٦ك/ ١٠٤٣ـــ ١٠٢٥ز

٩.ئەبوكاليجار مەرزەبان ٤٤٠ـــ ٤٣٥ك/ ١٠٤٨ـــ ١٠٤٣ز

١٠.مەليك ڕەجيم ئەبونەسر خەسرەو فەيروز ٤٤٧ـــ ٤٤٠ك/ ١٠٥٥ـــ ١٠٤٨ز

## ج. لەڕەی و ئەسفەهان و هەمەدان :

١.ڕوكنودەولە ئەبوعەلی حەسەن ٣٦٦ـــ ٣٢٠ك/ ٩٧٦ـــ ٩٣٢ز

٢.موئەيدو دەولە ئەبومەنسوور ٣٧٣ـــ ٣٦٦ك/ ٩٧٦ـــ ٩٨٣ز

٣.فەخرو دەولە ئەبولحەسەن عەلی ٣٨٧ـــ ٣٧٣ك/ ٩٩٧ـــ ٩٨٣ز

٤.شەمسودەولە ئەبوتاهير( تەنها لە هەمەدان٣١٢ـــ ٤٨٧ك/ ١٠٢٩ـــ ٩٩٧ز

٥.مەجدو دەولە ئەبوتاليب ڕۆستەم ) تەنها لە ڕەی ٤٢٠ـــ ٣٨٧ك/ ٩٩٧ـــ ١٠٢٩ز

٦.سەمائو دەولە ئەبولحەسەن ) تەنها لە هەمەدان ٤١٤ـــ ٤١٢ك/ ١٠٢٣ـــ ١٠٢١ز

# بەشی دەیەم

# خیلافەتی عەبباسی و بوەیهیەکان

## (دامەزراندنی دەوڵەتی بوەیهی):

سەردەمی عەبباسی سێیەم بەرچەکردارێکی دژ بە قەڵەم ڕەوی تورکی بەخۆوە بینی کە لە سەردەمی عەبباسی دووەمدا دەستی بەسەر تواناکانی خیلافەتی عەبباسیدا گرتبو، ئەمەش بزووتنەوەیەکی شیعی زەیدیدا[1]، خۆی نواند بۆ گێڕانەوەی ئەو دەربڕینەی لەماوەی سەدەی سێیەمی کۆچیدا پاشەکشەی کرد، ئەو سەردەمە لە دیاردەکانیدا لەڕووی جەختکردنەوە لەسەر ڕۆژهەڵات جیاوازی لەسەردەمی عەببسی دووەم هەبو.

بوەیهیەکان لەسەرەتاکانی سەدەی چوارەمی کۆچی لەسەر شانۆی ڕووداوەکان دەرکەوتن [2] و لە فارس و ئەهوازو کرمان و ڕەی و ئەسفەهان و هەمەدان چەند دەوڵەتێکی جیاخوازیان دامەزراند و هەژموونی کرداری خۆیان بەسەر عێراقدا بڵاوکردەوە و لەدەسەڵاتی خیلافەتی عەبباسیدا بەشداریانکرد و قەڵەمڕەویان زیادیکرد تا ئەوەی یەکێك لەسەردەمەکانی خیلافەتی عەبباسی بەناوی ئەوانەوە ناونرا.

ئەو خێزانە لە باکوور لە وڵاتی دەیلەمی ناوچەی هاوسنوری دەریای قەزوینەوە کۆچیانکرد و لەسەر دەستی برای گەورەی سێ برا بوەیهیەکان ناوی دەرکرد کە

---

١ـ لەگەڵ ئاماژەمان بەوەی بوەیهیەکان لە بنەرەتێکی فارسی نین و ڕەگەزی دەیلەمییان پێکدەهێنا کەلە باشووری دەریای قەزوین نیشتەجێ بو دەنواند پێدەچێت تێکەڵیەکی ئێرانیەکان و تورکەکان و چەند گەلێکی تر بون ناوچەکەیان بەشی شاخاوی جیلانی پێکدەهێنا کە لەباشورە وە ویلایەتی قەزوین و لەڕۆژهەڵاتەوە ناوچەی جالوس هاوسنوری بو.

٢ـ سەبارەت بە باری سەرکەوتنی خێزانی بوەیهی بگەڕێرەوە بۆ: مسکویە: ج١ / ص ٢٧٥ — ٢٧٩.

ئەویش عەلی کوڕی شوجعی بوەیە بو کە مرداویجی زیاری[1] وڵاتی کەرەجی دایە دەست[2].

عەلی چەند دیدێکی هەبون کەلەسەربەخۆبونەوە بەرەو فراوانخوازی لەسەر حیسابی دراوسێکەی دەچوون، وێڕای ئەو خواستە سیاسیەی کە بەخێرایی بۆی هاتە دی ولەو ناوچانەدا بویە خاوەنی شانوشکۆ و بەسیاسەتی چاکی خۆی خەڵکی بەلای خۆیدا ڕاکێشا و بەهۆی توانای سەربازی و کارگێری و ڕێزو هەڵوێستی جوانی لەگەڵ شوێنکەوتەکانیدا توانی سوپایەکی بەهێز دابمەزرێنێت لەماوەیەکی کەمدا زۆربەی وڵاتی فارسی پێکرت و شاری شیرازی کردە بنکەی دەسەڵاتەکەی[3].

عەلی بەشێوەی روخساری بەناوی خەلیفەوە دەستبەسەرئەو وڵاتە داگرتبو، بەڵام لەناوەڕۆکدا ئامانجی دامەزراندنی دەوڵەتێکی تایبەت بەخۆی بو و لاوازی سیاسی و سەربازی خیلافەت و دەستەوسانبونی لە دەستوەردانە ئەو ناوچانە بۆ ڕێککردنی بارودۆخەکانی بەهەند وەرگرت[4]. پاشان نوێنەری بۆلای خەلیفە ڕازی ناردو داوای لێکرد تادان بەدەسەڵاتیدا بنێت.[5] ئەمەش شتێکی سروشتی بو، چونکە ئەودەبو لایەنی خیلافەت دڵنیا بکات چونکە دەستی بەسەر ویلایەتێکی خیلافەتدا گرتبو، لەگەڵ ئەوەی خیلافەت ڕازی بو بۆیە ویستی دەسەڵاتەکەی سیفەتێکی شەرعی وەربگرێت، ئەمەشی بۆ هاتە دی[6].

پاشان لای دایەوە بەسەر بەلای مرداویجدا و هەوڵیدا ڕەزامەندی ئەویش پێشنیاری بۆکرد تا بچێتە ژێر قسەو گوێڕایەڵی ئەوەوە و لەناوچەکانی ژێر دەسەڵاتیدا وتاری بۆ بخوێنێتەوە، مرداویجیش پێشوازی لەو پێشنیارەکرد و لەسەر

---

١- دامەزرێنەری دەوڵەتی زیاری جیاخوازی لە تەبەرستان لەساڵی ٣١٦ ك دابو.

٢- کەرەج شارێکە لەنێوان هەمەدان و ئەسفەهان لە نیوەی ڕێدا. یاقوت: ج ٤ / ص ٤٤٦: مسکویە: ج١ ص ٢٧.

٣- إبن الأثیر: ج ٦ / ص ٢٣٤ — ٢٣٥.

٤ - إقبال: ص ٤٠.

٥ - إبن الأثیر: ج ٦ / ص ٢٣٥.

٦ - هەمان سەرچاوە.

ئەرجان داینا عەلیش حوسەینی برای وەك بارمتە[1] نارد بۆلای مرداویج تا ببێتە زامنی چاك پەیرەو کردنی کارەکەی.

سەبارەت بەپەیوەندی نێوان ئەو و خیلافەتی عەبباسی لەو ماوەیەدا، بەپێی ئەو دانانە دیاری دەکرێت کە خەلیفە بۆی نارد، بەڵام خەلیفە هەوڵیدا شانوشکۆی خۆی بگێڕێتەوە، بۆیە سوپایەکی نارد و سوپاکە گەیشتە دەوروبەری فارس، بەڵام لەدوای جەنگی ئەرجان لەساڵی ٣٢٣) ك/ ٩٣٥ز(دا بەشوێن خۆیدا گەڕاێنراوە[2] و عەلی کوڕی بوەیهیش لەناوچەکەدا جێ پێی خۆی سەپاند و لەوێ دەوڵەتەکەی خۆی دامەزراند.

بارودۆخ لە بەرژەوەندی بوەیهیەکاندا بو، جا لەساڵی (٣٢٣ك/ ٩٣٥ز) دا مرداویج کوژرا، عەلی ئەو دەرفەتەی قۆستەوە و دەستی بەسەر وڵاتی شاخدا گرت کە لەژێر دەسەڵاتی وشمکیری زیاری برای مرداویجدا بو و حەسەنی برای کە لەدوای کوژرانی مرداویج ڕایکرد بو بۆ عێراق نارد بۆ ئەوێ و ئەویش دەستیگرت بەسەر ئەسفەهان و ڕەی و هەمەدان و کەرەج و بەشەکانی تری وڵاتی عێراقی عەجەمیدا و ئەبولفازڵی کوڕی عەمیدی کرد بەوەزیری خۆی[3].

دوای ئەوە عەلی کوڕی بوەیە هەوڵیدا سنوری ئەو هەرێمانە دڵنیا بکات کە دەستی بەسەرداگرتیوون و سیاسەتەکەی ئەوەی دەخوست پێش ئەوەی بچێتە عێراق کە جێی مەبەستی بو، دەستبگرێت بەسەر کرمان و ئەهوازدا، بەو پێیەی ئەو دوو هەرێمە بەڕێرەوێکی سروشتی هەر شاڵاوێك بۆسەر هەرێمی فارس دادەنرێت، ئیتر لە بەرەی ڕۆژهەڵاتەوە بێت یان لە باکورەوە.

بۆیە ئەحمەدی برای بەهێزێکی سەربازیەوە نارد و لەساڵی (٣٢٤ك/٩٣٦ز) و لەدوای جەنگی قەنتەرە[4] دەستیگرت بەسەر کرماندا ودایە پاڵ خاکی بوەیهیەکان

---

١ ـ هەمان سەرچاوە: ص ٢٣٩.

٢ـ ئەو سوپایە بەسەرکردایەتی یاقووت بی.

٣ـ إبن خلكان: ج ٢/ ص ١١٨.

٤ ـ إبن الأثير: ج ٦/ ص ٢٥٥ — ٢٥٦.

دواتر دەستیگرت بەسەر ئەهوازدا[١].

خیلافەتی عەبباسی بەرامبەر ئەو گەشەسەندنە سیاسی و سەربازییانە دەستەوەسان نەوەستا، بۆیە ململانێی بوەیهی - زیاری یەی بەهەند وەرگرت و هەوڵیدا ئەهواز بگێڕێتەوە بۆیە بەسەرکردایەتی بجکم چەند هێزێکی نارد تا بیگێڕێتەوە و بوەیهیەکان لەوێدا ڕاوەدوو بنێت، ئەویش لەسەر سنوری ئەهواز لەنزیك عێراق وەستا تا دەرفەتی چوونە ناوەوە بقۆزنەوە، بەڵام سەرکردەی عەبباسی لەژێر فشاری ڕووداوە سیاسیەکان و دوای ئەوەی بوەیهیەکان بەرەو سەرکەوتن چوون، ناچار بو پاشەکشە بکات لە ئەنجامی ئەمەدا ئەهواز کەوتە دەستی بوەیهیەکان و ئەوانیش ئەهوازیان دایە پاڵ خاکی خۆیان.[٢] لە ئەنجامی ئەم گەشەسەندنەدا لەگەڵ خواستی فراوانخوازییاندا هەوڵی بەرفراوانکردنی بنکەی خۆیاندا و لە ئەهوازەوە چوون بۆ عێراقیان شتێکی ئاسان بو، ئیتر چاودێری ڕووداوەکانی پایتەختی خیلافەتیان دەکرد تا دەرفەتی چوونە ناو پایتەختی خیلافەتیان بۆ بڕەخسێت.[٣]

لە ئەنجامی توند بونی ناکۆکیەکانی نێوان ئیبن ڕائیقی والی بەسرەو ئەمیری ئەمیران لەلایەك و نێوان ئەبوعەبدوڵلای بەریدی والی پێشووی ئەهواز لەدەست هێزەکانی خیلافەت ڕایکرد بو لەلایەکی ترەوە باری عێراق پشێو و نالەباربو، ئەبوعەبدوڵلای بەریدی پەنای برد بۆ لای عەلی کوڕی بوەیە و هانیدا تا بچێتە ناو عێراق، لەلایەکی ترەوە خیلافەت لەژێر قەڵەمڕەوی تورکەکاندا بو و نەیدەتوانی کاروباری عێراق سەقامگیر بکات، خەڵکیش هەستیان بەو بۆشاییە سیاسیەو شکستی ئەمیری ئەمیران دەکرد، هەروەك لەئەنجامی کار هەڵسوڕاندن و چاوچنۆکی تورکەکان دارایی گشتی دەوڵەت داڕما وخەزێنەکانی خیلافەت خاڵی بونەوە و خەلیفەکان لەبارێکی سەختی دارایدا بون.

---

١ ـ هەمان سەرچاوە: ص ٢٦٣ — ٢٦٤

٢ـ هەمان سەرچاوە.

٣ ـ محمود والشریف: ص ٥١٢.

لە ئەنجامی ئەمەدا خەڵك روویانکردە ئەو هێزە نوێیەی کەلەنزیکیانەوە دەرکەوت و شیاوێتی خۆی سەلماند تا ئەو پشێوییە لاببەن، هەروەك هەندێك لە سەرکردە کەدەسەلاتیان لێسەندرابویەوە پەنایان بۆ هێزی دووری بوەیهیەکان برد بەو هیوایەی بەو هۆیەوە ئەو دەسکەوتانەیان بۆ بگەڕێتەوە کە لێیان بێبەش کرابون یان لێیان دوورخرابونەوە لەکۆتاییدا خەلیفە موتتەقی داوای یارمەتی لە بوەیهیەکان کرد تا سنورێك بۆ ململانێی ناوخۆیی نێوان ئەمیرەکان دابنێن، بەتاییەت لەدوای ئەوەی پەیوەندی نێوان خەلیفەو نێوان تورزون خراپبو.

خەلیفە ئەحمەدی کوڕی بوەیهی بانگکرد و داوای لێکرد بێتە بەغداد، هەروەك هەندێك سەرکردەیش هەمان داوایان لێکرد، ئەویش لەساڵی (٣٣٢ك/٩٤٤ن) دا کەوتە ڕێ بەرەو بەغداد و لەساڵی ٣٣٤)ك/ ٩٤٥ن) و لەدوای دەرکردنی تورکەکان لەوێ چوویە ناوی و خەلیفە موستەکفی پێشوازی لێکرد و ڕیزی گرت و ئاهەنگی بۆ گێڕا و بۆشاکی کردە بەرو وەك ئەمیری ئەمیران دەستنیشانیکرد و نازناوی موعیزو دەولەی لێناو نازناوی عیمادو دەولەی لە عەلی برای و روکنودەولەی لە حەسەنی برایشی نا[١]. دواتر ئەو نازناوە گەورانە بون بەناوی ئەمیرە بوەیهیەکان.

بەم جۆرە بوەیهیەکان لە فارس و عێراق و ئەهواز و کرمان و ڕەی و هەمەدان و ئەسفەهاندا چەند دەسەلاتێکی میراتگری یان دامەزراندکە تا ساڵی (٤٤٧ك/١٠٥٥ن) بەردەوام بو ئەو نیزامی میراتگرییە بو بەهۆی بەدیهاتنی جۆرێك لە سەقامگیری سیاسی لە دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسیدا کە تیایدا بوەیهیەکان دەستیان بەسەر کاروبارەکاندا گرتبو و بە شێوەیەکی ڕەها هەڵسوکەوتیان دەکرد، بەلام ئەم سەقامگیرییە لە ئەنجامی ململانێی مەزهەبی بەهۆی شیعە گەرایی بنەماڵەی بوەیهیەکانەوە هەندێ بارگرژی بەخۆیەوە دەبینی.

---

١ـ إبن الأثير: ج٦ / ص ٢٦٣ – ٢٢ـ ٢٩٥ـ ٢٩٦ـ ٣١٤.

# پەیوەندی خیلافەتی عەبباسی بە بوەیهیەکانەوە

وا چاوەڕوان دەکرا بوەیهیەکان بە سەپاندنی دەسەڵاتیان بەسەر خیلافەتدا سەقامگیری و یەکبونی هەرێمەکانی خیلافەت بگێڕنەوە و سەروبنی سەربازانیان بکەن و دەرفەت لەبەردەم خیلافەتدا بکەنەوە تا بەرپرسیارێتیەکانی خۆی لە ئەستۆ بگرێت و لە ئاژاوە نانەوەی مەزهەبی بەدووربن، کەچی ئەمە نەهاتە دی چونکە بوەیهیەکان بە گیانی دوژمنکاری بەرامبەر خەلیفە عەبباسیەکان کە لە مەزهەبدا پێچەوانەی یەکتر بون چوونە ناو بەغداد، موعیزو دەولە دوای چوونە ناو بەغداد و دەستگرتنی بەسەر کاروباری بەغداد، بیری لە هەڵوەشاندنەوەی خیلافەتی عەبباسی و دامەزراندنی خیلافەتێکی شیعی لە شوێنیدا و دانانی یەکێك لەسەرکردە شیعە زەیدیەکان کردەوە.[1]

دەیتوانی ئەو کارەیش بکات، بەڵام لەدوای ڕاوێژکردن بەهاوەڵەکانی ئەو کارەی نەکرد، چونکە گۆڕانی لەو جۆرە شڵەژان و شەکانێکی سەخت تووشی جیهانی ئیسلامی دەکات، وێڕای نالەبار بونی دەسەڵاتی بوەیهیەکان پاشان شیعەکانی عێراق کە موعیزو دەولە هەوڵیدا بەلای خۆیدا ڕایانبکێشێت لەسەر مەزهەبی ئیمامی بون، ئەمەش واتە دانانی خەلیفەیەکی زەیدی لەدیدی ئەواندا هەروەك خەلیفەیەکی عەبباسی وایە، بۆیە موعیزو دەولە لە ڕوانگەی بیرتیژی سیاسیەوە بۆی دەرکەوت هێشتنەوەی خیلافەتی عەبباسی باشترە تا ڕێبازی زەیدی پەیڕەو بکات کە پێی وایە (دروستە کەسی کەم فەزڵ لەگەڵ بونی خاوەن فەزڵدا پێشەوایەتی بکات) لەسەر ئەم بنەڕەتەی کە ڕێبازی زەیدی ڕێی پێدا بو و لەسەر بنەڕەتی بەرژەوەندی سیسی ڕێی بەوەدا کە پشتیوانی بۆ خەلیفەیەکی سوننە مەزهەب هەبێت[2].

بەڵام سیاسەتێکی گرتە بەر کە دەسەڵاتی خەلیفەی سنوردار دەکرد و لە

---

١ ـ موعیزولدەولە لە دانانی ئەبولحەسەن موحەممەدی کوڕی یەحیای زەیدیدا راوێژی بە هاوەڵەکەی کرد

٢ـ إبن الأثير: ج ٦ / ص ٣١٥، بڕوانە پەراوێزی ژمارە (٢) ص ٣١٥ — ٣١٦.

بەرامبەردا قەڵەمڕەوی خۆی بەهێز دەکرد.

سەردەمی بوەیهی لەڕووی ماوەی فەرمانڕەوایی خەلیفەکانەوە جۆرێك لە سەقامگیری سیاسی بەخۆیەوە دی، خەلیفەکان پێش ئەوەی لاببرێن چەندین ساڵ دەسەڵاتیان دەگرتە دەست، لەوانە : خەلیفە موتیع ماوەی بیست ونۆ ساڵ دەسەڵاتی گرتە دەست) ٣٦٣ــ ٣٣٤ك/ ٩٧٤ــ ٩٤٦ز(تائیع (١٨) ساڵ (٣٦٣ــ٣٨١ك / ٩٧٤ــ٩٩١ز) قادر (٤١) ساڵ (٣٨١ - ٤٢٢ك / ٩٩١ - ١٠٣١ز) هۆکاری ئەمەش ئەوەیە کە پایەی ئەمیری ئەمیران کە بوەیهیەکان دەیانگرتە دەست هەموو سەختی و ئەرکەکانی دەسەڵاتی دەگرتە دەست و لەژێر سایەیدا بوەیهیەکان لەعێراقدا هەموو هەڵسوکەوتێکیان لەدەستبو لە بەرامبەر بەردەوامی سنوردارکردنی قەڵەمڕەوی خەلیفەدا کەبو بو بەهێمایەك و هیچ لەکاروباری لەدەستدا نەبو تا بتوانێت ڕکەبەری کەسی لەسەر بکات و تەنها کاری شەرعیەتدان بو بەکاورباری بوەیهیەکان.

زۆرێك لە مێژوونوسان باس لەوە دەکەن کەی بوەیهیەکان خەلیفە عەبباسیەکانیان زەلیل کردوون و دەسەڵاتیان لێسەندوون و هەندێك جار دەستدرێژیان کردۆتە سەر کەسایەتیان و خیلافەت لەسەردەمی ئەواندا شانوشکۆی خۆی لەدەستداوە و لاواز بوە خەلیفە گەمەیەك بوە بەدەستیانەوە و هێمایەکی ئایینی دەنواند و تەنها ناوی هەبو و دەسەڵاتی نەبو، دەسەڵاتی کرداری ناو دەوڵەتیش لەدەستی ئەمیری بوەیهیدا بو[١].

لە ڕاستیدا بوەیهیەکان هۆکاری ڕاستەوخۆی لاوازکردنی خیلافەتی عەبباسی و لەدەستدانی شانوشکۆی نەبون[٢] بەڵکو ئەوان بەسەر بارێکدا چوون کە پێش ئەوان دەستپێکردبو لەوکاتەدا خەلیفە وەك سەرچاوەی یەکەمی دەسەڵاتی دەوڵەت

---

١ـ محمود و الشریف: ص ٥٢٤.

٢ـ بەڵکو بوەیهیەکان مایەی لە پەلوپۆخستنی خیلافەتی عەبباسی بون و لەهەموو لایەکەوە دەوڵەتیان دواخست چونکە بەچاوی دوژمنەوە سەیریان دەکرد تا خوای گەورە سەلجووقیەکانی کرد بەهۆکاربۆ لابردنی ئەو دەستە لادەرە خۆسەپێنە. وەرگێر

هەموو تایبەتمەندیەکانی خۆی لەدەستدا بو.[١]

بەو جۆرە دەتوانین بڵێین بوەیهیەکان کاتێك پایەی ئەمیری ئەمیرانیان گرتە دەست، هیچ لە سەلامیات و بەرپرسیارێتی پایەی ئەمیری ئەمیرانیان نەگۆڕی، بەڵکو ئەو گۆڕانەی روویدا ئەوەبو کە ئەو پایەیان کرد بە میراتی لە بنەماڵەکەیاندا، بەڵکو هەڵسوکەوتیان لەگەڵ خەلیفەکاندا لەسەر شێوەی پێش خۆیان بو[٢] پێدەچێت باری خیلافەت لەسەردەمی قەڵەمڕەوی تورکی باشتر بوبێت، ئەمەش بەو پێیەی دەسەڵاتی بوەیهیەکان سەقامگیر بو ئەمە خەلیفەکانی لەو گرفتانە دوور دەخستنەوە کە پێشتر لە ئەنجامی ململانێی سەرکردەکان و ئەمیری ئەمیران دەهاتنە رێیان و دەبونە هۆی ڕاستەوخۆی ئەوەی لەچەند کاتێکی نزیکدا لایان ببەن و هێرشیان بکەنە سەر، بەڵکو ئەمیرە بوەیهیەکان لەسەر نیشاندانی گوێڕایەڵی و هۆگری بۆ پایەی خەلیفەی عەبباسی لەبەر چاوی خەڵکدا سوربون، ئەمەش لەبەر ئەو قەڵەمڕەوە ئاینییەی کەخەلیفە لەناو موسڵماناندا وەك سەرۆکی باڵای کۆمەڵی ئیسلامی هەیبو[٣].

کاتێك ململانێی لەسەر دەسەڵات کۆتایی پێهات و پایەی ئەمیری ئەمیران لەبنەماڵەی بوەیهیەکاندا بو بەمیراتی ئیتر کەسێك نەبو لەگەڵ خەلیفەدا پێکدابدات.[٤] لەلایەکی ترەوە خەلیفە بە شێوەیەکی ڕەسمی کارگێری دەوڵەتی دایە

---

١ـ البيروني: الأثار الباقية عن القرون الخالية: ص ١٣٢، إبن ألأثير: ج٦ / ص ٣١٥، حسن ابراهيم حسن: تاريخ الإسلام / ج٣ ص ٤١. arnold: the caliphate: p ٦٨.

٢ـ ئەمە لەگەل واقیعدا ناگونجێت چونکە دەزانین هەم خیلافەتی عەبباسی و هەم تورکەکان سوننە مەزهەب بون و خەلیفە لەلای جەماوەر و لەو نێوەندبەدا لای تورکەکانیش ریز و پیرۆزی هەبو و بەو پیرۆزییەکی ئایینی سەیریان دەکرد بۆیە لەگەڵ هەموو ناڕەواییەکانیان لەزۆر بواردا لایەنە پیرۆزیەکەی خەلیفەیان لەبەرچاو دەگرت، بەڵام بوەیهیەکان بەو پێیەی شیعە مەزهەب بون، هیچ بەهایەك نەبو تا بە پیرۆزیان ڕێزەوە سەیری خەلیفەکان بکەن، بەڵکو وەك داگیرکەری دەسەڵات سەیریان دەکرن، بۆیە ئەو کارەیان لە رووی دەوڵەتی عەبباسی و خیلافەتدا نواند کە سەرچاوە مێژووییەکان تۆماریان کردوون. وەرگێر

٣ـ العبادي: ص ١٦٣.

٤ـ الزهراني: ص ٢٤.

دەست ئەمیری بوەیهی ئەمەش سیفەتی شەرعی بەهەڵسوکەوت و کرداری بوەیهیەکان دەدا.

لە ڕاستیدا ئەمیرە بوەیهیەکان لە دەستنیشانکردن و لابردنی خەلیفە لە پایەی خەلیفەدا تەنها دووجار دەستنیشانوەرداوە.[١] یەکەمیان لەساڵی (٣٣٤ك / ٩٤٥ن) واتە دوای ئەوەی ڕاستەوخۆ چوونە ناو بەغداد، ئەو کات موعیزودەولەی بوەیهی خەلیفە موستەکفی گرت و لەسەر خیلافەت لایبرد و بەیعەتی بە موتیع دا[٢]، ئەمیری بوەیهی لەبەر دوو هۆکاری سیاسی و ئاینی ئەو ڕێبازەی لەگەڵ خەلیفەدا گرتە بەر[٣].

هۆکاری سیاسی: دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی خەلیفە موستەکفی لەکاتی ململانێی نێوان ناسیرو دەولەی حەمدانی و نێوان موعیزو دەولە لە موسڵ پەیوەندی بە ناسیرو دەولەوە دەکرد و هەواڵی نهێنی و بزاوتی سوپی سەربازی بوەیهی پێدەدا.[٤]

هۆکری ئایینی : خەلیفە سەرۆکی شیعەی گرت کە فەتوای لەبەغداد لەدەستدابو، خەلیفە لەبەردەم موعیزودەولەدا سوکایەتی پێکرد، موعیزو دەولەیش لەبەرئەوەی شیعە بو ئەوەی پێ ناخۆشبو بۆیە پێشڕەوە لەلابردنی موستەکفیدا کرد کە بێڕێزی بەرامبەر مەزهەبەکەی ئەو نیشاندا بو[٥].

دووەم جار کە بوەیهیەکان دەستیان وەردابێتە لابردنی خەلیفەی عەبباسی، لەساڵی(٣٨١ك / ٩٩١ن)دا بو کاتێك بەهائودەولە خەلیفە تائیعی لابردو لەشوێنیدا قادری دانا.[٦] سیوتی هۆکاری ئەوە دەگێڕێتەوە بۆ ئەوەی خەلیفە عەلی ئەبولحوسەینی کوڕی موعەلیمی گرت کەلە کەسە تایبەتەکانی بەهائو دەولە بو و کردیە بەندیخانە، بەهائو دەولە ئەمەی لەسەر سەخت بوو خەلیفەی گرت و لایبرد و

---

١ـ هەمان سەرچاوە.

٢ـ المسعودي: ج٤ / ٢٧٦

٣ـ الزهراني: ص ٢٤.

٤ـ المسعودي: ج ٤ / ص ٢٧٦.

٥ـ مسكوية: ج٢ ص ٨٦ / إبن الأثير: ج٦ / ص ٣١٥.

٦ـ إبن عمراني: الأنباء في تاريخ الخلفاء: ص ١٤٨

دەستی بەسەر ماڵو سامان و هەرچیەکدا گرت کەلەدارولخیلافەدا بو.[١] بەلآم ڕای ڕاستتر وایە کە مەسەلەی دارایی لەپشت ڕووداوی لابردنەکەوە بو، چونکە بەهائودەولە کەوتبویە تەنگژەیەکی داراییەوە و سەربازان ئاژاوەی زۆرین لەدژ گێرا، ئەبولحەسەنی کوڕی موعەلیم ئەوە لەلا جوانکرد کە خەلیفە بگرێت و دەست بەسەر ماڵوسامانیدا بگرێت[٢].

سەبارەت بە خەرجی خەلیفە ئەمیری ئەمیران بۆ ئەو خەرجیانە بڕێکیان دانابو کە پێیان دەوت خەرجی ڕزگاری خوازی[٣]، بوەیهیەکان مووچەیان بۆ خەلیفە دانابو، موعیزودەولە موچەیەکی ڕۆژانەی بۆ خەلیفە تایبەتکرد بو کە بەبڕی پێنج هەزار درهەم بو[٤]، کەچی بینی شتێکی باش نیە، چونکە ماڵ و سامان هەندێ جار دوادەکەوێت بۆیە لەدوای گرتنی بەسرە لەساڵی (٣٣٦ك/ ٩٤٧ن) خەرجی ڕزگاریخوازی وەك ئیقتاع بۆ خەرجی ڕۆژانە زیادکرد[٥] لەگەڵ ئەوەیشدا ماڵو سامانی خەلیفە بەرەو ڕووی دەستیەسەردا گرتن دەبویەوە.

ئەمیرە بوەیهیەکان هەندێ تایبەتمەندی و ئیمتیازیان هەبو کە بەڵگەی بەهێزی و تایبەتمەندیان لە ئەمیرو سەرکردەکانی پێش خۆیان بو، لەو ئیمتیازانە:

نەریت وابو کاتێك خەلیفە ئەمیرێکی دەستنیشان بکردایە، ئەو ئەمیرە دەهێنرا بۆ کۆڕی خەلیفە، ئەویش شمشێرێکی پێدەدا و ئاڵایەکی بەزیو نەخشێنراوی پێدەداو بەڵێنی میرایەتی یان ویلایەتی پێدەدا[٦]. بەلآم لەسەردەمی بوەیهی لەساڵی (٣٦٧ك / ٩٧٧ن)دا گۆڕانێك لەو نەریتەدا ڕوویدا و ئەمیرعەزدو دەولە هاتە دارولئیمارە و ژمارەیەك لەسەرباز و خانەدان و دادوەرو ناودارانی لەگەڵدا بو،

---

١ـ السيوطي: ص ١٧٢ / ئیبن موعەلیم شەرعناسی ئیمامی بو.

٢ـ إبن الأثير: ج٧ / ص ١٤٧، لەگەڵ ئەنتاکی بەراوردی بکە کەباس لەوە دەکات خەلییفە تائیع بەبێ هیچ تاوانێك لابراوە.ص ٢٢١.

٣ـ العولي: ص ١٣١ــ ١٤٥.

٤ـ إبن الأثير: ج ٦ / ص ٣١٤.

٥ـ هەمان سەرچاوە.

٦ـ الزهراني: ص ٢٦.

خەلیفە تائیع پۆشاکی سوڵتانی دایە دەست و دوو ئاڵای دایە دەست کە یەکێکیان بەزیو ناوی ئەمیرەکانی نەخشاندبو، دووەمیش زێر پۆشی ناوی جێگیرەکان بو و نازناوی تاجولمیللەی پێدا بەزیاد لەنازناوی عەزدو دەولە هەروەها کاروباری ئەودیو دەرگای دایە دەست و بەڵێنێکی بۆ نووسی و لەخزمەتیدا خوێندرایەوە.[١] پێشتر نەریت وانەبو بەڵکو بەڵێنەکان بە ئامادەبونی خەلیفەکان دەدران بە والیەکان جا ئەگەر ئەو کەسە بەڵێنەکەی لێ وەربگرتنایە دەیووت : ئەمە بەڵێنی منە بۆتۆ دەی کاری پێبکە[٢]. ئەو نەریتی پێدانی دوو ئاڵا و خوێندنەوەی بەڵێنی ئیمارەت بە ئامادەبونی خەلیفە بو بەمافێکی ئەو بوەیهیانەی کەلەدوای عەزدو دەولە دەسەڵاتیان دەگرتە دەست.

بوەیهیەکان تایبەتمەندیەکی تریان بەدەستهێنا، ئەویش ئەوە بو لەکاتی بانگداندا لەبەردەمماڵیاندا تەپڵ لێدەدرا، ئەم نەریتە گرینگترین دیمەنەکانی دەسەڵاتی عەبباسی بو، ئەویش ئەوە بو لەکاتی هەر پێنج نوێژەکاندا لەبەردەم دارولخیلافەدا تەپڵ لێدەدرا و کەسیتر ئەو مافەی نەبو، تەنانەت جێگیرەکانیش ئەو مافەیان نەبو[٣].

ئەمیرە بوەیهیەکان لەسەردەمی موعیزو دەولەوە هەوڵیاندا ئەو نەریتەیان هەبێت، بەڵام سەرکەوتوو نەبون تا ئەوەی عەزدو دەولە لە ساڵی (٣٣٦ك / ٩٤٧ز) دا کاروباری عێراقی گرتە دەست داوای لەخەلیفە تائیع کرد تا ڕێگەی پێبدات لەبەردەرگایدا لەکاتی نوێژدا تەپڵ لێبدرێت ئەویش مۆڵەتی پێدا تا لەرشۆژێکدا سێ جا لەکاتی نوێژی بەیانی و ئێوارە و خەوتناندا ئەو کارە بکرێت.[٤] ئەو ناکۆکیەی لەنێوان ئەو دوو کەسەدا لەکاتی ململانێی نێوان بوەیهیەکان و تورکەکاندا پەیدا بو، هۆکارو پاڵنەر بو تا خەلیفە بە ئامانجی چاککردنی پەیوەندی خۆی لەگەڵیدا ئەو

---

١ـ إبن الجوزی: المنتظم: ج٧ / ص ٨٧. السیوطی: ص ٤٠٧.

٢ـ إبن الجوزي: هەمان سەرچاوە.

٣ـ هەمان سەرچاوە: ص ٩٢ / و ج٨ ص ٣٠.

٤ـ إبن الأثیر: ج٧: ص ٩٠ – ٩١

تایبەتمەندییەی پێبدات.[١]

دوای ئەوە ئەو تایبەتمەندیە بو بەمافێك لە مافەكانی بوەیهیەكان و ڕۆژانە سێ جار لەبەر دەرگایاندا تەپڵ لێدەدرا تا ئەوەی سوڵتانودەولە لەساڵی (٤٠٣ك/ ١٠١٢ن)دا دەسەڵاتی گرتە دەست، بەبێ مۆڵەتی خەلیفە فەرمانیكرد لە ڕۆژێكدا پێنج جار لەبەر دەرگایدا تەپڵ لێبدرێت.[٢] جەلالودەولەیش لەساڵی (٤١٨ك / ١٠٢٧ن) دا هەمان ڕێگەی ئەوی گرتە بەر لەگەڵ ناڕەزایی خەلیفەدا دواتر لەژێر فشاردا ناچاربو ڕازی ببێت.[٣]

سەبارەت بە وتاردراو، وا باوبو كە لەسەر هەموو مینبەرەكانی ویلایەتەكان وتار بۆ خەلیفە و ئەمیرەكانیش بخوێنرێتەوە بەڵام لە بەغداد وتار تەنها بۆ خەلیفە بو، بەڵام لەساڵی (٣٦٨ك/ ٩٧٨ن)دا خەلیفە تائیع فەرمانیكرد تا لەبەغداد لەدوای خەلیفە ووتار بۆ عەزدودەولە بخوێنرێتەوە.[٤] نووسینی ناوی ئەمیرە بوەیهیەكانیش لەسەردراو، شتێك بو كەهەر لە پێشترە وە باوبو.[٥]

ئەمیرە بوەیهیەكان تایبەتمەندیەكی ترین دەستكەوت كە ئەویش لەخۆنانی نازناو بو، لە ڕاستیدا لێنانی نازناوی پاشا)ملك(یان شتی تر لەو ئەمیرانە، بۆ توانای سەربازییان و هەستی نەتەوایەتی فارسیان بۆ زیندووكردنەوەی كەلتوری كۆنی فارسی دەگەڕێتەوە.[٦] جا لەساڵی (٣٥١ك/ ٩٦٢ن) دا خەلیفە موتیع نازناوی عەزدودەولەی لە ئەمیر شوجاع فەننا خسرەونا.[٧]لە ساڵی (٣٥٥ك/ ٩٦٦ن) یشدا نازناوی موئەیدو دەولەی لە ئەحمەدی كوڕی بوەیە نا[٨]، و نازناوی عیزودەولەیشی

---

١ـ الزهراني: ص ٢٧.
٢ـ إبن الجوزي: ج٨ / ص ٢٢.
٣ـ هەمان سەرچاوە.
٤ـ هەمان سەرچاوە.
٥ـ محمود والشريف: ص ٥٢٠.
٦ـ الزهراني: ص ٢٢.
٧ـ سكوية: ج٢ / ص ١٩٢، إبن الأثير: ج٧ /ص ٥.
٨ـ هەمان سەرچاوە: ص ٢٢١.

لە ئەمیر بەختیار نا[١]، لە ساڵی (٣٦٤ك/ ٩٧٥ن) یشدا نازناوی فەخرودەولەی لە ئەبولحەسەن عەلی کوڕی ڕوکنودەولەنا[٢].

خەلیفە نازناوی بۆ ئەمیری بوەیهی هەڵدەبژارد و ئەویش دەبو قبوڵی بکات و ناڕەزایی دەرنەبڕێت[٣]. بەڵام ئەوە زۆر درێژەی نەکێشا و لەساڵی (٣٦٩ك/ ٩٧٩ن) ەوە ئەمیری بوەیهی بەدڵی خۆی نازناوی بۆخۆی هەڵدەبژارد و دواتر ڕەزامەندی خەلیفەی لەسەر وەردەگرت.

عەزدو دەولە لە کاتێك لە هەمان ساڵدا گەیشتە بەغداد، داوای لە خەلیفە کرد تا نازناوی (تاجولمیللە) ی بۆ زیاد کرد، خەلیفەیش رازی بو و ئەو نازناوەی پیبەخشی.[٤] کاتێك بوەیهیەکان بەهێز بون ئەمیرە بوەیهیەکان هەوڵیاندا لە ڕوانگەی نازناوەی شانوشکۆ بەخۆیان بدەن جا عەزدو دەولە نازناوی (مەلیکولمولوکی) لەخۆی ناو خەلیفەیش بەوە ڕازی نەبو، ئەبوکالیجاریش نازناوی مەلیکولئومەی لەخۆی نا[٥].

لە ساڵی (٤٢٩ك/ ١٠٣٨ن) دا نازناوی شاهەنشاه ئەلئەعزەم مەلیکولملوك بۆ نازناوەکانی جەلالودەولە زیاد کرا، ئەمەش بەڕەزامەندی خەلیفە بو وبەو نازناوەوە لەسەر مینبەرەکان وتاری بۆ دەخوێنرایەوە جەماوەری خەڵك لەوە بێزار بون و کەوتنە خشتبارنکردنی وتاربێژان و بەو هۆیەوە ئاژاوەیەکی سەخت ڕوویدا.[٦] ئەمیر خەسرەو فەیرووز لەساڵی (٤٤٠ك/ ١٠٤٨ن) دا نازناوی (الملك الرحيم) ی لەخۆی نا خەلیفە لەسەرەتاوە ڕێگری پێدانی ئەو نازناوی لێکرد، دواتر بەناچاری ڕازیبو[٧].

---

١- إبن الأثير: ج٧ / ص ٢١- ٢٢.

٢- إبن الأثير: ج٧ / ص ٦٥.

٣ - الزهراني: ص ٢٨.

٤- إبن الجوزي: ج٧ / ص ٩٨.

٥- هەمان سەرچاوە: ص ١١٣- ١١٤.

٦- إبن كثير: ج١٢ / ص ٤٣، ئیبن کەثیر ڕای شەرعناسان و دادوەرانی سەبارەت بەونازناوانە هێناوە.

٧- إبن الأثير: ج٨ / ص ٤٨.

# کۆتایی پێهاتنی بوەیهیەکان

دوای مردنــی بەهائودەولــە لــە ســاڵی (٤٠٣ك/ ١٠١٢ز) بـارودۆخی بوەیهیــەکان شڵەژا، هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ:

ململانێـی کوڕەکـانی، چـونکە خێزانـی بـوەیهی بنکەیـەکی جێگیری بـۆ گرتنـە دەستی کاروبارەکـان دەسـت نیشان نـەکردبو بۆیـە ئەندامـەکانی لـەنێوان خۆیانـدا نـاکۆکی کەوتـە نێوانیـان و پەیوەسـتی پێکـەوە بـونی یـەکتر نـەبون وبەشـێك لـە زینـدوویێتی و چـالاکی خۆیـان لەدەسـتدا، هەریـەك لـە کوڕەکـانی بەهائودەولـە لەناوچەیەکی دەگرتە دەست بۆ خۆی، جا سوڵتانودەولە لە شیراز دەسـەڵاتی گرتـە دەسـت، موشـریفودەولەی بـرای ئـەمیری ئـەمیرانی لـە بەغـداد گرتـە دەسـت، جەلالودەولەی برای ناوچەی بەسرەی گرتە دەست، ئەبولفەوارسی برایشی کرمـانی گرتـە دەسـت.[1] هەریەکـەیان هـەوڵی دەدا لـەو بەشـەی ژێـر دەسـتیدا سـەربەخۆیی وەربگرێت و ئەوەی لەدەست برایەکەیەتی لێی بسێنێت تا نـاکۆکی لەناوخێزانەکـەدا زیادیکرد.

بوەیهیــەکان لەســەردەمی موعیزودەولــەوە پــشتیان بەتورکــەکان بەســت و ســەربازێکی زۆریــان لێ بەســەرباز گــرتن و هەنــدێکیان گەیــشتنە چــەند پایەیــەکی سـەرکردایەتی لەگـەڵ ئـەوەی دەسـەڵات لەدەسـتی بوەیهیەکانـدا بـو، بـەڵام هێـزی سەربازە تورکەکان بەردەوام لـەژێر دەسـەڵاتی بوەیهیـەکانی دوای عـەزدو دەولـەدا زیادی دەکرد و بون بەهێزێك کە بێباك بون و تورکـەکان چـەند یەکەیـەکی سـواریان پێکهێنا لە کاتێکدا بوەیهیەکان یەکەی پیادەیان پێکدەهێنا. ئاسـایی بـو لەسـایەی بارێکی لەونێوەدا ڕکەبەری نێوان هـەردوولا سـەر هەڵبـدات کـە ئەمـەش بویـە هـۆی چەندبن سەختی و ناڕەحەتی لەڕێی بوەیهیەکاندا و بویـە هـۆی زیـادبونی شـۆڕش و جـەنگی نـاوخۆیی و سـەربازە تورکـەکانیش هەنـدێ جـار دەکەوتنـە تـاڵان و بـڕی پایتـەخت و دەسـتیان لـە تـاڵانی کۆشـکی سـەرکردەکانیان نەدەگرتـەوە و داوای

[1]- إبن الأثير: ج٧ / ص ٢٦٨.

زیادکردنی مووچەیان و قەرەبوکردنەوەی زیاتریان دەکرد. لەبەرئەوەی نەیاندەتوانی چارەسەری ئەو کێشانە بکەن و پێویستی سەربازەکانیان دابین بکەن، بۆیە بوەیهییەکان پەنایان بۆ گرتنە بەری سیاسەتێکی نوێ برد کە بەدەرکەوتنی نیزامێکی نوێی کۆمەلایەتی خۆی دەنواند کە ئەویش نیزامی ئیقتاع بو، بوەیهییەکان کەوتنە پێدانی گوندەکان بە سەربازان لەبەرامبەر خزمەتی سەربازییاندا، ئەم ئیقتاعە تایبەتمەندی قۆناغ بەندی هەبو، واتە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بو تا ژیانی سەربازان دلنیا بکەن، ئەمە وایدەکرد ئەوانەی سوود لە ئیقتاعیەت وەردەگرن وە لە سیفەتێکی دیار بەردەوام گۆڕان بکەن، ئەو خاوەن ئیقتاعانە کەدەیانزانی پاش ماوەیەکی کورت گوندەکانیان لێدەسەنرێتەوە، ئیقتاعەکانیان پشتگوێ خست، ئەمەش گوندەکانی بەرەو وێرانی و داڕمانی ئابوری برد کە خەزێنەی بوەیهی وێڕای خەزێنەی گشتی خیلافەت پێی زیاد مەندبو.

بوەیهییەکان لەناو بازنەی قەڵەمڕەوی خۆیاندا چوون بەناویەکدا و لەهەمان کاتدا گرینگیدان بە رووداوەکانی ناوچەکانی تری جیهانی ئیسلامیان پشتگوێ خست و بەشدارییان تێدا نەدەکرد، ئەمە دەرفەتی بۆ سەرهەڵدانی چەند میرنشینێکی تر کردەوە تا ئەو ئەرکە لەئەستۆ بگرن، وەك عوقەیلیەکان لەباکوری عێراق و هەندێ ناوچەی جەزیرەدا، ئەمیرییەکان لە حەڕان و ڕەهاو رقە، مەڕوانیەکان لەدیاربەکرو میافارقین و چەندێکی تر، لە ئەنجامی ئەمەدا پێکدادان لەنێوان ئەوان و نێوان هێزە تازە سەرهەڵدراوەکاندا رووی دا.

لەسەر ئاستی دەرەکی، بوەیهیەکان گرنگیەکی وایان بۆ دورخستنەوەی هێزی نوێی بیزەنتی کە لەسەردەمی بنەماڵەی مەقدۆنیدا دەرکەوت نیشان نەدا، هەروەك گوێیان بەوڵاتی شام نەدا کە هەندێ جار ململانێیی توندی نێوان تۆلۆنی و ئەخشیدیەکان لەلایەك و نێوان خیلافەتی عەبباسی و دەوڵەتی حەمدانی لەلایەکی ترەوە بەخۆیەوە دەبینی.

لە ڕۆژهەڵاتیشدا لەگەڵ سامانی و غەزنەویەکاندا بۆ بەرگریکردن لەناوچە سنوریەکانی هیند و تورکە بتپەرستەکان نەکرد، بەڵکوو ناکۆکی ناوخۆیی ناوخۆی

خێزانەکە ڕێگەی پێنەدەدان گرنگی بەکاروباری دەرەکی بدەن یان سووربن لەسەر ئەوەی لە جیهانی ئیسلامیدا ڕۆڵێکی کارا ببینن.

دەوڵەتی بوەیهی لە عێراق و فارس ولەژێر گورزی سەلجووقیەکاندا رووخا و مەلیك ڕەحیم بەدیلی کەوتە دەست توغرولبەگی سەلجووقی کاتێك لەساڵی (٤٤٧ك/١٠٥٥ز) دا چوویە بەغداد، وەك دواتر دەیبینین.

# سەردەمی عەبباسی چوارەم

## سەردەمی فەڵەمڕەوی سەلجووقی تورکی

## ٦٥٦ – ٤٤٧ ك/ ١٢٥٨ – ١٠٥٥ز

**خەلیفەکانی سەردەمی عەبباسی چوارەم و ماوەی خیلافەتی هەریەکەیان :**

- ئەبوجەعفەر عەبدوڵڵا قائیم ٤٦٧ـ٤٢٢ك/ ١٠٧٥ـ١٠٣١ز
- ئەبولقاسم موحەممەد موقتەدی ٤٨٧ـ٤٦٧ك/ ١٠٩٤ـ١٠٧٥ز
- ئەبولعەبباس ئەحمەد موستەزهر ٥١٢ـ٤٨٧ك/ ١١١٨ـ١٠٩٤ز
- ئەبومەنسوور فەزڵ موستەرشید ٥٢٩ـ٥١٢ك/ ١١٣٥ـ١١١٨ز
- ئەبوجەعفەر مەنسوور راشید٥٣٠ـ٥٢٩ك/ ١١٣٦ـ١١٣٥ز
- ئەبوعەبدوڵڵا موحەممەد موقتەفی ٥٥٥ـ٥٣٠ك/ ١١٦٠ـ١١٣٦ز
- ئەبولمزەفەر یووسف موستە نجید ٥٦٦ـ٥٥٥ك/ ١١٧٠ـ١١٦٠ز
- ئەبوموحەممەد حەسەن موستەزی ٥٧٥ـ٥٦٦ك/ ١١٨٠ـ ١١٧٠ز
- ئەبولعەبباس ئەحمەد ناسر ٦٢٢ـ٥٧٥ك/ ١٢٢٥ـ١١٨٠ز
- ئەبونەسر موحەممەد زاهیر ٦٢٣ـ٦٢٢ك/ ١٢٢٦ـ١٢٢٥ز
- ئەبوجەعفەر مەنسوور موستەنسیر ٦٤٠ـ٦٢٣ك/ ١٢٤٢ـ١٢٢٦ز
- ئەبوئەحمەد عەبدوڵڵا موستەعسەم ٦٥٦ـ٦٤٠ك/ ١٢٥٨ـ١٢٤٢ز

# سەردەمی تورکە سەلجووقیەکان

## سەلجووقیە گەورەکان لە خوراسان و ئێران:

١. ڕوکنەدین ئەبوتالیب توغرولبەگ ٤٥٥ـ٤٢٩ك/ ١٠٦٣ـ١٠٣٧ز
٢.عەزدو دەولە ئەبوشوجاع ئەلب ئەرسەلان ٤٦٥ـ٤٥٥ك/ ١٠٧٢ـ١٠٦٣ز
٣.موعیزودین ئەبولفەتح مەلیکشاهی یەکەم ٤٨٥ـ٤٦٥ك/ ١٠٩٢ـ١٠٧٢ز
٤.ناسرەدین مەحموود ٤٨٧ـ٤٨٧ك/ ١٠٩٤ـ١٠٩٢ز
٥.روکنەدین ئەبولموزەفەر برکیاروق٤٩٨ـ٤٨٧ك/ ١١٠٤ـ١٠٩٤ز
٦.جەلالودەولە مەلیکشاهی دووەم ٤٩٨ك/١١٠٤ز
٧.غیائەدین ئەبوشوجاع موحەممەد ٥١١ـ٤٩٨ك/ ١١١٧ـ١١٠٤ز
٨.موعیزەدین ئەبولحارث سنجر ٥٥٢ـ٥١١ك/ ١١٥٧ـ١١١٧ز

## سەلجوقیەکانی عێراق:

١.موغیثە دین مەحموود ٥٢٥ـ٥١١ك/ ١١٣١ـ ١١١٧ز
٢.غیاثە دین داود ٥٢٦ـ٥٢٥ك/ ١١٣٢ـ ١١٣١ز
٣.روکنەدین ئەبوتالیب توغرولی دووەم ٥٢٩ـ٥٢٦ك/ ١١٣٥ـ١١٣٢ز
٤.غیاثە دین ئەبولفەتح مەسعوود٥٤٧ـ٥٢٩ك/ ١١٥٢ـ١١٣٥ز
٥.موعیزەدین ئەبولفەتح مەلیکشاهی دووەم ٥٤٧ك/ ١١٥٢ز
٦.غیاثە دین ئەبوشوجاع موحەممەدی دووەم ٥٥٤ـ٥٤٨ك/ ١١٥٩ـ١١٥٣ز
٧.غیاثە دین ئەبوشوجاع سولەیمان شاه ٥٥٦ـ٥٥٤ك/ ١١٦١ـ١١٥٩ز
٨.ڕوکنەدین ئەبولموزەفەر ئەرسەلان شاه ٥٧١ـ٥٥٦ك/ ١١٧٥ـ١١٦١ز
٩.روکنەدین ئەبوتالیب توغرولی سێ یەم ٥٩٠ـ٥٧١ك/ ١١٩٤ـ١١٧٥ز

# بەشی یانزەیەم

# کۆتایی دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی

## خیلافەتی عەبباسی و تورکە سەلجوقیەکان

* دامەزراندنی دەوڵەتی سەلجووقی : بە دامەزرانی تورکە سەلجووقیەکان سەردەمێکی نوێی گرنگی مێژوویی خیلافەت و ئیسلامیش دەرکەوت، کاتێك لەڕۆژهەلاتدا لە سەرەتای سەدەی یانزەی زاینیدا دەرکەوتن، خەلیفە هیچ دەسەڵاتێکی ڕاستی خیلافەتی نەبو و خیلافەتی عەبباسی پارچە پارچە بو بو، ئومەویەکان لە ئەندەلوس دەسەڵاتیان لێسەندبون، عەبیدیەکان لە میسرو باکووری ئەفریقیادا بەغدادیش تاکە ڕێگەیەك کە لەبەرەستدا بو دەبو هەموو ئەوانە لەناو ببات.

سەبارەت بە باکووری سوریا و جەزیرەی فوراتی، بینیمان چۆن کەوتنە دەست چەند سەرکردەیەکی عەرەبی شۆڕشگێڕ کە هەندێکیان توانیان دەوڵەتی بەهێز دابمەزرێنن.[1] پاشان فارس و ئەو دیو ڕووباریش لەدەست بوەیهیەکاندا بو یان چەند فەرمانڕەوایەك گرتبویانە دەست کە هەریەکەیان چاوەڕێی دەرفەت وەرگرتن بو بۆ لەناوبردنی ڕکەبەرەکەی، تا ئەوەی پشێوی سیاسی و سەربازی هەموو بەشەکانی گرتەوە، وتاری مەزهەبی نێوان سوننەو شیعە بەرەو زیادبون چوو تا ئاستێك ئەوەی سەیری دەوڵەتی ئیسلامی دەکرد وایدەزانی دەوڵەتی ئیسلام لەبازنەی کۆتا نەزعیدایە.

---

١ـ مەبەستی نووسەر لێرەدا پیرۆزیدان بەو سەرکردانە نیە کاتێك وشەی (شۆڕشگێر) یان بۆ بەکاردێنێت، چونکە ئەو ئاژاوەچی و دوژمنانی ئیسلام و سەرکردە موجاهیدەکان و....هتد، هەمان چەمکی بەکارهێناوە بەواتا گشتیەکەی بەڵام دەزانین لەمڕۆدا چەمکی شۆڕشگێر بەتایبەت لای کورد واتایەکی پیرۆزی و بەڕێزی دەدات، نووسەر بەم مەبەستە بەکارینەهێناوە. وەرگێر.

کاتێ سەلجووقیەکان لە مەیدانی سیاسی خیلافەت و لەسەر کەلاکی پێشینە بوەیهیەکان دەرکەوتن باری خیلافەتی ئیسلامی بەو جۆرە بو.

سەرلجووقیەکان لە هۆزی قنقی غوزی تورکیەوە دەکەونەوە و دەدرێنە پاڵ باپیرەکەیان کە(سەلجووقی کوڕی دقاق)ە.[١] نشینگە و خانوویان لە بیابانە فراوانەکان و دەشتەکانی نێوان چین تا کەنارەکانی دەریای خەزەر بو.[٢] مەزهەبی سوننیان وەرگرت و بەورەو گوڕو تینەوە کەوتنە سەرخستنی ئەو مەزهەبە، لەساڵی (٣٧٥ك/ ٩٨٥ز) دا لە نشینگەی سەرەکی خۆیانەوە بەهۆی باری خراپی ئابوری ئەو ناوچە بیابانەیان بەهۆی ئەو جەنگانەی لەنێوان هۆزە جیاجیاکاندا روویاندەدا، هاتن بەرەو وڵاتی ئەودیو رووبار و لەگەڵ غەزنەویەکاندا کە دەستیانگرتبو بەسەرناوچەکەدا پێکیاندادا و دوای زنجیرە پێکدادانێك لەوێ دەریانکردن.

سوڵتانی سەلجووقی (توغرولبەگ) لەساڵی (٤٣١ك/١٠٤٠ز) لە ئەنجامی سەرکەوتنی بەسەر سوڵتان مەسعوودی غەزنەوی لە جەنگی (داندانقان) دا لەخوراسان دەوڵەوتێکی دامەزراند[٣] و خەلیفە قائیمی عەبباسیش بۆ ساڵی داهاتوو دانی بەدەسەلاتیدا نا.[٤]

سەلجووقیەکان لە بازنەی داننانی خەلیفەی عەبباسیدا بە ئامانجی لەناوبردنی بوەیهیەکان درێژەیان بە سیاسەتی فراوانخوازی خۆیان لە فارسدا دا تا ڕێگە بۆکشانی قەڵەمڕەو یان بەرەو عێراق خۆشبکەن جا لەساڵی (٤٣٢ك/ ١٠٤١ز) دا دەستیانگرت[٥] بەسەر)ڕەی) دا و بۆساڵی دواتریش چوونە ناو جورجان و تەبەرستان.[٦] سوڵتان توغرولبەگ لەساڵی (٤٤٢ك/ ١٠٥٠ز) دا دەستیگرت بەسەر

---

١ـ الحسيني: صدرالدين بن علي: أخبار الدولة السلوقية / ص (٢ـ ٣): المستوفي: تاريخ كزيدة: ص ٤٣٤، خواند أمير: حبيب السير: ج٢ / ص ٤٧٩.

٢ـ فامبرى ارمينيوس: تأريخ بخارى: ص ١٢٧.

٣ـ داندانقان دەکەوێتە نێوان سەرخەس و مەڕو.

٤ـ الراوندى: ابوبكر محمد بن علي: راحة الصدور و راية السرور في تاريخ الدولة السلجوقية ص ١٦٨ – ١٦٩.

٥ـ الحسيني: ص١٠.

٦ـ إبن الأثير: ج٨ / ص ٣٠.

ئەسفەهاندا و کردی بە پایتەختی خۆی.[١] پاشان لەدوای چوار ساڵ دەستیگرت بەسەر هەرێمی ئازەربایجاندا.[٢] بەو جۆرە دەوڵەتی سەلجووقیە گەورەکان لە خوراسان و فارسدا دامەزراو سوپاکانیان تەواو ئامادەبون تا بچنە ناو عێراق.

* باری ناوخۆی بەغداد لەو کاتەی سەلجووقیەکان بەرەو ڕۆژئاوا دەکشان: لەو کاتەدا باری ناوخۆیی لە بەغداد شەقوشۆق بو، بارێکی پشێوی و ناجێگیری دایگرتبو ئەمە یارمەتی ئەوەیدا ڕێگە لەبەردەم سەرلجووقیەکاندا خۆشبێت تا بچنە ناوبەغداد و عێراق بدەنە پاڵ ئەو دەوڵەتەیان کەلەخوراسان و ئێران دایانمەزراندبو ئەمەش بەهۆی ململانێی نێوان ئەو سەرکردانە و نێون سەربازاندا لەلایەکی ترەوە سەریهەڵدا هەروەك ئاژاوە و فیتنە لەنێوان سەربازاندا بڵاوبویەوە[٣].

جا لەساڵی (٤٢٤ك/ ١٠٣٣ز) دا بە ڕوونی ڕکەبەری لە نێوان جەلالودەولەی بوەیهی و نێوان ئەبوکالیجاری برازایدا دەرکەوت و لەبەغداد وتار بۆ ئەبوکالیجار خوێندرایەوە[٤] و شارەکە بو بە شانۆیەك بۆ ئاژاوەگێڕی و ململانێی مەزهەبی و بنەماڵەیی. کاتێك جەلالودەولە لەساڵی (٤٣٥ك/ ١٠٤٤ز) دا مرد، مەلیك عەزیزی کوڕی نەیتوانی زۆر دەسەڵاتەکەی بپارێزێت ئەمە هانی ئەبوکالیجاری دا تا جێپێی خۆی لەدەسەڵاتدا بچەسپێنێت و لەساڵی(٤٣٦ك / ١٠٤٥ز)دا لەبەغداد سەقامگیر بو[٥].

لە ئەنجامی ئەم رشکەبەریە بنەماڵەییەدا بەهۆی شۆڕشە بەردەوامەکانی شۆڕشگێڕەکانەوە ئاسایش و ئارامی لە بەغداد دا نەما خەلیفەی عەبباسیش هەستی بەو دواکەوتن و لێکهەڵوەشانە کرد و پێی وابو دەوڵەتی بوەیهی ناتوانێت کاروباری عێراق سەقامگیر بکات.

---

١ـ هەمان سەرچاوە: ص ٥٤.

٢ـ إبن العبري: ابو الفرج: تأريخ الزمان ص ٩٠.

٣ـ سرور، محمد جمال الدين: سياسة الفاطميين الخاريجية / ص ١٧٩.

٤ـ إبن الأثير: ج٨ / ص ٥.

٥ـ هەمان سەرچاوە: ص ٣٧ـ٤٠

سەلجووقیەکان دەچنە بەغداد: کاتێك سەلجووقیە گەورەکان هاتنە دەوروبەری عێراق ئەبولحارپ ئەرسەلانی بەساسیری یەکێك لە سەرکردە تورکەکانی بوەیهیەکان کە شیعە بو دەستی بە سەر بەغداد و دەوروبەریدا گرتیوو و قەڵەمڕەوێکی گەورەی وای هەبو کەلەسەر مینبەرەکانی عێراق و ئەهواز وتاری بۆ دەخوێندرایەوە.[1]

هیچ خەلیفەیەکی عەبباسی یان پاشایەکی بوەیهی نەیدەتوانی بەبێ ڕەزامەندی بەساسیری هیچ بڕیارێك سەربارەت بەکاروباری دەوڵەت ئەو سەرکردەیە مەترسیەکی تەواوی بۆسەر خیلافەتی عەبباسی و دەوڵەتی بوەیهی پێکهێنا. مەترسیەکی بۆسەر خیلافەتی عەبباسی لەوەدا دەرکەوت کەلەساڵی (٤٤٦ك/ ١٠٥٤ز) دا کاتێ ناکۆکی لەگەڵ خەلیفە قائیمدا پەیدا کرد، چوو بەرەو لای فاتیمیەکان و پشتی بەوان بەست.[2]

مەترسیشی بۆسەر دەوڵەتی بوەیهی ئەوە بو کە لەململانێی لەگەڵ مەلیك ڕەحیمی بوەیهیدا خۆی نواند ئەمە هەڕەشەی لە قەڵەمڕەوی بوەیهی لە عێراقدا کرد کەلەدوای ئەوەی بوەیهیەکن لە ئێرن لەسەردەستی سەلجووقیەکان ناوچەکانی خۆین لەدەستچوو، لەو بارەگرژو نالەبارەدا هەرکامە و لەبەرژەوەندی خۆیدا هەولێدەدا، خەلیفە کەمتمانەی بەدەوروبەری خۆی نەمابو وای بەباش دەزانی پەیوەندی بەهێزی زاڵبووەوە بکات، بەتایبەت کەئەو هێزە سەلجووقیە سوننە مەزهەب بو و ڕیزی خیلافەتی دەگرت و هەواداری و پشتیوانی بۆ خیلافەت هەبو بۆیە پەنای بۆلای سوڵتان توغرولبەگی سەلجووقی برد و داوایلێکرد دژ بە ساسیری یارمەتی بدات[3].

---

١ـ بەساسیری یەکێك لە ئاژاوەگێرە خراپەکارەکان بو کە کەوتە بەر کاریگەری بانگەوازی عەبیدی فاتیمی و خەلیفەی موسڵمانانی لە بەغداد دەرکرد و کوشت و بڕێکی زۆری موسڵمانانی کرد و کەوتە تالآن و بڕی لە بەغداد تا خوای گەورە لەسەر دەستی سەلجووقیەکان موسڵمانانی لەدەست ئەو ستەمکارو سەرکەشە ڕزگارکرد. وەرگێر.

٢ـ هەمان سەرچاوە: ص ٨٣.

٣ـ الحسینی: ص ١٨.

سوڵتانیش ئەو دەرفەتەی قۆستەوەو بە سوپاکانیەوە بەرەو بەغداد چوو و لەساڵی (٤٤٧ك/ ١٠٥٥ز) دا چوویە ناو بەغداد و خەلیفەیش وەك سوڵتان بەسەر هەموو ناوچەکانی ژێر دەستیدا دانی پێدانا و فرمانیکرد تا لە وتاردا ناوی بهێنن[١].

- پەیوەندی نێوان خیلافەتی عەبباسی و دەسەڵاتی سەلجووقی:

توغرولبەگ سیانزە مانگ لە بەغداد مایەوە و لەوە ماوەیەدا ئیشی بۆ پاڵپشتیکردنی قەڵەمڕەوی سەلجووقی لە پایتەختی خیلافەت و پتەو کردنی پەیوەندی سەلجووقیەکان بەخەلیفەوە کرد، هەروەك خیلافەتیش لەلایەن خۆیەوە هەوڵیدا پەیوەندی خۆی لەگەڵ ئەو هێزە نوێیەدا بەهێز بکات، جا خەلیفە قائیم ئەرسەلان خاتوون خەدیجەی کچی داود جفری بەگی برای توغرولبەگی لەساڵی (٤٤٨ك / ١٠٥١ز) دا بەهاوسەر گرت[٢]. بەمەیش نزیکبونەوەی نێوان بنەماڵەی عەبباسی و سەلجووقی هاتەکایەو قەڵەمڕەوی سەلجووقیەکان لەعێراقدا جێگیر و چەسپاو بو[٣].

لە نێوەندی ئەو سەرکەوتنانەی توغرولبەگ بەدیدەهێنان، بەساسیری لە ڕەحبەی مەڵبەندی نوێیدا چەند بزووتنەوەیەکی هەڵگەڕانەوەی سەربازی و سیاسی بەئامانجی دەرکردنی سەلجووقیەکان لەبەغداد ئەنجامدا. لەسەر ئاستی سەربازی لەدوای ئەوەی سەلجووقیەکانی لەنزیك سنجار لە ساڵی (٤٤٨ك/ ١٠٥٦ز) دا تووشی شکستکرد، توانی دەستبەسەر موسڵدا بگرێت و خۆی بۆ چوونە ناو بەغداد ئامادەکرد[٤].

لەسەر ئاستی سیاسیش، وابەستەیی و پەیوەندی خۆی بە فاتیمیەکانەوە ڕاگەیاند و ووتاری بۆ خەلیفەی فاتیمی خوێندەوە کە جل و بەرگی بۆناردبو، ئەمە

---

١- إبن الأثير: ج٨ / ص ٧١.

٢- البنداري: الفتح بن علي بن محمد: اختصار تاريخ دولة ال سلجوق للإمام عمادالدين محمد الأصفهاني / ص ١٣.

٣- محمود والشريف: سەرچاوەی پێشوو: ص ٥٦٢.

٤- إبن الأثير: ج٨ / ص ٧٧.

چەند شڵەژان و بارگرژیەکی سەختی مەزهەبی لێکەوتەوە.[١] لەو کاتەدا توغرولبەگ بەدەست چەند سەختی و ناڕەحەتیەکی ناوخۆییەوە دەینالآند ئەمە ناچاری کرد تالە ساڵی (٤٤٩ك/ ١٠٥٧ز) دا لەبەغداد بچێتە دەرەوە و چووبەرەو موسڵ تا سنورێك بۆ ئەو گرفتانە دابنێت کە بە ساسیری لەدژی نابونیەوە، جا قەڵەمڕەوی خۆی بەسەر دیاربەکردا بڵاوکردەوە.[٢] پاشان گەڕایەوە بۆ بەغداد و لەوێ خەلیفە بەخێرهاتنەوەی کرد و نازناوی (پاشای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای) لێنا.[٣] ئەو نازناولێنانە بەڵگەی ئەوەیە کە خەلیفە دانی بەدەسەڵاتی توغرولبەگ لەو ناوچانەی لە ڕۆژهەڵاتدا لەژێر دەستیدان ناوە و مۆڵەتی پێدەدات تا ڕۆژئاوایش لەدەست فاتیمیەکان ڕزگار بکات[٤].

پاشان توغرولبەگ بەرەو ڕووی کێشەیەکی نوێ بویەوە کە ئەویش هەڵگەڕانەوەیەك بو کە ئیبراهیم یەنالی برای لەناوچەی شاخدا پێی هەستا. توغرولبەگ ناچار بو جارێکیتر لە بەغداد بچێتە دەرەوە تا ئەو هەڵگەڕانەوەیە سەرکووتبکات، بەساسیری ئەم دەرفەتەی قۆستەوە و لە (مانگی ذیلقەعدەی ساڵی ٤٥٠ك / کانوونی یەکەمی ساڵی ١٠٥٨ز) دا چوویە ناو بەغداد و ماوەی یەك ساڵی تەواو تیایدا ووتاری بۆخەلیفەی فاتیمی خوێندەوە.[٥] و خەلیفەیش بۆشاری(عانە)[٦] و پەنای بۆلای قورەیشی کوڕی بەدران بردو نامەی بۆ توغرولبەگ نووسی و هاواری بردە لای تا فریای بکەوێت.[٧]

---

١ـ هەمان سەرچاوە: ص ٧٧ ـ ٨٣

٢ـ إبن الأثير: ج٨ / ص ٧٧

٣ـ هەمان سەرچاوە: ص ٨٠.

٤ـ محمود والشريف: ص ٥٦٣.

٥ـ البنداري: ص ١٨ / الحسيني: ص ١٩.

٦ـ عانە: شارێکی ناسراوە لەنێوان (ڕقە) و (هیت) دا بەبەشێکی جەزیرە دادەنرێت دەکەوێت بەڕووی فوراتدا و لە نزیك (حديثة الفرات) یان (حديثة النورة) دایە ، بڕوانە: العمودی:ج٤ ص ٧٢.

٧ ـ إبن العبري: ص ١٠٤

خیلافەتی فاتیمی هێزی پێویستی بۆ یارمەتیدانی بەساسیری نەبو تا بەساسیری ئەو هەنگاونانەی بپارێزێت، متمانەیش بەو کەسە زۆر نەبو، بۆیە هەوڵی ڕێکوپێکی بۆ نەدا و وازی لێهێنا تاخۆی بەتەنها لەبەردەم هێزی سوڵتان توغرولبەگدا کە بەرەو بەغداد دەگەڕایەوە بوەستێت، سوڵتان لەدوای دەستبەتاڵبونی لە هەلگەڕانەوەکەی براکەی بەرەو عێراق گەڕایەوە بەساسیری ناچر بو لەبەر نەبونی توانای وەستانی لەڕووی سوپای سەلجوقیدا لە بەغداد بچێتە دەرەوە و دواتر لەساڵی (٤٥١ك / ١٠٥٩ز) دا کوژرا.

دوای ئەوەی توغرولبەگ چوویە بەغداد، داوای لە خەلیفە کرد تا بێتەوە بۆ پایتەختی خۆی و لە نەهرەوان پێشوازی لێکرد و کەیف و خۆشی خۆی بە گەڕانەوەی خەلیفە نیشاندا[1]. بەمجۆرە سەلجوقیەکان لە عێراق کاروباریان کەوتە دەست و لە ژیانی دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسیدا دیمەنێکی نوێیان نیشاندا، ئەوان هەڵوێستیان بەرامبەر بە خیلافەت بەشێوەیەکی گشتی لە هەڵوێستی بوەیهیەکان جیا بو،ئەوان لەبەر بیرو باوەڕ و پێگەیشتن و گەورە بونیان بە سوننە مەزهەبی ڕێزی خەلیفەیان دەگرت و بەئەرکی ئاینیان دەزانی.

لەلایەکی ترەوە سەلجوقیەکان توانیان لەژێر ئالای خۆیاندا سەر لەنوێ ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی یەکبخەن و سنوری لە ڕۆژئاوای ئاسیاوە تا سنوری بسفۆر لە ڕێگەی جیهدی دژ بە دەوڵەتی بیزەنتیەوە فراوان بکەن و دەستبەسەر زۆربەی وڵاتی شامدا بگرن و لە فاتیمیەکان بسێننەوە. پەیوەندی نێوان خیلافەتی عەبباسی و دەسەڵاتی سەلجوقی نزیکەی هەژدە ساڵ لەو کاتەوەی توغرولبەگ دەوڵەتەکەی خۆی لە خوراسان ڕاگەیاند باش و ڕێك و پێك بو، ئەو بارە سیاسیەی باسکراو هەردوو لای گرتبویەوە، وایکرد کە ئەو پەیوەندییانە بەهێزو پتەوبن.

بەڵام بەپەلە بەهۆی هەوڵی توغرولبەگ بۆ گرتنە دەستی هەموو دەسەڵاتەکانی عێراق بە دەسەڵاتەکانی خەلیفەیشەوە، هەروەها بەهۆی ئەوەی داهاتی دارایی عێراق برا بۆ خەزێنەی سەلجوقی لەبەر ئەمە ناکۆکی کەوتە نێوان هەردوولا،

---

١ـ إبن عمراني: ص ١٦١.

توغرولبەگ پێش ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ (ڕەی) پایتەختی خۆی، کارمەندێکی سەلجووقی لەشوێنی خۆی لەبەغداد دانا کە پێی دەوترا(العمید)[١] هەروەك بۆ پاراستنی ئاسایشی بەغداد کارمەندێکی تری دانا کە پێی دەوترا (شەحنە)[٢] کە فەرمانی دەردەکرد و قەڵەمڕەوێکی گەورەی تەنانەت بەسەر خەلیفەیشدا هەبو، لە بەغداد پارێزەرێکی سەربازیشی دانا و هەندێ شاری دایە دەست کەسە تایبەتەکانی خۆی[٣].

بەو جۆرە خەلیفە عەبباسی تەواو لە دەسەڵاتەکانی خۆی داڕنرا و نوێنەرو جێگیرانی سوڵتان بەتەنها دەسەڵاتیان بۆمایەوە ئەوەی زیاتر بارەکەی شێواند ئەوەبو کە سوڵتان هەوڵیدا خێزانی عەببسی و سەلجووقی لە ڕیگەی هاوسەرگیرییەوە پێکەوە ببەستێتەوە بۆیە داوای کچی خەلیفەی کرد، بەوەیش تەقلیدی خیلافەتی عەبباسی تێپەڕاند ئەمەش شتێك بو کەلە پێش ئەو هیچ کەسی تر هەوڵی بۆ نەدابو[٤].

پێشڕەوی سوڵتان بۆ ئەو هەنگاوە پێناوێك بو تا پاڵپشتی قەڵەمڕەوی سیاسی خۆی بە پەیوەستیەکی ئەدەبی بەهێز لەگەڵ خیلافەتی عەبباسیدا بکات، بەڵام ڕاستتر ئەوەیە کە سەلجووقیەکان چاویان بڕیبویە پایەی خیلافەت بەڵام لەبەرنەبونی مەرجی ڕەچەڵەك بەو پێیەی عەجەمیم نەیاندەتوانی بگەنە خیلافەت بیرکردنەوە لە هاوسەرگیری کچی خەلیفە لەلایەن توغرولبەگەوە بەو هیوایەی منداڵێکی هەبێت کە شەرعیەتی (ڕەوابونی) ڕەچەڵەك و هێز و توانای سەلجووقی هەبێت تا بگەیەنێتە پایەی خیلافەت.[٥]

---

١ـ إبن الأثير: ج٨/ ص٨٧.

٢ـ هەمان سەرچاوە: ص ٨٩.

٣ـ هەمان سەرچاوە: ٧٢ — ٨٩.

٤ـ البنداري: ص ٢١.

٥ـ امين، حسين: تأريخ العراق في العصر السلجوقي: ص ١٣٥ — ١٣٦.

پەرچە کرداری ئەم سلبی بو، خەلیفە قائیم بەوە تورە بو و سۆزشی بۆ سولتان هێنایەوە کەشتی واناکرێت، بەڵام سولتان رازی نەبو، لەکۆتاییدا ناچار بو لەساڵی (٤٥٥ک/ ١٠٦٣ز) دا رازیبێت و کچەکەی لێ بەهاوسەر بگرێت.[١]

کاتێ سولتان ئەلب ئەرسەلان لەساڵی (٤٥٥ک/ ١٠٦٣ز) دا دەسەڵاتی سەلجووقیە گەورەکانی گرتە دەست، باری دەسەڵات وە لەخۆی بو و خەلیفە دەسەڵاتی نەبو، جا لەساڵی (٤٥٨ک/ ١٠٦٦ز) دا سولتان مەلیکشاهی کوڕی خۆی وەك جێگیر لەدوای خۆی دەستنیشانکرد و فرمانیکرد تا لەهەموو ناوچەکانی ژێر دەستیدا وتاری بۆ بخوێنرێتەوە، لەو ناوچانەیش بەغداد بو بۆئەمەش ڕای خەلیفەی وەرنەگرت، بە شێوەیەکی ڕەسمی لە ساڵی (٤٦٤ک/ ١٠٧٢ز) دا واتە لەدوای شەش ساڵ هەواڵ بەخەلیفەدرا[٢]. لەهەمان ساڵدا سولتان ئەبولعەلاو موحەممەدی کوڕی حوسەینی وەك وەزیر دەستنیشانکرد بەبێ ئەوەی خەلیفە بزانێت، خەلیفە بەم هەڵسوکەوتە بێزار بو و بەدەستوەردانە کاروباری تایبەتی خیلافەتی لە قەڵەمدا و ئامادەنەبو پێشوازی لێبکات[٣].

لە سەردەمی سولتان مەلیکشاهدا خەلیفە بەرەو ڕووی سوکایەتیەکی زۆر بویەوە و هەندێ لە نوێنەرانی سولتان کەوتنە ئەوەی لەهەندێ دیمەنی دەسەڵاتی ئاینیدا لەگەڵیدا بەشداری بکەن، جا سەعدو دەولە کوهرائینی شەحنەی بەغداد لەبەردەرگای خەلیفەداو بەجیا لەخەلیفە لەکاتی نوێژدا تەپڵی لێدەدا.[٤] لە کۆتاییەکانی دەسەڵاتی ئەو سولتانەدا پەیوەندی خەلیفە لەگەڵیدا زیاتر خراپ بو تا ئەوەی بڕیاریدا خەلیفە لە بەغداد دەربکات و پایتەختی خیلافەت بۆ ئەسفەهان بگوازێتەوە تا ڕێخۆشکەری بێت بۆئەوە کچە زاکەی خۆی وەك خەلیفە دەستنیشان بکات.[٥] بەڵام قەدەر لەڕێی سولتاندا بو و خەلیفە لەدەستی ڕزگاری بو[١]. لە دوای

١ـ الحسيني: ص ٢١.

٢ـ إبن الأثير: ج٨ / ص ١٠٣ — ١١١.

٣ـ البنداري: ص ٤٥.

٤ـ هەمان سەرچاوە: ص ٥٥.

٥ـ إبن الأثير: ج٨ / ص ١٢٥ — ١٢٦.

مردنی مەلیکشاه لەساڵی (٤٨٥ك/ ١٠٢٩ز) دا دەوڵەتی سەلجووقیە گەورەکان بەهۆی ململانێی نێوان کوڕەکانی بەرەو ڕووی دابەشکاری و لاوازی بویەوە[٢].

بەمەیش ڕەنگی لەسەر باروذۆخی خیلافەتی عەبباسی دایەوە کە بەپێی بەرژەوەندی خۆی هەوڵیدەدا لەدەست کۆتی سەلجووقی ڕزگاری ببێت جا هەندێ هەلۆیستی ڕزگاریخوازی لەو ململانێیانە وەردەگرت، لەکاتێکدا هەندێ جاری تر پێی باشبو تا لەنێوان مەڵبەندەکانی هێز و دەسەڵاتدا دانی پێدا بنێت هەندێ جاریش لەیەك کاتدا مافی سوڵتانی بەچەند کەس دەدا تا هێزە سەلجووقیەکان بەگژی یەکدا بدات. خەلیفە موستەرشید و خەلیفەکانی دوای ئەویش ئەو دەرفەتەیان قۆستەوە و هەوڵیاندەدا دەسەڵاتەکانی خیلافەت بگێڕنەوە[٣]. دووری سەلجووقیە گەورەکان لە بەغداد یارمەتی ئەوەی دەدان بەجۆرێك خەلیفە لە کاریگەری ڕاستەوخۆی سوڵتانی سەلجووقی بەدوور بو خەلیفە لەو بوارەدا چەند هەنگاوێکی نا بەلام لە کۆتاییدا بو بە قوربانی ئەو هەوڵەی[٤]. دواتر موقتەفی لەکۆتا ساڵەکانی دەسەڵاتیدا توانی بەشێکی گەورەی ئەو ئامانجە بەدیبهێنێت کە موستەرسید نەیتوانی بەدیبهێنێت بۆ ئەمەش گەشەسەندنی بارودۆخی سیاسی لە دژی بەرژەوەندی سەلجووقیەکاندا بەهەند وەرگرت و ئەو بارەی قۆستەوە.

جا لەساڵی (٥٣٦ك/ ١١٤١ز) دا سوڵتان سنجری کۆتا سوڵتانی سەلجووقیە گەورەکان لەبەردەم قەرەخ تائیەکاندا شکستی خوارد هەروەك ململانێی بنەماڵەییەکانی سەلجوقیەکان لەساڵی (٥٤١ك/ ١١٤٦ز) لە هەریەك لە خوراسان و

---

١ـ إبن عمراني: ص ١٧٠ / إبن خلكان: ج٥ ص ٢٨٨ـ ٢٨٩.

٢ـ لەنێو ئەنجامەکانی ئەو ناکۆکیانەدا ئەوەبو کە سوڵتان مەسعودی کوڕی مەلیکشاه دەسەلاتی عێراقی جیاکردەوە، بەمەیش دەوڵەتی سەلجووقیەکانی عێراقی دامەزراند کەلە دەوڵەتی سەلجووقیە گەورەکان جیابویەوە کە خوراسان و ئێرانی بەدەستەوە بو.

٣ـArnold: the caliphate: p ٨٠

٤ خەلیفە موستەرشید هەوڵیدا سوود لەو ململانێیە وەربگرێت کە لە نێوان سوڵتان توغرولی کوڕی موحەممەد و سوڵتان مەسعوودی برایدا روویدا، سەبارەت بەو ڕووداوانە بگەڕێرەوە بۆ: إبن الأثير: ج٨ / ص ٣٤٥ـ ٣٤٩.

عێراقدا نوێبونەوە.

ئەمە لەکاتێکدا خەلیفە لە لایەنی سەربازییەوە مەڵبەندی خیلافەتی بەهێز دەکرد و فرمانی بەجەماوەر کرد تا چەك کۆبکەنەوە و بەدەوری بەغداد دا خەندەق لێبدەن و شورەکانی بەغدادی چاکسازیکرد.[١] ساڵی (٥٤٣ ك/ ١١٤٨ز) بەسەرەتای کرداریی بوژانەوەی خیلافەتی عەبباسی دادەنرێت ئەمەش لە ئەنجامی ئەوەی سوڵتان مەسعوودی سەلجووقی فەرمانڕەوایی عێراق نەیتوانی ئەو سەرکردەی ناوچانە ملکەچبکات کەلەدژی ڕاپەڕیبون ئەمە دەرفەتی ڕاپەڕاندنی دەوڵەتی بە خەلیفە بەخشی.

کاتێك سوڵتان مەسعوود لە ساڵی (٥٤٧ك/ ١١٥٢ز) دا مرد، دەوڵەتی سەلجووقی لە عێراق پایەیەکی گەورەی لەدەستدا و تووشی ڕاڕایی و لاوازی بو و بارگرژی و پشێوی دەوڵەتی گرتەوە ئەمە وایکرد بەرەبەرە قەڵەمڕەوی سەلجووقی لە عێراقدا کەمیکرد تا ئەوەی لەکۆتاییدا ئاوا بو. یەکەم ئیش کە خەلیفە موقتەفی لەدوای مردنی سوڵتان مەسعوود ئەنامیدا ئەوەبو کە دەستیگرت بە سەرشمەك و داراییەکانی شەحنەی بەغداد دا و ئەو کارمەندانەی لابرۆد کە سوڵتان داینابون و لەجیاتی ئەوندا کۆمەڵە کارمەندێکی دانا کە متمانەی پێیان هەبێت[٢]. پاشان سوپایەکی پێکهێناو لەگەڵ شەحنەی بەغداد دا جەنگاو و تووشی شکستی کرد حللە و کوفە و واسیتی لەدەست سەندەوە[٣].

خەلیفە سیاسەتی پێکدادانی هێزە سەلجووقیەکانی لەناویەکدا گرتە بەر تا سوود لە دابەشکاری سەرکردەکانی خێزانی سەلجووقی وەربگرێت، جا لە ساڵی (٥٥١ك/ ١١٥٦ز) دا سولەیمان شاهی مەحموودی وەك سوڵتان لەسەر عێراق دانا، هەورەها بەڵێنی جێگیرایەتی بۆ مەلیکشاهی کوڕی نووسی، پاشان هەردووکیانی نارد بۆ هەمەدان تا لەگەڵ سوڵتان موحەممەدی دووەمدا بجەنگن[٤].

---

١ـ إبن الأثير: ج٨ / ص ٣٥٢.

٢ـ هەمان سەرچاوە: ج٩ / ص ٣١ـ ٣٢.

٣ـ هەمان سەرچاوە: ج٩ / ص ٣٢.

٤ـ الراوندي: ص ٣٨٢، إبن الأثير: ج٩ / ص ٤٨ ـ٤٩.

لەدوای مردنی موحەممەدی دووەم لەساڵی (٥٥٤ك/ ١١٥٩ن) دا بارودۆخی دەوڵەتی سەلجوقیەکنی عێراق زیاتر دارما و جێگیرەکانی هەوڵیاندا قەڵەمڕەوی پێشوویان بگێڕنەوە بەڵام بەرەو رووی بەرهەڵستکاری خەلیفە بەهێزەکان بونەوە، بنجاری مێژوونوسی سەلجووقی ئەو هەڵوێست و بارە لاواز و پەرشوبڵاویە دەردەبڕێت و دەڵێت)لە بەغداد شان و شکۆ کەوتە دەروونیان، بەمەیش لاواز و پەککەوتەبون ئیتر هیچ پاشایی و دەسەڵاتێکیان بەسەریدا نەبو.[١]

خەلیفەکان لەخەباتی ڕێی ڕزگار بون لەکۆتی سەلجووقیدا بەردەوام بون تا توانییان لەسەردەمی خەلیفە ناسردا سەربەخۆیی تەواو لە سەلجووقیەکان وەربگرن، کاتێ دەسەڵات و قەڵەمڕەوی نوێی خیلافەت گەیشتە ئەو پەڕی بەهێزی بەهێزی و دەسەڵاتی سەلجووقیش لە عێراق و ڕۆژئاوای فارسدا لێکهەڵوەشا، بەڵام هەوڵەکانی خیلافەت بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی بەسەر فارسدا لەپەلو پۆی خست لەگەڵ ئەوەی توانی ئەهواز بگێڕێتەوە.

دەوڵەتی سەلجووقیە گەورەکان لەساڵی (٥٥٢ك/ ١١٥٧ن) دا بەکوژرانی سوڵتان سنجر لەسەردەستی غوزەکان کۆتایی پێهات لەکاتێکدا دەوڵەتی سەلجووقەکانی عێراق لەساڵی (٥٩٠ك/ ١١٩٤ن) دا بە کوژرانی سوڵتان توغرولی سێیەم لەسەردەستی عەلائەدین تکش خوارزمشاه کۆتایی پێهات.[٢] لە ئەنجامی ئەم گەشە سەندن و گۆڕانەدا دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی چوویە ماوەیەکی سەربەخۆیی تەواوە وەکە تا ساڵی (٦٥٦ك/ ١٢٥٨ن) درێژەی کێشا[٣].

---

١ـ البنداري: ص ٢٦٨.

٢ـ إبن الأثير: ج٩ / ص ٢٥٥ ـ ٣٢٠.

٣ـ الزهراني: سەرچاوەی پێشوو: ص ٦٧

# قۆناغی کۆتایی فەرمانڕەوایی دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی

## ٥٩٠ – ٦٥٦ ك / ١٠٥٨ – ١١٩٤ز

### دەوڵەتە ئەتابەگیەکان ـ شاهەکان ـ مەغۆل

لە ئەنجامی لاوازی سەلجووقیەکاندا لەکۆتاییەکانی سەردەمی دەسەڵاتیاندا دیاردەی درمەزرانی چەند دەوڵەتێکی جیا لەسەر حیسابی ئەوان دەرکەوت و لەبازنەی دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسیدا دەسوڕایەوە و بە دەوڵەتە ئەتابەگیەکان ناسراوبون کە لەبنەڕەتدا تورك بون (ئەتابەگ: ووشەیەکی تورکیە لەدوو ووشە پێك هاتووە، ئەتا : پەروەردەکەر، بەگ : ئەمیر واتەی ووشەکە بریتیە لە پەروەردەکەری ئەمیر).

ئەتابەگەکان لە ئەنجامی ئەو نیزامەی سەلجووقیەکان لەسەر بنەمای کڕینی مەمالیکە تورکەکان و هێنانیان بۆ خزمەتی کۆشکە سوڵتانیەکان بەتایبەت بۆ پەروەردەکردنی کوڕەکانیان وێڕای پیشە گشتیەکان دایانهێنابو پێگەیشتن و گەیشتنە پایە کارگێڕی و سەربازیەکان تا گەیشتنە پایە سەرکردایەتیەکان و لە هەڵگیرسانی ململانێی ناو خێزانی سەلجووقی لەدوای مردنی سوڵتان مەلیکشاهی یەکەم، دەرفەتی دەستگرتن بەسەر ناوچەکانی ژێر دەستیان قۆستەوە و لەفراونکردنی سنوریان لەسەر حیسابی یەکتری پێشبڕکێیان دەکرد، بەمەیش ململانێیەکی ئەتابەگی ناوخۆیی سەریهەڵدا و هاوبەرابەر لەگەڵ ململانێی ناوخۆیی سەلجووقیدا پێشڕەوی کرد.

ناودارترین ئەو ئەتابەگیانە بریتی بون لە : کیفا ـ ماردین ـ دیمەشق ـ دانشمەند ـ موسڵ ـ جەزیرە ـ ئازەربێجان ـ فارس.

لەپاڵ ئەو ئەتا بەگییانەدا چەند دەوڵەتێکی تر دامەزران ئەمەش لە ئەنجامی ئەوەی سوڵتانە سەلجووقیەکان لەو هەرێمانەی لەژێر دەسەڵاتیاندا بون نوێنەرین دادەنا ئەو نوێنەرانەیش دەسەڵاتی ئەو هەرێمانەیان بۆ خۆیان قۆرخ دەکرد و کوڕەکانیشیان بەمیراتیان دەگرت، نازناوی (شاهەکان) یان لێدەنرا، ناودارترین ئەو شاهانە بریتین لە : شاهەکانی خوارزم و شاهەکانی ئەرمینیا.

بەو جۆرە دەوڵەتە ئەتابەگیەکان و شاهەکانی خوارزم خاك و زەوی سەلجووقیەکانیان بەمیرات گرت، ئەمەش ڕێگەی بۆ دامەزراندنی قۆناغێك خۆشکرد کە تیایدا خەلیفە عەبباسیەکان سەربەخۆییان وەرگرت و چی دەسەڵاتێکیان هەبو گێڕایانەوە هەوەرك ئەو لاوازی ودابەشبونە دەرفەتی بە ڕۆژئاوای ئەورووپی دا تا دژ بەوڵاتانی ئیسلامی لەلایەك جەنگی خاچپەرستی بەرپابکەن، لەلایەکی تریشەوە مەغۆلەکان هان بدەن لەهەرێمەکانی ئەو دیوو رووبر و فارس و عێراق دا جیهانی ئیسلامی ببڕن و بیگرن و دواتر بەغدادیان وێرانکرد و دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسیان لەناوبرد.

لەبەر ئەوەی ئەو دەوڵەتە لەسەر دەستی ئەو مەغۆلانە رووخا، بۆیە هەردەبێت پوختەیەك لەمێژووی ئەو گەلە بخەینە روو پێش ئەوەی باسی بارودۆخی رووخنی دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی بکەین.

* سەرهەڵدانی مەغۆلەکان[١]:لە ڕاستیدا باری دەرچوونی مەغۆلەکان لە نشینگەی سەرەکییانەوە لەنێوەندی ئاسیاوە بە ئاڕاستەی جیهنی ئیسلامی، پەیوەندی بە مەودای ئەو پەیوەندیەوە هەیە کە لە نێوان مەغۆلەکان و نێوان دەوڵەتی خوارزمیدا هەبو، هەرکە سەرەتای سەدەی حەوتەمی کۆچی دەرکەوت جیهانی ئیسلامی کشانی سوپای زۆری مەغۆلی لەباکووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیاوە بەچەند شاڵاویکی دوور

---

١ـ د. فؤاد عبدالمعطي الصياد کتێبی (المغول فی التأريخ)ی نوسیوە، منیش وەرم گێڕاوەتە سەر زمانی کوردی و خانەی وەرگێران لە سلێمانی ئەرکی لە چاپدانی ل ئەستۆ گرت و بەچاپی گەیاند خوێنەر دەتوانێت بۆ شارەزایی زیاتری مێژووی مەغۆلەکان بڕوانێتە ئەو کتێبە، چونکە نووسەرەکەی نزیکەی (٢٠) ساڵێك سەرقاڵی ئەو مێژووە بوە. وەرگێڕ

و نزیــك بــەدیكرد، ئەمــەش لــە ڕوانگــەی سیاســی و ئــابوری و ئــایینی و ڕۆشەنبیرییەكانەوە كاریگەری دوور و نزیكی خۆی هەبو.

مەغۆلەكان كۆمەڵە هۆزێكی كۆی چەری بون كەلەبانی ناسراو بە بـانی مـەنغۆلیا لەباكووری بیابـانی (غـوبی) یـەوە سـەریانهەڵدا و لەسـەر لقـەكانی رووبـاری ئـاموور دەژیان دەستیان بەسەر زەویەكانی نێوان دەریاچەی بایكال لەرۆژئاوا و شـاخەكانی كانكان لەسەر سنوری مەنشووریا لە ڕۆژهەڵاتدا گرت.[١]

لـەناو ئەنـدامانی مەغۆلـدا تیمـۆ چـین هەڵكـەوت كـە هـۆزە مەغۆلیـەكان وەك سەركردەی خۆیان هەڵیانبـژارد، تیمۆ چـین نـاوی جـەنگیز خـانی وەرگـرت كەواتـە شـكێنەری جیهـان ئـەو ئیمپڕاتۆریـەتێكی فرەبەشـی دامەزرانـد كەلـەوڵاتی چـین لـە ڕۆژهەڵاتەوە تا سنوری عێـراق و دەریـای خـەزەر وڵاتـی رووس لـە ڕۆژئـاوا و وڵاتـی هیند لە باشوورەوە پەلیهاویشت.

*** باری فراوا نخوازی مەغۆل بە ئاراستەی جیهانی ئیسلامی :**

لـەو كاتـەدا خوارزمیـەكان لـە فـەرمانڕەوایی ناوچـەكانی ڕۆژهـەڵاتی جیهـانی ئیـسلامی لـە وڵاتـی ئـەو دیـو رووبـار و خوراسـان و ئێرانـدا شـوێنی سـەلجووقیان گرتەوەو سەركردەكانیان دەستیان وەردەدایە كاروباری خیلافەتی عەبباسـیەوە تـا بڕیاریاندا دەست بەسەر بەغداد دابگرن[٢].

عەلائـەدین موحەممـەد خوارزمـشاه كـە شـوێنی بـاوكی گرتـەوە دەیویـست دەستبەسـەر خیلافـەتی عەبباسـیدا بگرێت و دەسـەڵات لەدەسـت خـەلیفە ناسـری عەبباسی بسێنێت[٣].بەڵام ناچار بو لەژێر فـشاری مەغۆلیـدا كـە خـەریكبو وڵاتەكـەی

---

١ـ الجويني: عطا ملك: تأريخ قاهر العالم: ج١ / ص ٦٠.

٢ـ هەمان سەرچاوە: ج٢ / ص ٢٩ــ ٣٠.

٣ـ سوڵتان عەلائـەدین بیرۆكـەی دامەزرانـدنی خیلافـەتێكی عەلـەوی لـە شـوێنی خیلافـەتی عەبباسی بە دەروونیدا هات شیاوی باسە عەلائەدین مەزهەبی شیعەی وەرگرتبو، سـەبارەت بـە هۆكارەكـانی چـاو تێبڕینـی سـوڵتانی خـوارزمی بـۆ بەغـداد بڕوانـە: حـسین، محمـد عبدالباسـط عبدالهادی محمد، الشرق الاسلامی من ظهور السلاجقه حتی زوال دوله الخلافه العباسیه ببغـداد ـ ص ١٣٥ – ١٣٦.

دەگرت، وێڕای هۆکاری فشاری سەرکردەکان لەسەری ناچار بو پاشەکشە بکات[١]. لە ئەنجامی تێکچوونی پەیوەندی عەلائەدین خوارزمشاه لەگەڵ خەلیفەدا، خەلیفە داوای لە مەغۆل کرد تا بدەن لە سوڵتانی خوارزمی تا لەدەستی رزگاری ببێت و لە عێراق دووری بخاتەوە[٢]. بۆ ئەمە نامەی بۆ جەنگیزخان نووسی و هانیدا تا بپەڕنەوە بۆ جیهانی ئیسلامی و بەڵێنیپێدا تالە لێدانی خوارزمیەکان یارمەتی بدات.[٣]

بەڵام لەگەڵ ئەوەی ئەو نامە گەیشتە دەست مەغۆللەکان بەڵام هۆکاری هێرشی جەنگیزخان بۆسەر دەوڵەتی خوارزمی ئەوە نەبو، بەڵکو لەو کاتەی نامەکەی خەلیفە گەیشت، سەرکردەی مەغۆلی بەرەو ڕێی ڕۆژئاوا درێژەی بە داگیرکارییەکانی دەدا تا وڵاتەکەی گەیشتە سنوری دەوڵەتی خوارزمی و توانی پەیماننامەیەکی بازرگانی لەگەڵ خوارزمیەکاندا ببەستێت، بۆیە هیچ گوێی بە نامەکەی خەلیفە نەدا[٤].

کارەساتەکە هاتبو بەڵام هۆکاری ڕاستەوخۆی ئەو کارەساتە دەگەڕێتەوە بۆ یەکێك لە دەستە نێردراوە بازرگانیەکان کاتێك جەنگیز خان کاروانێکی بازرگانی بۆ ڕۆژئاوای ئاسیا نارد تا لە بازاڕەکانی دەوڵەتی خوارزمیدا بازرکاتێك گانی بکەن، کاتێك کاروانەکە گەیشتە شاری ئوتدار لەسەر رووباری سەیعون یەنال خانی فەرمانڕەوای شارەکە دانی بەسەریدا و هەموو ئەندامەکانی کوشت و شمەکەکانی بردن[٥].

جەنگیز خان نەیدەتوانی چاوپۆشی لەو کارە بکات بەتایبەت دوای ئەوەی سوڵتان عەلائەدین ڕازی نەبو فەرمانڕەوایی ئۆترار بداتە دەست جەنگیز خان بۆیە سوپایەکی بێشوماری ئامادەکرد و لەساڵی (٦١٧ك / ١٢٢٠ ز) دا هێرشی کردە سەر

---

١ـ إقبال: ص ٣٣٢ ـ٣٣٣.

٢ـ إبن الأثير: ج٩ / ص ٣٦١.

٣ـLamb. H: jenkis khan: p ١١٦.

٤ـCurtin: the Mongols: p ٩٩

٥ـ النسوي: سيرة جلال الدين منكبرتي: ص ٨٦.

زەویەکانی خوارزمی و و دەستیگرت بەسەر هەرێمی ئەو دیو رووبار دا و پایتەختی خوارزمی داگیر کرد[١].

عەلائەدین لەساڵی (٦١٨ ك / ١٢٢١ ز) بەڕاکردوویی لەدەست مەغۆل کە دەستیان بەسەر خوراساندا گرتبو لە دورگەیەکی دەریای قەزویندا مرد[٢]، لەساڵی (٦١٩ ك / ١٢٢٢ ز) دا جەنگیز خان هەرێمەکانی ڕۆژئاوای بەجێهێشت لە دوای ئەوەی دەسەڵاتی مەغۆلی لەهەرێمی ئەو دیو رووبار وو خوراساندا بە شێوەیەکی یەکجارەکی چەسپاند[٣].

١ـ بۆ رووداوەکانی روخانی ولاتی ئەو دیو روبار بڕوانە: الجوينى: ج١ / ص ١١٠ – ١٣٥.

٢ـ النسوي: ص ٢٣.

٣ـ العريني، السيد الباز: المغول ص ١٤٢.

# رووخانی دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی

لەدوای مردنی جەنگیز خان لەساڵی (٦٢٤ ك / ١٢٢٧ز) دا مەغۆل لە چوارچێوەی سیاسەتێکی فراوانخوازیدا بەرەو ناوچەکانی ڕۆژئاوای ئاسیا کشان، مەنگۆ خان کەلەساڵی (٦٤٦ ك / ١٢٢٨ز) دا سەرکردایەتیکردنی مەغۆلی گرتە دەست، هۆلاکۆی برای ڕاسپارد تا سەرکردایەتی شاڵاوێك بۆ سەر فارس بکات و وەسیەتی بۆ کرد تا دەسەلاتی مەغۆلی بەسەر ناوچەکانی نێوان عێراق تا ئەو پەڕی میسردا بلاوبکاتەوە چوار چێوەی پەیوەندیشی لەگەڵ خەلیفەدا بۆ دەستنیشانکرد بە جۆرێك ئەگەر خەلیفە پشتیوانی و گوێڕایەڵی نیشاندا باوازی لێبهێنێت، بەلام ئەگەر سەرکەش بو دەبێت لەناوی ببات تا بون و مانی نەبێتە بەربەستی ڕێی کشانی مەغۆلی[1].

هۆلاکۆیش لەلایەن خۆیەوە نەخشەیەکی سەربازی دانا کە هەنگاوی یەکەمی لەناو بردنی ئیسماعیلیەکانی لەخۆ دەگرت، پاشان هێرش بکاتە سەر ناوچە ڕۆژئاواییەکان تا لەقۆناغی دووەمدا بگاتە میسر، پاش ئەوەی ئامانجی یەکەمی خۆی بەدەیهێنا، هەنگاوی بۆ بەدیهێنانی ئامانجی دووەمی نا.

لەوکاتەدا بارودۆخی بەغداد تەواو خراپ بو، خەلیفە موعتەسەمی عەبباسی واناسراو بو کە لەکارگێری کاروباری گشتیدا تەمبەڵە[2]. جا خۆی بۆ بەرەنگاربونەوەی کشانی مەغۆلی ئامادەنەکرد بو و وای دەزانی دەتوانێت لەبەردەم مەترسیدا بوەستێت[3]. هەروەك لەو کاتەدا مەڵبەندەکانی هێزی بەغداد زۆر بون و لەبەر چەند هۆکارێکی سیاسی و مەزهەبی لەنێوان خۆیان ناکۆك بون خەلیفەیش دەستەوەستان وەستا بو و نەیدەتوانی سنورێك بۆ ئەو گرفتانە دابنێت، لە ئەنجامی ئەمەدا ناکۆکیەکانی نێوان موجاهیدەدین ئەیبەك دواتداری بچووك کە

---

١ـ رشيد الدين: *جامع التواريخ، تاريخ المغول في ايران*، ج٢ / ص ٢٣٦ — ٢٣٧.

٢ـ إبن الطقطقا: *الفخري في الأداب السلطانية*: ص ٣٣٣.

٣ـ الصياد، فؤاد عبدالمعطي: *المغول في التأريخ*: ص ٢٥٢.

سوننە مەزهەب بو لەگەڵ موئەیەدەدین ئیبنولعەلقەمی[١] وەزیری موعتەسەمدا کە شیعی بو، تەواو زیادیان کرد، ئەمەش کاریگەری خراپی لەسەر شێوازی بارودۆخ و کاروبارەکان و لەپەلوپۆ خستنی دەسەڵاتی خیلافەت هەبو[٢].

تا کۆکیەکان لە بازنەی دەسەڵاتداراندا چوویە دەرێ و گوازرایەوە بۆناو دانیشتوانی بەغداد کەلەململانێیەکی مەزهەبیدا لەنێوان خۆیاندا دابەشبو بون[٣]، ئەمە پاڵی بە وەزیر ئیبنو لعەلقەمی یەوە نا تالەگەڵ مەغۆلەکاندا ڕێکبکەوێت و تەماعی گرتنی بەغدادی خستنە بەر[٤].

لە ڕاستیدا ئەو پەیوەندییانەی نێوان هەردوولا و ئەو توێژانەی لە دواتردا لە نێوانیاندا بەڕێوە چوو، کاریگەریەکی گەورەی لەسەر ئەوە نەبو کە هۆلاکۆ هانبدات تا هێرشبکاتە سەر بەغداد چونکە دەستگرتن بەسەر عێراقدا لە چوارچێوەی سیاسەتی گشتی مەغۆلیدا بو.

لەو بارە سەخت و ناهەموارەدا هۆلاکۆ داوای لە خەلیفە کرد تا بۆ لەناوبردنی دەستەی ئیسماعیلیەکان بە سوپایەك یارمەتی بدات، موستەعسەمیش ڕاوێژی بە یاریدەدەرەکانی کرد، ئەوانیش ئامۆژگاریانکرد تا ئەو کارە نەکات چونکە هۆلاکۆ دەیەوێت بەو هۆکارە بەغداد لە بەرگریکارانی چۆلبکات تا کاتێك هێرشی دەکاتە سەر بەئاسانی دەستیبەسەردا بگرێت، ئەویش بە گوێی کردن و ئامادە نەبو سوپا و یارمەتی بۆ هۆلاکۆ بنێرێت[٥].

---

١ـ ئەو کەسە ناپاکە بو کە ڕێی بەغدادی نیشانی مەغۆلەکان دا، ئەگەر نا مەغۆلەکان خۆیان نیازی گرتنی بەغدادیان هەبو، بەڵام ئیبنولعەلقەمی شیعە مەزهەب بێباوەڕان و دڕندە گەلی مەغۆلی لە خواپەرستان و ئوممەتی خاوەن ژیار و شارستانیەت پێ باشتر بو، بۆیە کەوتە ڕێنیشاندانیان بەڵکو سبەینێ لە پارویەك نان بێبەش نەبێت کەچی دواتر بویە قوربانی دەست دۆستەکانی. وەرگێڕ.

٢ـ صفا، ذبيح الله: تاريخ أدبيات ايران: ج ٣ / ص ١٢٠.

٣ـ السيوطي: تاريخ الخلفاء: ص ٤٦٥.

٤ـ هەمان سەرچاوە.

٥ـ لە کتێبی (فتح بغداد) کە دراوەتە پاڵ نصيرالدين الطوسي و پاشکۆی کتێبی (تاريخ قاهر العالم) ی الجويني: ج٢ / ص ٣٦٣ بگەڕێرەوە بۆ نامەکە.

کاتێ هۆلاکۆ لە لەناوبردنی ئیسماعیلیەکان بویەوە، نامەیەکی سەرکۆنەی بۆ خەلیفە نارد کە هەڕەشەو گورەشەی لە خۆ دەگرت لەبەر ئەوەی کە ئەو سوپایەی نەناردبو لە ڕاستیدا ئەمە وەك ڕیشەی داخوازی ئەو دەسەلاتە کاتیە بو کە پێشتر لە بەغداد درابو بە سەرکردە بوەیهیەکان و دواتر سوڵتانە سەلجووقیەکان [١]. ئەو داوای لە خەلیفە کرد تا:

ـ قەلاکان بڕوخێنێت و خەندەقەکان پڕ بکاتەوە و ولاتەکە بداتە دەست کوڕەکەی.

- خۆی بچێت بۆلای یان وەزیر سولەیمانشاه و دواتدار بنێرێت [٢].

خەلیفە بەرپەچی هەڕەشەو گورەشە ئامێزی نامەکەی دایەوە و پێی وابو دواتر هۆلاکۆ لەو بڕیارەی پاشگەز دەبێتەوە و وای لێدەکات پێش ئەوەی نەخشەکەی جێبەجێ بکات چاك بیر بکاتەوە.

خەلیفە هیوای وابو سەرکردە موسڵمانەکان یارمەتی بدەن، بەلام لەو پێشبینیەیدا هەڵەی کرد چونکە ئەیوبیەکان لە ولاتی شام و مەمالیکەکان لە میسر کە هەموو هیوایەکی خەلیفە بەو دوانەبو، هێندە گرفتیان هەبو کە نەیاندەتوانی یارمەتی بدەن ئەتابەگ و تورك و فارسەکانیش لەتاو ترسی مەغۆلەکان هیچ یارمەتییان نەدا، سەلجووقیەکانی ڕۆمیش ملکەچی دەسەلاتی هۆلاکۆ بون [٣].

بەو جۆرە جیهانی ئیسلامی پەرشوبلاوی دەرکەوت و بەعەقڵدا نەدەهات سەرکردەکانی هەوڵی رزگارکردن و فریاکەوتنی خەلیفە بدەن کە خەلیفەیش دەقێکی حەقیقی بەدەستەوە نەبو تا بتوانێت بەرامبەر ئەو بارە سەختە بوەستێت جا ئەو هەڵوێستە بەرپەرچدانەوەی عەبباسیەکاریگەری زۆر خراپی لەسەر دەروونی هۆلاکۆ هەبو و پاڵی پێوە نا تا بەرەو بەغداد بکشێت.

نێردراوانی خەلیفە گەیشتە لای هۆلاکۆ، کاتێ هۆلاکۆ نامەکەی خوێندەوە و زانی نێردراوەکانی لە بەغداد تووشی چ نارەحەتیەك بون، تورەیی دایگرت و

---

١ـ الصیاد: ص ٢٥٥.

٢ـ رشید الدین: جامع التواریخ: سەرچاوەی پێشوو: ج٢ / ص ٢٧١.

٣ـ العریني: ص ٢١٦ـ ٢١٧.

نێردراوەکانی موعتەسەمی ناردەوە و نامەیەکی تری پێدان کە هەڕەشەی کۆتایی هۆلاکۆی بەشێوازێکی توندلەخۆ دەگرت[1]. کاتێك نێردراوەکان گەڕانەوە بۆ بەغداد و خەلیفەزانی هۆلاکۆ چۆن هەڕەشە و گوڕەشەی لێدەکات، نامەکەی خستە بەرچاوی گەورە پیاوانی دەوڵەتەکەی تا ڕایان وەربگرێت، ئیبنولعەلقەمی وەزیری ئاماژەی پێدا تا ماڵ و سامان و خەڵات و دیاری کۆبکاتەوە و بینێرێت بۆ هۆلاکۆ و پۆزشیشی بۆ بهێنێتەوە و وتارو دراو بەناویەوە بێت[2]. وەك ئەو شێوازەی لە ڕۆژانی بوەیهی و سەلجوقیەکاندا باوبو، خەلیفە ئەو ڕایەی پێ باشبو تابیگرێتە بەر. بەڵام موجاهیدەدین ئەیبەگ دواتداری بچووك کە هێزی سوپای لە دەستبو و پاڵپشتی ڕەگەزی سوننی لە بەغداد دەکرد، ڕاکەی وەزیری ڕەفزکرد و لەسەر بەرگریکردن سوور بو ئەو کات خەلیفە وازی لە ڕاکەی هێنا و بەرگریکردنی هەڵبژارد[3].

بەمجۆرە نامەکانی نێوان هەردوولا هیچ کاریگەرییەکیان نەبو و هەردەبو جەنگ ڕووبدات[4]، کاتێك هۆلاکۆ دڵنیابو دەتوانێت بەبێ ئەوەی بەرەو ڕووی ناڕەحەتی و گرفت بێتەوە بەرەو عێراق بچێت و هێزەکانی دەتوانن دەستبەسەر بەغداد دابگرن، کەوتە جێبەجێکردنی ئەو نەخشە سەربازییانەی کەلەکاتی نیشتەجێبونی لە هەمەدان دایانڕشتبون و فرمانی دەرکرد تا سوپا مەغۆلیەکان بە ئاڕاستەی پایتەختی خیلافەت بجوڵێن، کاتێك لە (سیانزەی مانگی موحەڕەمی ساڵی ٦٥٦ ك/ مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٢٥٨ ز)دا گەیشتە بەغداد و گەمارۆیەکی توندی لەسەر دانا و هۆلاکۆ خۆی لە سەربازگەکەی لە دەرەوەی شارەکە لە بەرەی ڕۆژهەڵاتەوە سەقامگیر بو[5].

---

١ـ رشيد الدين: جامع التواريخ: ج ٢ / ص ٢٧١.

٢ـ هەمان سەرچاوە: ص ٢٧١.

٣ـ هەمان سەرچاوە: ص ٢٧٢.

٤ـ حسن ابراهيم حسن: تاريخ الإسلام ج٤ / ص ١٥٦.

٥ـ إبن العبري: ص ٣٠٧.

کاتێك خەلیفە سەختی باری خۆی بینی، ویستی مەغۆلەکان هێوربکاتەوە و لەبڕیارەکەیان شلیان بکاتەوە تا هێرش نەکەنە سەر بەغداد، بۆیە نێردراو و دیاری نارد بۆ هۆلاکۆ[١]. بەڵام هۆلاکۆ ئامادەنەبو وەڵامی ئەو بانگەوازە بداتەوە و نەخشەیەکی سەربازی بەجێگەیاند تالەپێش ئەوەی سەربازەکانی بچنە شارەکە، بەرگریکاران لە بەغداد دەربکات بۆیە نەسرەدینی تووسی نارد بۆلای خەلیفە و فەرمانی پێکرد تا سولەیمان شاە ودواتداری بۆ بنێرێت، خەلیفەیش ناچار بو بیاننێرێت کاتێ ئەو دوانە گەیشتنە لای هۆلاکۆ گەڕاندنیەوە بۆ بەغداد تا لەگەڵ شوێنکەوتە سەربازانیاندا بێنەوە بەو بیانووەی دووریان دەخاتەوە بۆ شام و میسر، بەمەیش سەربازانی بەغداد و خەڵکێکی زۆر لەگەڵیاندا چوونە دەرێ[٢].

کاتێ ئەو هەمووە چوونە دەرەوە هۆلاکۆ فەرمانیکرد تاهەموویان بکوژن[٣]. ئەو کات هەڵوێستی خەلیفە دەرکەوت و کاتێك زانی هیچ ڕێگرێك لەبەردەم هاتنی مەغۆل بۆ ناو بەغداد نیە بڕیاری خۆ بەدەستەوەدانی دا.

دوو ڕۆژی بەسەردانەچوو تا مەغۆلەکان بە بەڵێنی درۆ هەڵیانخەڵەتاند ئیبنولعەلقەمی لەو پیلانە دا بەشداری کرد و خەلیفەی ڕازیکرد کەهەردەبێت خۆی بدات بەدەستەوە چونکە ئەو ڕێگەی ڕێککەوتنی خۆشکردووە و دواتر هۆلاکۆ و مەغۆلەکان بە گوێڕایەڵیەوە دێنە خزمەتی[٤].

ئیبن کەثیرباس لەوە دەکات کە وەزیر ئیبنولعەلقەمی لەگەڵ کەسوکاری و ماڵ و منداڵ و هاوەڵ و سەربازانیدا لەگەڵ هۆلاکۆ دا کۆبویەوە، پاشان فەرمانی بە خەلیفە کرد تا بێتە دەرەوە بۆلای ئەو بێتە بەردەمی تا ڕێککەوتن لەسەر ئەوە بکەن کەنیوەی خەراج بۆ هۆلاکۆ و نیوەکەی تری بۆ خەلیفە بێت[٥].

---

١ـ الصياد: ص ٢٦٢.

٢ـ هەمان سەرچاوە.

٣ـ رشيد الدين: جامع التواريخ: ج٢/ ص ٢٩٠.

٤ـ الصياد: ص ٢٦٣.

٥ـ إبن كثير: البداية والنهاية: ج١٣ / ص ٢٠١.

لە ڕۆژی یەکشەممەدا (چواری مانگی سەفەری ساڵی ٦٥٦ ك / مانگی شوباتی ساڵی ١٢٥٨ز)دا خەلیفە لە بەغداد چوویە دەرەوە و خۆی و پایتەختەکەی بەبێ هیچ کۆت و مەرجێك دایە دەست مەغۆل لەدوای ئەوەی هۆلاکۆ بەڵێنی پەنادانی پێدابو[1].

ئەو کات سەربازانی مەغۆل چوونە شارەکەو ماوەی یەك هەفتە کەوتنە ئاژاوەگێڕی و مزگەوتەکانی بەغدادیان وێرانکردن و چی دیاری نایاب لە کۆشکەکاندا هەبون بردنیان و ژمارەیەکی زۆری کتێبی گرانبەهایان لە کتێبخانەی بەغداد داپێچانەوە و زۆربەی زانایانی بەغدادیان لەناو بردن و پێشەوایانی مزگەوت و قورئان خوێن و قورئان بەدەستانیان کوشتن و خوێندنگەکان لە خوێندن کەوتن و شارەکە هیچی بەسەر هیچەوە نەما[2].

لەکوچە و کۆڵانەکاندا جەستە و تەرم لەسەر یەکتر دەکەوتن، پاشان نەخۆشی و دەرد بڵاوبویەوە و زۆرێك لەوانەی ڕزگاریان بو بو بەو نەخۆشی و دەردە لەناو چوون[3]. ئەو ڕووداوانە بە کوشتنی خەلیفە موعتەسەم و ئەبولعەبباس ئەحمەد و ئەبولفەزائیل عەبدوڕەحمانی کوڕی و گیرانی موبارەکی کوڕە بچووکی و سێ خوشکەکەی (فاتیمە و خەدیجە و مەریەم) کۆتاییان پێهات[4].

بە کەوتنی بەغدادوکوژرانی خەلیفە موعتەسەمی عەبباسی دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی کە زیاتر لە پێنج سەدە تەمەنی کردبو کۆتایی پێهات، هێندە ماوە بڵێین ئەو ڕووداوانە بونە هۆی ئەوەی پایەی خیلافەت چۆل بێت و هەر سەرکردەیە لە هەوڵی بردنی بدات، جا کاتێك سوڵتان زاهیر بیبرسی مەملووکی کورسی دەسەڵاتی میسری گرتە دەست، بە شوێن ئەندامێکی بنەماڵەی عەبباسیدا گەڕاو لەساڵی (٦٥٩ ك/ ١٢٦١ز) لە میسردا کردی بە خەلیفە، لە ڕاستیدا سوڵتانی مەملووکی ئامانجی

---

١ـ الصیاد: ص ٢٦٣.

٢ـBrown: literary hist of Persia: ii p ٤٦٣

٣ـ إبن کثیر: ج ١٣ / ص ٢٠٣.

٤ـ هەمان سەرچاوە: ص ٢٠٥، الطوسی: سەرچاوەی پێشوو: ص ٣٧٠.

ئەوە بو بەهی دانانی خەلیفەوە سیفەتی شەرعی بە دەسەڵاتەکەی بدات چونکە خەلیفە دانی بە سوڵتانی ئەو دانا، ئەو بارە لەمیسر بەردەوام بو تا لەساڵی (٩٢٣ ك / ١٥١٧ز) دا سوڵتانی عوسمانی سەلیمی یەکەم بارەکەی گرتە دەست و پایەی خیلافەتی وەرگرت و ئەو دیمەنە کۆتایی پێهات.

سوڵتانە عوسمانیەکان پایەی خیلافەتیان گرتە دەست و لە ئەستەمبۆڵی پایتەختیانەوە تا ساڵی (١٩٢٤ز) کارگێری کاروباری جیهانی ئیسلامیان دەکرد تالەو ساڵەدا کەمال ئەتاتورك کودەتای بەسەر خیلافەتدا ئەنجامدا لەو کاتەوە تا ئێستا جیهانی ئیسلامی خەلیفەیەکی نیە تا پایەی چۆلی خیلافەت پڕبکاتەوە.

# کۆتایی

گرتنە دەستی کورسی خیلافەت لەلایەن ئەبولعەبباسی سەففاحەوە بە مۆڵەتی سەرەتای قۆناغێکی نوێی سیاسی قۆناغەکانی مێژووی ئیسلامی دادەنرێت کە تیایدا عەباسیەکان دەسەڵاتیان گرتە دەست و پەیڕەوی سیاسەتیان کرد و وەك ئومەویەکان نیزامی دەسەڵات بە نیزامی پاشایەتی میراتگری مایەوە و چەندین دیمەنی خۆشگوزەرانی لەگەڵدابو کە لە کۆشکەکانی عەبباسیەکاندا دەردەکەوت.

بەڵام ئەو نیزامە لەلایەنی پەیوەندی لەگەڵ دەستەکانی کۆمەڵگای ئیسلامیدا ڕێڕەوێکی نوێی لە ڕێڕەوی بزاوتی خۆیدا گرتە بەر ئەمەش بەو جۆرەی پشتی بە رەگەزی ئیسلامی ناعەرەب بەست ئەو ڕەگەزانەی کەلەو کۆمەڵگەیەدا تێکەڵبون، لەگەڵ ئەمەشدا عەرەب پایەی خیلافەت و زۆربەی پایە سەرکردایەتیەکانی لەدەستدا بون. لە ئەنجامی ئەمەدا سەردەمی عەبباسی یەکەم لەگەڵ پاراستنی دیدی عەرەبی خۆیدا، مۆرکی فارسی پێوە دیار بو، ئەمە بویە هۆی تێکەڵبونێکی سیاسی و ژیاری کە لە تێکەڵ بونی سیاسیەوە ڕەگداکوتانی قەڵەمڕەوی فارس لە کارگێریەکانی دەوڵەتدا هاتە بەرهەم لە کاتێکدا لە تێکەڵبونی ژیارییەوە سەرهەڵدانی رۆشەنبیریەکی نوێ هاتە بەرهەم کەلەسەر ڕۆشەنبیری فارسی وەك لە چوارچێوەیەکی گشتی لەچەند بوارێکی عەرەبی ڕاوەستا بو.

ئەبوجەعفەر پیاوی پێویستی ڕۆژ بو تا مەڵبەندی سەرکردایەتی پڕ بکاتەوە و بەدامەزرێنەری حەقیقی دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی دادەنرێت، کە بەرهەڵستکاران و لەدەسەڵات دەرچووانی لەناوخۆ و دەرەوەی بنەماڵەی عەبباسیدا لەناو برد لەهەمان کاتدا پارێزگاری سنوری دەوڵەتی خیلافەتی لەگەڵ دەرەوەدا کرد.

لەگەڵ ئەو بەربەست و تەگەرانەی بەرەو رووی عەبباسیەکان بونەوە بەڵام توانیان پاڵپشتەکانی نیزامێکی نوێ دابکوتن، کە باری سیاسی و کۆمەلایەتی

گرنگی و پایەو پێگەی دەوڵەتی ئیسلامی دەیخواست، جا هۆشی ئیسلامی لەبەردەم ئەو گەشەسەندنە ژیارییانەی جیهانی ئیسلامی یەخۆیەوە دی، چەقبەستوو نەبو، بەڵکو لەگەڵیدا کارلێکی کرد و نیزامێکی لێبەرهەم هات کە لەگەڵ ڕێباز و بنەما باڵاکانی ئیسلامدا دەگونجا و لەو چوارچێوە گشتیەدا دەچوویە دەرەوە کە قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەرﷺ دەستنیشانیان کردووە، هەروەهابەرژەوەندی باڵای ئیسلام و بەرژەوەندی ئوممەتی لە رووی باری سیاسی و ئایینی و دنیایی و ئاراستەکانی سەردەمەوە یەك دەخست، جا کرانەوەی ژیاری بەسەر رۆژهەڵاتدا بەشێوەیەکی تایبەت و رۆژئاوایشدا یەکێك لەو هەنگاوە گرنگانە بون کە بۆگرتنە بەری هۆکاری پێشکەوتن نرا، جێگیرایەتی یەکێك لەو هەنگاوە گرنگانە بو کە عەبباسیەکان لە پێناو چەسپاندنی جێپێی بنەماڵەکەیان و پاراستنی دەسەڵات و درێژەدان بە پەیڕەوی دەسەڵات گرتیانە بەر لەژێر سایەی بەرهەڵستکاری تالیبیەکان بەشێوەیەکی تایبەت کە رقیان لە دەسەڵات و وەرگرتنی عەبباسیەکان بو لە کاتێکدا بەهیوای وەرگرتنی دەسەڵات پاڵپشتی شۆڕشی عەبباسیان کرد، چونکە پێیان وابو خیلافەت مافی شەرعی ناو بنەماڵەی ئیمامی عەلی یە، بە درێژایی سەردەمی یەکەمی عەبباسی بەرهەڵستکاری تالیبیەکان چالاك بو تا توانیان لە سەردەمی دووەمی عەبباسیدا چەند دەوڵەتێکی جیاخوازی لە ڕۆژئاوا و رۆژهەڵاتدا بنیاد بنێن و هەندێ جار رکەبەری دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسیان دەکرد و دەبونە مەترسی لەسەر بونی، خەواریجەکانیش لە ڕۆژئاوا چەند دەوڵەتێکی جیا خوازیان دامەزراند، هەروەك عەبدورەحمانی داخلی ئومەوی لە ئەندەلوس دەوڵەتێکی جیای دامەزراند.

لەگەڵ کۆتاییەکانی سەردەمی عەبباسی یەکەمدا جیهانی ئیسلامی لەگەڵ پاراستنی خیلافەتی رۆحیدا خەریکبو دابەشبونی سیاسی تووش دەبو، بەڵام عوبیدیەکان بەهیچ جۆرێك دانیان بە خیلافەتی عەبباسی نەدەنا.سەرچاوەی ئەو دیاردەیە دەگەڕێتەوە بۆ لاوازی کەسایەتی خەلیفەکان و فراوانبونی دەوڵەت و سەختی پەیوەندی نێوان بەشەکانی تا ئەوەی خەلیفەکان نەیاندەتوانی چاودێری

کرداری لەسەر والیەکانیان لە هەرێمەکاندا دابنێن وێڕای ئەوەی ڕەگەزە ئیسلامیە ناعەرەبەکانیش لە هەوڵی زیندوکردنەوەی شکۆ و بالآیی کۆن و پێشویاندا کەوتنە هەوڵی جیاخوازی. دیمەنی جیاخوازی کاری کردە سەر مەڵبەندی خیلافەت و لەسەرەتاوە ئەمیری ئەمیرانی تورکەکان وفەرمانڕەوایانی دەوڵەتە جیاخوازیەکان لەسەر حیسابی خیلافەت دەرکەوتن و خەلیفە وەلانرا و لە کۆتاییدا هەموو تایبەتمەندیەکانی وەك سەرچاوەی یەکەمی دەسەلآتی دەوڵەت لە دەستدا و خەلیفەکان هەندێ جار بەرەو رووی لابردن و دەستبەسەر داگرتن و کوشتن دەبونەوە.

لاوازی و لێکهەڵوەشانی خیلافەت لەسەردەمی عەبباسی سێیەم لەبەردەم دەرکەوتنی هێزی بوەیهیە شیعەکاندا بەردەوامبو بەڵام لەکۆتاییەکانی سەردەمی بوەیهیدا خەلیفە قائیمی عەبباسی باری دارمانی و سیاسی دەسەلآتی قۆستەوە و هەندێ سەلاحیاتی خیلافەتی گێڕایەوە لەو کاتەدا تورکە سەلجووقیەکان توانیان لەسەر شوێنەواری غەزنەوی و بوەیهیەکان لە رۆژهەلآتدا دەوڵەتێك بۆخۆیان دابمەزرێنن و بەرەو عێراق و دەوڵەتی بوەیهیان لەناوبرد و لەدەسەلآتدا شوێنی بوەیهیەکانیان گرتەوە، و هەموو دەسەلآتەکانی دەوڵەتیان گرتە دەست و بەردەوام خەلیفەکان تەنانەت لە پایتەختی خیلافەتیشدا لەدەسەلآتی خۆیان داڕنرابون، بەڵام لەبەرئەوەی سەلجووقیەکان سوننە مەزهەب بون بۆیە هەڵسو کەوتیان لەگەڵ خەلیفەکاندا لە بوەیهیەکان باشتر بو، ئەوان لەسەر ئەوە سوور بون کە خیلافەتی عەبباسی بمێنێتەوە تا بەئاسانی بتوانن بەسەر ڕکە بەرەکانیاندا کە پشتیوانانی مەزهەبی شیعی بون سەرکەون و پاڵپشتی جیهانی ئیسلامی سوننی بەدەست بهێنن.

لە کۆتاییەکانی سەردەمی سەلجووقیدا سەلجووقیەکان لاوازبون و پەیوەندی نێوان خەلیفە عەبباسیەکان و سوڵتانە سەلجووقیەکان مۆرکێکی تەواو جیا لە پەیوەندیەکانی ماوەی یەکبونی سەلجووقیەکان لەخۆ گرت، جا خەلیفەکان ئەو دەرفەتەیان قۆستەوە و کەوتنە هەوڵی گێڕانەوەی دەسەلآتی خیلافەت ئەمەش لە

ڕێگەی رزگار بون لە قەڵەمڕەوی سەلجووقی بۆیە هەردوولا چوونە ناو ململانێیەکی توندەوە کە بەهاتنی خوارزمیەکان ودواتر مەغۆلەکان بۆ سەرهێلی سیاسی کۆتایی پێهات. مەغۆلەکان چەند سەرکەوتنێکی گەورەیان بەدیهێنا و دەوڵەتی خوارزمیان لەناو بردو دواتر لەهەوڵی دەستگرتن بەسەر جیهانی ئیسلامیدا بەرەو عێراق کشان و چوونە بەغداد و خەلیفە موعتەسەمیان کوشت و لەساڵی (٦٥٦ ك / ١٢٥٨ز) دا خیلافەتی عەبباسیان رووخاند.

بە روخانی دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی، عەرەب سەرکردایەتی تەواوی لەدەستداو ڕەگەزە ناعەرەبەکان بەتایبەت مەمالیك و تورکە عوسمانیەکان سەرکەوتن کە ئاڵای یلافەتی ئیسلامیان هەڵگرت و بەناوی ئیسلامەوە شکۆو سەرکەوتنی پڕشنگداریان بەدەست هێنا، عوسمانیەکان بەردەوام تا ساڵی (١٩٢٤ ز) داخیلافەتیان لەدەستدا بو و خەلیفەکانیان بە میراتیان دەگرت تالەو ساڵەدا کەمال ئەتاتورك ڕۆڵی خیلافەتی کۆتایی پێهێنا و تا ئەمڕۆیش پایەی خیلافەت چۆڵە.

لە کۆتاییدا دەوڵەتی خیلافەتی عەبباسی لەگەڵ ئەوەی زیاتر لە پێنج سەدە تەمەنی کرد، لەگەڵ سلبیات و خراپەکانیدا وێنەیەکی پڕشنگداری لەهەستی موسڵماندا و لاپەڕەیەکی پڕشنگداری ناو مێژووی باڵاو بەرزی موسڵماندا بەجێهێشتووە و موسڵمان شانازی پێوە دەکات و خۆی بەجێدەست و شوێنەوارەکانی هەڵدەکێشێت.

# المصادر و المراجع

أـ المصادر

ـ ابن أبي أصيبعة، أحمد بن القاسم السعدي:

ـ عيون الأنباء في طبقات الأطباء. تحقيق نزار ضا. مكتبة دار الحياة بيروت ١٩٦٥.

ـ ابن الأثير أبو الحسن على..... ابن عبدالواحد الشيباني المعروف بابن الأثير الجزري:

ـ الكامل في التاريخ. دار الكتاب العربي ـ بيروت ط ١٩٦٧ م.

ـ ابن أعثم، أبو محمد أحمد:

ـ كتاب الفتوح. دار الكتب العلمية بيروت. ط١، ١٩٨٦.

ـ ابن إياس، محمد بن أحمد الحنفي المصري:

ـ بدائع الزهور في و قائع االدهور. تحقيق محمد مصطفى. القاهرة، الهيئة المصرية العامة للكتاب، ١٩٨٢ م.

ـ ابن تغري بردي، جمال الدين أبي المحاسن يوسف:

ـ النجوم الزاهرة في ملوك مصر و القاهرة. دار الكتب المصرية. وزارة الثقافة و الإرشاد القومي المؤسة المصرية العامة للتأليف و الترجمة و الطبعة و النشر.

ـ ابن الجوزي، أبو الفرج عبدالرحمن بن علي بن محمد:

ـ المنتظم في تاريخ الملوك و الأمم. دائرة المعارف العثمانية — حيدر آباد الدكن ١٣٥٧ ه.

ـ ابن خرداذبة، عبدالله بن عبدالله:

ـ المسالك و الممالك. نشردي غوية. ليدن ١٨٨٩ م.

ـ ابن الخطيب، لسان الدين بن الخطيب:

ـ أعمال الأعلام فيمن بويع قبل الإسلام من ملوك الإسلام. تحقيق أحمد مختار العبادي و محمد إبراهيم الكفافي الدار البيضاء ١٩٦٤.

ـ ابن خلدون، عبدالرحمن بن محمد:

ـ العبر و ديوان المبتدأ و الخبر.. المعروف بتاريخ ابن خلدون.دار الكتاب اللبناني بيروت ١٩٥٧.

ـ مقدمة ابن خلدون. تحقيق عبدالواحد وافي. لجنة البيات العربي. القاهرة ط ١٩٦٥ م.

ـ ابن خلكان، أبو العباس شمس الدين أحمد بن محمد بن أبي بكر:

ـ وفيات الأعيان و أنباء أبناء الزمان. دار الثقافة بيروت ١٩٦٨ـ١٩٧١.

ـ ابن خياط، خليفة أبو عمرو بن أبي هريرة اللبثي، المقلب ب شباب، ونسبته العصفري:

ـ تاريخ خلفة بن خياط. تحقيق أكرم ضياء العمري. النجف ط١، ١٩٦٧.
ـ بن سعيد، علي بن موسى المغربي:
ـ المغرب في حلى المغرب و المشرق في حلي المشرق، ليدن ١٩٨٩ـ١٨٩٩ م.
ـ الأصطخري، أبو إسحاق إبراهيم بن محمد الفارسي المعروف بالكرخي:
ـ المسالك و الممالك. تحقيق محمد جابر عبد العال. القاهرة ١٩٦١ م.
ـ الأصفهاني، أبو الفرج علي بن الحسين:
ـ مقاتل الطالبيين. تحقيق أحمد صقر. مشورات مؤسسة الأعلمي بيروت ط٢، ١٩٨٧
ـ الأغاني. تحقيق عبدالكريم العرباوي. القاهرة. الهيئة المصرية اعامة للكتاب ١٩٧٠ م.
ـ ابن طباطبا، محمد بن علي المعروف بابن الطقطقا:
ـ الفخري في الآداب السلطانية، و الدول الإسلامية. دار صادر بيروت ١٩٦٦.
ـ ابن عبدربه، شهاب الدين أحمد الأندلسي:
ـ العقد الفريد. تحقيق محمد سعيد العريان. دار الفكر بيروت.
ابن العبري، غريغوريوس الملطي:
ـ تاريخ الزمان. دار المشرق. بيروت ١٩٨٦.
ـ ابن العديم، كمال الدين عمر بن هبة الله:
ـ زيدة الحلب من تاريخ حلب، تحقيق سامي الدهان. دمشق ١٩٥٤.
ـ ابن عذاري أبو محمد عبدالله محمد المراكشي:
ـ البيان المغرب في أخبار الأندلس و المغرب، لندن ١٩٤٢ م.
ـ ابن عمراني، محمد بن علي بن محمد: الأنباءُ في تاريخ الخلفاء. باهتمام تقي بينش. مشهد ١٣٦٣ شمسي هجري.
ـ ابن القوطية، محمد بن عمر:
ـ تاريخ افتتاح الأندلس. تحقيق عبدالله الطباع، دار النشر للجامعين. بيروت ١٩٥٧ م.
ـ ابن كثير الحافظ عماد الدين أبو الفداء إسماعيل بن عمر القرشي الدمشقي:
ـ البداية و النهاية في التاريخ. دار المعارف بيروت ط٢، ١٩٧٧.
ـ ابن منظور، أبو الفضل جمال الدين محمحد بن مكرم:
ـ لسان العرب. ج٣. دار صادر، بيروت.
ـ ابن النديم، محمد بن إسحاق.
ـ الفهرست. المطبعة الرحمانية القاهرة، ١٩٤٨.
ـ الأنطاكي، يحيى بن سعيد بن يحيى:
ـ تاريخ الأنطاكي المعروف بصلة تاريخ أوتيخا، تحقيق عمر عبدالسلام تدمري. جروس برس. طربلسـ لبنان، ١٩٩٠.

ـ البلاذري، أبو العباس أحمد بن يحيى بن جابر:
ـ فتوح البلدان. تحقيق عبدالله و عمر أنيس الطباع. دار النشر للجامعين، ١٩٥٧ م.
ـ البلخي، أبو زيد أحمد بن سهل:
ـ كتاب البدء و التاريخ. باريس، ١٩١٩ م.
ـ البلوي، أبو محمد بن عبدالله محمد بن عمير بن محفوظ المديني:
ـ سيرة أحمد بن طولون. تحقيق محمد كرد علي. دمشق ١٣٥٨ ه.
ـ البنداري، الفتح بن علي بن محمد الأصفهاني:
ـ تاريخ دولة آل سلجوق. دار الآفاق الجديدة بيروت. ط٣، ١٩٨٠.
ـ البيروني، أبو الريحان محمد بن أحمد:
الآثار الباقية عن القرون الخالية. ليبزك م.
ـ الجهشياري، محمد بن عبدوس :
ـ كتاب الوزراء و الكتّاب. تحقيق مصطفى السقا و آخرين. مطبعة مصطفى البابي الحلبي. ط١ القاهرة، ١٩٣٨ م.
ـ الجويني، عطا ملك:
ـ تاريخ قاهر العالم. ترجمة أحمد آلتونجي. دار الملاح للطباعة و النشر، حلب، ١٩٨٥ م.
ـ الحصري، أبو إسحاق إبراهيم بن علي:
ـ زهر الآداب و ثمر الألباب. دار الجيل بيروت. حققه محمد محي الدين عبد الحميد. ط٤، ١٩٧٢.
ـ الحسيني، صدرالدين بن علي:
ـ أخبار الدولة السلجوقية. باعتناء عباس إقبال. دار الآفاقة الجديدة. بيروت ط١، ١٩٨٤.
ـ الحموي، شهاب الدين أبو عبدالله ياقوت بن عبدالله:
ـ ـ معجم البلدان. دار صادر، بيروت، ١٩٧٩.
ـ الخطيب البغدادي، الحافظ أبو بكر أحمد بن علي:
ـ تاريخ بغداد و مدينة السلام. دار الكتب العلمية، بيروت.
ـ البغداد، عبدالقاهر بن طاهر بن محمد:
ـ الفرق بين. حققه محمد محي الدين عبدالحميد. مكتبة محمد علي صبح، القاهرة.
ـ الدينوري، أبو حنيفة بن داود:
ـ الأخبار الطوال. مراجعة حسن الزين، دار الفكر الحديث، بيروت، ١٩٨٨.
ـ الراوندي، إبو بكر محمد بن علي:
ـ راحة الصدور وآية السرور في تاريخ الدولة السلجوقية. تعريب الشواربي، الصياد و حسنين. دار القلم القاهرة. ١٩٦٠ م.

ـ السبكي، تاج الدين عبدالوهاب بن علي:
ـ طبقات الشافعية الكبرى. تحقيق محمود محمد الطناجي و عبدالفتاح محمد الحلو، القاهرة، ١٩٦٤ـ١٩٦٥.
ـ السيوطي عبدالرحمن بن أبي بكر جلال الدين:
ـ تاريخ الخلفاء أمراء المؤمنين. تحقيق محمد محي الدين عبدالحميد. المكتبة التجارية، القاهرة، ط٤، ١٩٦٩.
ـ السهرستاني، ابو الفتح محمد عبدالكريم:
ـ الملل و النحل. تحقيق عبد العزيز محمد الوكيل، مؤسسة الحلبي و شركاه القاهرة، ١٩٦٨.
ـ الشيرازي المؤيد في الدين هبة الله بن موسى بن داود:
ـ سيرة المؤيد في الدين داعي الدعاة. القاهرة، ١٩٤٩.
ـ الصولي، أبو بكر محمد بن يحيى.
ـ أخبار الراضي بالله و المتقي بالله. نشر هيورث دن، القاهرة، ١٩٣٥ م.
ـ الطبري، أبو جعفر محمد بن جرير:
ـ تاريخ الرسل و الملوك. تحقيق محمد أبو الفضل إبراهيم. دار المعارف بمصر، ١٩٦٠.
ـ الكندي، أبو عمر محمد بن يوسف:
ـ كتاب الولاة و القضاء , نشر روفن جست بيروت، ١٩٤٨ م.
ـ الماوردي، أبو الحسن علي بن محمد بن حبيب:
ـ الآحكام السلطانية و الولايات الدينية. مكتبة مصطفى البايي الحلبي القاهرة ط١، ١٩٦٠
ـ المسعودي، أبو الحسن علي بن الحسن:
ـ مروج الذهب و معادن الجوهر. دار الآندلس بيروت.
ـ مسكوية أبو علي أحمد بن محمد:
ـ أحسن التقاسيم في معرفة الأقاليم. طبعة ٢، بريل ليدن، ١٩٠٤ م.
ـ المقريزي، تقي الدين أحمد بن علي:
ـ المواعظ و الاعتبار في ذكر الخطط و الأثار. القاهرة، ١٣٢٦ ه.
ـ شذور العقود في ذكر النقود. النجف.
ـ مؤلف مجهول:
ـ أخبار الدولة العباسية، باعتناء عبدالعزيز الدوري و عبدالجبار المطلبي بيروت، دار الطليعة ١٩٧١.
ـ مؤلف مجهول: ـ أخبار مجموعة في فتح الأندلس و ذكر أمرائها و الحروب الواقعية بينهم. مدريد ١٨٦٧ م.
ـ النسوي، محمد بن أحمد بن علي:

ـ سيرة جلال الدين منكبرتي. تحقيق حافظ حمدي، دار الفكر العربي، القاهرة، ١٩٥٣.
ـ اليعقوبي، أحمد بن أبي يعقوب بن جعفر بن وهب بن واضح.
ـ تاريخ اليعقوبي. تحقيق عبدالأمير مهنا، مؤسسة الأعلمي للمطبوعات م.
ب ـ المراجع
ـ إقبال، عباس:
ـ تاريخ إيران بعد ألاسلام. تعريب محمد علاء الدين منصور، دار الثقافة للنشر و التوزيع، القاهرة ١٩٩٠ م.
ـ الليثي، سميرة مختار:
ـ جهاد الشيعة. دار الجيل، بيروت ط٢، ١٩٧٨ م.
ـ أمين أحمد:
ـ ضحي الأسلام. القاهرة، ط١، ١٩٣٣.
ـ أمين، حسين:
ـ تاريخ العراق في المصر السلجوقي. مطبعة الأرشاد. بغداد ١٩٦٥ م.
ـ بارتولد، فاسيلي فلاديمير وفتش:
ـتركستان من الفتح العربي إلى الغزو المولي.تعريب صلاح الدين عثمان هاشم الكويت١٩٨١ م.
ـ تاريخ الترك في آسيا الوسطى. ترجمة أحمد السيد سليمان عن الأصل التركي. القاهرة ١٩٥٨ م.
ـ بروكلمان، كارل:
ـ تاريخ الشعوب الأسلامية. تعريب: نبيه أمين فارس و منير البعلبكي. دار العلم للملاين. بيروت ط١١، ١٩٨٨ م.
ـ بيضون، إبراهيم:
ـ الدولة العربية في إسبانيا. دار النهضة العربية. بيروت، ١٩٨٠ م.
ـ حاطوم نورالدين:
ـ تاريخ العص الوسيط في أوربا. دار الفكر الحديث، بيروت، ١٩٦٧ م.
ـ حسن، إبراهيم حسن:
ـ تاريخ ألاسلام السياسي و الديني و الثقافي و الاجتماعي. مكتبة النهضة المصرية، اقاهرة ط٧، ١٩٦٤.
ـ تاريخ الدولة الفاطمية. مكتبة النهضة المصرية. القاهرة. ط٣، ١٩٦٤ م.
ـ حسين، محمد عبدالباسط عبدالهادي محمد:
ـ الشرق الإسلامي من ظهور السلاجقة حتى زوال الخلافة العباسية ببغداد. مكة المكرمة ط١، ١٤١٤ ه.

- الخازن وليم:
- الحضارة العباسية. دار المشرق. بيروت ط٢، ١٩٩٢ م.
- الخضري، الشيخ محمد:
- محاضرات تاريخ الأمم الإسلامية، الدولية العباسية. المكتبة التجارية الكبرى، ط١٠، القاهرة.
- درئرة المعارف الإسلامية.
- دايفز، ه كارلس:
- شارلمان، ترجمة السيد العريني. مكتبة النهضة المصرية القاهرة، ١٩٥٩.
- رستم، أسد:
- الروم في سياستهم، و حضارتهم، ودينهم، وثقافتهم و صلاتهم بالعرب. منشورات المكتبة البولسية ط٢، ١٩٨٨ لبنان.
- الدوري، عبدالعزيز:
- العصر العباسي الأول. دار الطليعة بيروت. ط٢، ١٩٨٨ م.
- دراسات في العصور العباسية النتأخرة. بغداد، ١٩٤٥ م.
- دوزي، رينهات:
- المسلمون في الأندلس.ترجمة حسن حبشي، الهيئة المصرية العامة للكتاب القاهرة،١٩٩٤ م.
- الرحيلي، سليمان ضفيدع:
- العلاقات السياسية، بين الدولة الفرنجة في عهدي الخليفة هارون الرشيد و الإمبراطور شارلمان. دار الهدى للنشر و التوزيع، الرياض.
- رمضان، عبدالعظيم:
- الصراع بين العرب و أوروبا من ظهور الإسلام إلى إنتهاء الحروب الصليبية. دار المعارف، مصر.
- زكّار، سهيل:
- الجامع في اخبار القرامطة. دار حسان، دمشق ط٣، ١٩٨٧ م.
- الزهراني، محمد بن سفر:
- نظام الوزارة في الدولة العباسية. العهدان البويهي و السلجوقي. مؤسسة الرسالة. بيروت ط٣، ١٩٨٦.
- زيّود، محمد أحمد:
- العلاقات بين الشام و مصر في العهدين الطولوني و الآخشيدي. دار حسان. دمشق. ط١، ١٩٨٩ م.
- سامح، كمال الدين:
- العمارة الآسلامية في صدر الآسلام. المؤسسة المصرية العامة. القاهرة ١٩٦٤ م.

ـ سرور، محمد جمال الدين:

ـ سياسة الفاطميين الخارجية. دار الفكر العربي القاهرة، ١٩٧٦ م.

ـ سعد، فهمي:

ـ العامة في بغداد القرنين الثالث و الرابع للهجرة. دار المنتخب العربي ط١، ١٩٩٣ م.

ـ شعبان، محمد عبدالحي:

ـ الثورة العباسية. ترجمة عبد المجيد حسيب القيسي. دار الدراسات الخلجية.

ـ الصالح، الشيخ صبحي:

ـ النظم الأسلامية. دار العلم للملايين. بيروت ط١، ١٩٦٥ م.

ـ صبحي، أحمد محمود:

ـ نظرية الإمامة الشيعة الأثني عشرية. دار النهضة العربية، بيروت ١٩٩١ م.

ـ الصياد، فؤاد عبدالمعطي:

ـ المغول في تاريخ. دار النهضة العربية، بيروت. ١٩٨٠ م.

ـ عاقل، نبيه:

ـ الأمبراطورية البيزنطية، دراسة في التاريخ السياسي و الثقافي و الحضاري. دمشق ١٩٦٩ م.

ـ العبادي، أحمد مختار:

ـ في التاريخ العباسي و الأندلسي. دار النهضة العربية. بيروت ١٩٧٢ م.

ـ العبادي، عبدالحميد:

ـ صور و بحوث من التاريخ الإسلامي. الأسكندرية، ١٩٤٨ م.

ـ عبدالله، وديع فتخي:

ـ العلاقات السياسية بين بيزنطية و الشرق الأدنى الإسلامي. مؤسسة شباب الجامعة الإسكندرية، ١٩٩٠ م.

ـ العدوي، إبراهيم إحمد:

ـ الإمبراطورية البيزنطية و الدولة الإسلامية. مكتبة النهضة مصر. القاهرة ١٩٥١ م.

ـ العريني، السيد الباز:

ـ الدولة البيزنطية. دار النهضة العربية. بيروت ١٩٨٢ م.

ـ العسلي، بسام:

ـ الرشيد القائد. دار النفائس. بيروت، ط٢، ١٩٨٨ م.

ـ العش، يوسف:

ـ تاريخ عصر الخلافة العباسية. دار الفكر المعاصر. بيروت، ١٩٩٠ م.

ـ علي، محمد كرد:

ـ خطط الشام. دمشق، ١٩٥٢ م.

- عمر، فاروق:
- طبيعة الثورة العباسية. بيروت، ١٩٧٠.
- التاريخ الإسلامي فكر القرن العشرين. مكتبة النهضة، بغداد. ط٢، ١٩٨٥.
- عمران، محمود سعيد:
- محاضرات في معالم التاريخ الإسلامي الوسيط. مكتبة كريدية إخوان. بيروت.
- العنرو، علي عبدالرحمن:
- أثر الفرس السياسي في العصر العياسي الأول. ط٥، ١٩٩٣ م.
- العميد، طاهر:
- المضاهر العسكرية في بناء بغداد المدورة. مجلة كلية الآداب بغداد، ١٩٦٩ م، العدد١٢.
- عنان، محمد عبدالله:
- دولة الإسلام في الأندلس. مكتبة الخانجي. القاهرة ط٣، ١٩٨٨ م.
- الحاكم بأمر الله و أسرار الدعوة الفاطمية. مكتبة الخانجي القاهرة ط٣، ١٩٨٨ م.
- فاريلييف أأ:
- العرب و الروم. ترجمة محمد عبدالهادي شعيرة، دار الفكر العربي. القاهرة.
- فامبري، أرمينيوس:
- تاريخ بخاري من أقدم العصور حتى العصر الحاضر. ترجمة محمود الساداتي، المؤسسة العربية العامة للتأليف و الترجمة و الطباعة و النشر، القاهرة ١٩٦٥ م.
- كاهن، كلود:
- تاريخ العرب و الشعوب الإسلامية منذ ظهور الإسلام حتى بداية الأمبراطورية العثمانية. ترجمة: بدرالدين القاسم. دار الحقيقة بيروت، ط٣، ١٩٨٣ م.
- لين بول، ستانلي:
- العرب في إسبانيا. ترجمة علي الجارم، القاهرة، ١٩٦٣.
- سيرة القاهرة. ترجمة حسن إبراهيم حسن. القاهرة، ١٩٥٠ م.
- محمود، حسن أحمد:
- حضارة مصر في العصر الطولوني. مكتبة الأنجلو مصرية. القاهرة، ١٩٦٠ م.
- محمود، حسن و الشريف، أحمد أبراهيم:
- العالم الإسلامي في العصر العباسي. دار الفكر العربي، القاهرة، ط٥.
- المظفري، محمد حسين:
- تاريخ الشيعة. مطبعة الزهراء. النجف، ١٣٥٢ ه.
- المسند، عبدالله بن علي:
- العلويون في الحجاز ١٣٢-٢٠٣ه.دار المنار، القاهرة، بيروت ط٢، ١٩٩٣ م.

- مؤنس، حسين:
- تاريخ المغرب و حضارته من قبيل الفتح الإسلامي إلى الغزو الفرنسي. العصر الحديث بيروت، ط١، ١٩٩٢ م.
- النشار، علي سامي:
- نشأة الفكر الفلسفي في الإسلام. دار المعارف. مصر، ط٨.
- ثانياً: المصادر و المراجع بللغة الفارسية
- خواندامير، غياث الدين بن همام الدين:
-تاريخ حبيب السير في أخبار أفراد البشر.تحقبق محمود دبير سياقي طهران، ط٢، ١٣٥٣ ه.
- صفا، ذبيح الله:
- تاريخ أدبيات در ايران. طهران، ١٣٢٩ ه.
- كرديزي، أبو سعيد عبدالحي بن الضحاك بن محمد:
- زين الأخبار. نشر محمد ناظم، برلين، ١٩٢٨ م.
- المستوفي، حمدالله بن أبي بكر بن أحمد بن نصر المستوفي القزويني:
- تاريخ كزيدة. نشر بروان، بومباي ١٣٢٨ ه.
ثالثاً: المصادر و المراجع بللغات الأوربية:

- Arnold, sir Thomas, w:
- The caliphate. Oxford. 1941.
- Brown, E. G:
- Literary History of parsia. Camb University 1955.
- Buckler, F. W:
- Harm- Al – Rashid and charles The great. Massa chusetts. U. S. A. 1931.
- Bury, J. B:
- A History of the Later Roman Empire. London 1923.
- A History of the Eastern Roman Empire. London 1912.
- Camb. Med. History.
- Camb, Modern History.
- Canard, M:
- History de la Dynastie de Hamdanides de Jazira et de Syrie. T. I. paris 1953.
- Curtin, J:
- The Mongols. Boston. 1908.
- Diehl., Ch et Marcais, G:
- Le Monde Orienta le 395 – 1081. paris 1939.
- Einhar, R:
- The Life Of Charlemagne. Michigan 1960.

- Encyc. Britanica.
- Finlay, G:
- History of the Byzantine Empire. London 1906.
- Grousset, R:
- Historie de L'Armenie des Origines a 1071. payot. Paris 1974.
- Joranson, Enar:
- The Alleged Frankish Protectorate in Palestine.
- American Historical Review XXII. London, Jan – 1927.
- Lamb, H:
- Genghis Khan, the Emperor of all Men. New York 1928.
- Lane – Poole, S:
- A History of Egypt in The Middlle Ages. London. 1924.
- Michelle Syrienne:
- Chronique. Ed by J. B Chabot. Bruxelles. 1899 – 199.
- Muir, W. T:
- The Caliphate, Its Rise, Decline and Fall. Edinbuegh, 1924.
- Noldke, Th:
- Sketches form Eastern History. trans by J. S. Black, London 1892.
- Ostrogorsky, G:
- A History of the Byzantine States, Trans, by Hussey, oxfors 1956.
- Provencal, L:
- History de L'Espagne Musulmane. Paris 1950.
- Runciman, s:
- Charlemagne and Palestine, English Historical Reviw Vol L, London 1953.
- Schlum berger:
- L'Spopee Byzantine a La fin du Dixieme siecle, Tom I. paris 1896 – 1905.
- Theophanes:
- Chronographia. P. G. M. Tome CVIII, paris 1863.

# ناوەڕۆك